لەبارەی

# مارتین هایدێگەر

# کۆمەڵە گوتار

کاوە جەلال لە ئەڵمانییەوە

ناوی کتێب:لە بارەی مارتین هایدێگەرەوە

بە کوردی کردنی لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

بابەت: فەلسەفە

دیزاینی بەرگ و ناوەوە : ئازەر عوسمان

قەبارە و ژمارەی لاپەڕە:257 - 14.5x21.5

ژمارەی سپاردن: ژمارە 1888ساڵی 2012

نرخ: پێنج هەزاردینار

بڵاوکراوەی: کۆنسێپت بە هاوبەشی لە گەڵ ڕیبازی نوێ

چاپ: باسە

## پێشگۆتن

خەریکبوون بە هزری هایدێگەرەوە، یان هەوڵدان بۆ وەرگێڕانی ئەو تێکستانە کە لەبارەی هزری ئەو نووسراون، دەکەوێتە نێو زۆرانەوە تاکو هەتا رادەی شیان ئەو تێگانە بداتەوە کە هایدێگەر بۆ دەربڕینی هزرینی خۆی گۆڕانی پێدان. سەرەتا دەبێت بڵێین، هایدێگەر هەوڵێکی بێپایانی دا بۆ ئەوەی خۆی لە زمانی باوی فەلسەفە جیابکاتەوە، چونکە کێشەی ئەو کۆتاییهێنان بوو بەو ترادیسیۆنە چەند هەزار ساڵییەی فەلسەفە کە "بەتایبەتی" لە کاتی پلاتۆنەوە هزرینی سەروەری ئەورووپی بوو و بە کاتیگۆری کاری دەکرد. ئامانجی ئەم ترادیسیۆنە ئەوە بوو کە بوونەوەر پۆلێن بکات و لەژێر گشتێتیدا رێکی بخات. بەڵام لەبەر ئەوەی هایدێگەر روودەکاتەوە پرسیاری بوون، لێرەشدا خۆی بە تایبەتی بە بوونی مرۆڤەوە خەریکدەکات، ئەوا چیدی ناتوانێت بە کاتیگۆری کار بکات، چونکە بوونی مرۆڤ ئەدگاری ئەوتۆی هەیە کە بۆ نزیککەوتنەوە لێی تێگەی دی پێویستن، بە واتایەکی دیکەی روونتر و پابەند بە ترادیسیۆنی دێکارتییەوە ببێژین، نەك منێکی دابڕاو لە جیهان پرسیار بکات کە چۆن بە جیهان بگات و دیاریی بکات، بەڵکو کێشەی هایدێگەر بوونی مرۆڤە لە جیهاندا پێش هزرین، پێش هەر کارکردنێکی تیۆریانە، کە دەبێت کتومت بەگوێرەی خودی ئەم جیهانێتییە دیاری بکرێت. ئێمە لێرەدا دوو شێوازی

جیای فەلسەفاندنمان هەیە: لە لایەك دیاریکردنی بوونەوەر بەگوێرەی لۆگیکی دووبەهایی ("بازنە خولگەییە")، لە لایەکی دی پرسیاری ئەو هەقیقەتە بێمەرجە کە "من هەم". بۆ شرۆڤەی "من هەم" یان بوونی مرۆڤ لە جیهاندا تێگەی ئەوتۆ پێویستن کە هایدێگەر ناویان دەنێت "ئێکزیستێنسیال". کەواتە زمانێکی دی پێویستە: ئەڵمانییەکەی هایدێگەر کە تێگە سەرەکییەکانی بەرەهایی هایدێگەرین، واتا چیدی هاوواتا نین بەو وشانە کە لە ئاخافتن و نووسیندا بەکاردەهێنرێن. کەواتە بۆ ئەوەی لە هایدێگەر تێبگەین، ناچارین فێری "ئەڵمانییەکە"ی ئەو ببین.

بۆیە ئاساییە کە تێکستەکانی نێو ئەم کتێبە دوای بڵاوکردنەوەیان لە گۆڤارەکانی سەردەم و کۆنسێپتدا چەند جارێك کاریان تێدا کراوەتەوە، هەمیشە لەنوێوە واژەی یان دەستەواژەی گونجاوتر وەرگیراون بۆ ئەوەی هەتا بشێت تێگە تایبەتییەکانی هایدێگەر بە کوردی بدرێنەوە، بەڵام هاوکات بۆ ئەم مەبەستە چەند جارێك لەتەك هەندێك دۆستی بەرێزدا (محەمەد کەمال، رامیار مەحمود، بەکر عەلی) گفتوگۆمان بۆ روونکردنەوەی تێگەکانی هایدێگەر دامەزراند. دانانی هەندێك تێگە لەبریی ئەو تێگانە کە لە وەرگێڕانەکانی یەکەمدا هەبوون، دەگەڕێتەوە بۆ روونکردنەوە یان پێشنیاری ئەم بەرێزانە. بەڵام ئەوە هێشتا هەر بەس نەبوو، بۆیە بۆ پتر تێگەیشتن لە هزری هایدێگەر هەوڵمان دا لە 'فەرهەنگی هایدێگەر'ەوە بەتایبەتی ئەو تێگانە وەربگێڕین کە پتر نزیکمان دەخەنەوە لە هزری ئەو، یان وا دەکەن کە هەندێك وەرگێڕانی

تێگەکانی ئەو سەیر ئەنوێنن. ئەم وەرگێڕانانە لە پاشکۆیەکدا بە ناونیشانی 'فەرهەنگی هایدێگەر' دانراون.

دوو وەرگێڕانی نێو ئەم کتێبە، تێکستەکانی کارن گلۆی و ڤیللێم فان راین، سەرلەنوێ کاریان تێداکراوەتەوە: نووسینەکەی کارن گلۆی کە بە کورتکراوەیی لە گۆڤاری "سەردەم"دا بڵاوکرایەوە، ئێستا لەم کتێبەی بەردەستدا وەرگێڕانێکی تەواوکراوە، هەروەها نووسینەکەی فان راین لە ریزبەندیی دارشتنەکانیدا کەلێنێکی تێدا بوو (بازدان لە بەشی یەکەمەوە بۆ بەشی سێیەم)، ئەم کەلێنە بریتییە لە "جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە و وەرچەرخان دوای 'بوون و کات'"، کە لە بەشی دووەمدا پڕکراوەتەوە.

بێگومان پێویستە پەیوەند بە تێکستەکەی فان راینەوە ئاماژە بۆ ئەوە بدەین، کە ئەم وەرگێڕانەی بەردەست وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکەی ئەو نییە، سەرباری ئەمە خۆتێگەیشتنی هایدێگەر بۆ فەلسەفە لە خۆ دەگرێت، ئاخر گەرچی پرسیارەکانی "هایدێگەر و ئێتیك"، "هایدێگەر و هونەر"، گرنگن، بەڵام ئەم پرسیارانە تا رادەیەکی زۆر لە خۆتێگەیشتنی ئەوەوە بۆ فەلسەفە شیاوی تێگەیشتنن. هاوکات گەرەکە ئاماژە بۆ ئەوە بدەین کە لەم وەرگێڕانانەدا هەموو ئەو سەرچاوانە لە پەراوێزدا دیارینەکراون کە نووسەران لە توێژینەوەکانیاندا بەکاریان هێناون، بەڵکو بڕێکی گرنگی سەرچاوەکان کە دەشێت بۆ خوێنەر (یان توێژەری هایدێگەر) گرنگ بن.

ئەم وەرگێڕانانە ئێکسپێریمێنتن (تەجروبەن)، بۆیە دەشێت پەیوەند بە هزرین و زمانە تایبەتییەکەی هایدێگەرەوە پرسیاریان ئاراستە بکرێت، ئەوان پرۆژەن کە وەك هەر پرۆژەیەك لە هەبوونی خۆیەوە داوای

تەواوکردن دەکات. بەڵام ئەمە واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە گوایە هەوڵمان نەدابێت هزری هایدێگەر هەتا رادەی شیان بە خوێنەر بگەیەنین.

کاوە جەلال

# بانگەواز بۆ خودریالیزەکردن

## مارتین هایدێگەر: بوون و کات (1927)

ڕۆبێرت تسیمەر

دەرکەوتنی هایدێگەری گەنج لە فەلسەفەی ئەڵمانیی سییەکاندا هاوشێوەی سەرهەڵدانی بیتڵس بوو لە شەستەکاندا. هەر زوو زانرا، کە هایدێگەر فەیلەسوفێکی ناناساییە، کە فەلسەفەی وشکی ئەکادیمییانەی تووڕ داوە و خودی فەلسەفەی گەڕاندۆتەوە بۆ لای کێشە کرۆکییەکان. هایدێگەر ساڵی 1923 لە ماربورگ بوو بە پرۆفیسۆری یاریدەدەر و فێرخوازانیش پۆل پۆل بەو هەستەوە دەهاتن بۆ ماربورگ کە گوایە لەوێ فەلسەفە فێرناکرێت، بەڵکو بە پراکسیس دەنوێنرێت.

بڵاوبوونەوەی نووسینی 'بوون و کات' ئەو تێڕوانینەی ڕاستاند کە بەو پێیە هایدێگەر دەنگ و شێوازێکی نوێی هێناوەتە نێو ڕوودانگەی (Szene) فەلسەفەوە. گەرچی ئەو کتێبە بە زمانێکی زۆر ئاڵۆز و تایبەتمەند نووسراوە، کەچی سەرەڕای ئەمە خوێنەرانی سەرەتای هایدێگەر هۆشسامبوون بەوە کە ئەو بە چ شێوەیەك ڕووی دەکردە

پەیوەندییە کۆنکرێتەکانی ژیانی مرۆڤ. ئەوە کە لە سەنتەری ئەم کتێبەدا بوو، بریتی نەبوون لە کاتیگۆری و پرنسیپ یان یاسا، بە پێچەوانەوە ʾبوون و کاتʾ روو دەکاتە بابەتەکانی وەك "سام"، "زۆرگە"، "مەرگ"، ئەمانەش ئەو بابەتانە بوون کە دەمێك بوو لە فەلسەفەی ئەکادیمیدا بزر بوو بوون.

پێش هەموو شتێك ئەو داواکارییە بە خوێنەر گەیشت کە ئەو گەرەکە خۆی لە ژیانی بێهزری رۆژانە بپچڕێنێت و ئاگامەندانە و بەڕوونی دەربوونی خۆی بفۆرمێنێت. "بوون و کات" بانگەوازێکی فەلسەفەیی بوو بۆ خودریالیزەکردن.

هایدێگەر بەم نیشەی سەرەتا پلانی دیکەی لە مێشکدا بوو. ئەو دەیویست مێتافیزیك و ئۆنتۆلۆژی، تیۆریی بوون و دوایەمین بناغەکانی کردەکێتی، نوێبکاتەوە، ئەو دەیویست بناغەی "ئۆنتۆلۆژییەکی بناغەیی" بڕێژێت و بە شێوەیەکی نوێ وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت بە بوون، واتا سەبارەت بە تاریکترین و گشتیترین تێگەی فەلسەفە، بداتەوە. بەڵام هایدێگەر لەسەر ئەم رێگەیە لە لای بابەتێك گیری خوارد، کە سەرەتا دەبوو تەنیا بریتی بێت لە رێبەرییەك رووەو بوون: بابەتی دەربوونی مرۆڤ. "بوون و کات" تەنیا فراگمێنتێك مایەوە و رەنگە هەر لەبەر ئەم هۆیە بووبێت کە کاریگەرییەکی ئاوها مەزنی نواند. "بوون و کات" بوو بە شرۆڤەیەکی مرۆڤ و گرێدراویی مرۆڤ بە جیهانەوە، بە کۆمەڵەوە لەتەك مرۆڤانی دیکەدا، بەڵام بەتایبەتی گرێدراویی ئەو بە ئاسۆی کاتێتی و لەناوچوونەوە.

بێگومان گەرچی خوێندنەوەی 'بوون و کات' خوێنەری لە تەنگیی دانوستاندنە فەلسەفەیی و شرۆڤە تایبەتییەکان دوور دەخستەوە، بەڵام بە نووسەری 'بوون و کات'ـەوە، بە هایدێگەری مرۆڤەوە، بە دەرکەوتن و زمان و پێگەیشتنی نەودوە، "لادێیەتییەک"ی تایبەتی لکا بوو. هایدێگەر نەک تەنیا خۆی لە گەورەشارەکان، بەڵکو تەنانەت خۆی لە جیهانی مۆدێرنی تەکنیک و میدیاکانیش بەدووردەگرت. ئەو هەرگیز لە دەرەوەی شارە زانکۆییە بچووکەکانی وەک فرایبورگ و ماربورگ کاری نەکرد.

هایدێگەر زۆر وێنە و بەراوردکاری لە باشووری بادنی زێدی خۆی وەردەگرێت کە وڵاتێکی کشتیاری و پێشمۆدێرن بوو. تێگەکانی وەک رۆشنگە (Lichtung)، توولەرێ (ی شاخ / Holzwege) بوون بە لکی زمانە فەلسەفەییەکەی. هایدێگەر حەزی دەکرد لە پۆشاکی میللیی ناوچەکەی خۆیدا دەربکەوێت و لەتەک فێرخوازانیدا شی (Ski) بناژوێت. ئەو لە نزیکی فرایبورگەوە، لە تۆتناوبێرگ، کوخێکی شڤارتسڤالدیانەی بۆ خۆی دروست کرد و تێیدا بەدوورەپەرێزی لە جیهانی مۆدێرن چاوەڕوانیی ئیلهامی دەکرد. ئەو تەنانەت 'بوون و کات'ی لەم کوخەدا نووسی، رووبەڕووی بیرێک و چیمەنی قەدپاڵەکان. هایدێگەر هەرگیز نەبوو بە "پیاوی جیهان". ئەو تەنیا لە باشووری خۆرئاوای ئەڵمانیا/دۆیچلاند کە شەقڵێکی ئەلەمانیی وەرگرتبوو، بەڕاستی هەستی دەکرد لە ماڵی خۆیدایە.

لە جیهانی منداڵیی هایدێگەردا کاریگەریی کلێسەی کاتۆلێکی هەردەم لەسەر ژیان و پەروەردە ئامادە بوو. ئەو ساڵی 1889 لە شارۆچکەی

مێسکیرش لە کەناری باشووری شڤارتسڤالد هاتە جیهانەوە، ئەم رەچەڵەکەی هەر لە سەرەتاوە مۆرکی ئایینێتییەکی تایبەتیی بە ئەو دا. ئەوەش پاشان هەر کلێسەی کاتۆلیکی بوو کە نەك تەنیا رێگەی پەروەردەی ئەوی دیاریکرد، بەڵکو تەنانەت خەرجیی ئەو پەروەردەیەشی لە ئەستۆ گرت: دوای ئەوەی کلێسە دەرماڵەی خوێندنی بۆ بڕییەوە، سەرەتا رۆیشت بۆ ئینتەرناتێکی کاتۆلیکی لە کۆنستانس، پاشان ساڵی 1906 شوێنی خوێندنەکەی گۆڕی بۆ کۆنڤیکتی (خۆیی/داخلیە) مەترانی لە فرایبورگ، بەڵام مەرجی گوزەرانکردن لەو کۆنڤیکتەدا ئەوە بوو کە ئەو دەبوو لە فرایبورگ تیۆلۆژی بخوێنێت و رێگەی قەشەیەك بگرێتە بەر.

بێگومان هایدێگەر ساڵی 1909 هەنگاو دەنێتە نێو ئەم فێربوونە زانکۆییەوە، بەڵام پاش دوو ساڵ وازی لێدەهێنێت. هێدی هێدی دەلاقەیەك لە نێوان هایدێگەر و رێبازی کاتۆلیکیدا دێتە ئاراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو پابەند بوو بە پارەی کلێسەوە، ئەوا ناچار بوو رێگەچارەیەکی نێوانی هەڵبژێرێت: هایدێگەر بڕیار دەدات "فەلسەفەی کاتۆلیکی" وەك چەقی قورسایی دابنێت تاکو بەم شێوەیە درێژە بە دیراسەکەی بدات.

هایدێگەر تەرکیز دەخاتە سەر فەلسەفەی کریستیانیی چەرخی نێڤین و ساڵی 1915 هابیلیتاسیۆنەکەی بە نیشێك لەبارەی دەنس سکۆتوس ئەنجام دەدات. بەڵام هایدێگەر ساڵی 1919 بە فەرمی واز لە کلێسە دەهێنێت، سەرەڕای ئەمە خەریکبوونی پێشینی ئەو بە ئیمان و ناوەڕۆکە

تیۆلۆژییەکانەوە هێشتا هەر ئەسەری خۆی لە هزری ئەودا جێدەهێڵێت. تێگەکانی مۆرالناسیی کریستیانی، لەوانە "ویژدان" و "گوناه"، لە فەلسەفەی ئایندەی ئەودا سەرهەڵدەدەنەوە بە هەمان شێوەی داواکارییەکەی بۆ پشتکردنە جیهان و رووکردنە توێژێکی قووڵتری کردەکێتی، کە بێگومان پاڵهێزێکی ئایینیی هەبوو.

ئەوە هیچ جێی سوورمان نییە کە فەلسەفەی هایدێگەر بە شێوەیەکی مونایەشەی وەرچەرخان سەرچاوە دەگرێت: هایدێگەر ئیشەکەی ئێدموند هوسەرل دامەزرێنەری فێنۆمێنۆلۆژی دەناسێت. هوسەرل ویستی فەلسەفە سەرلەنوێ بگەڕێنێتەوە بۆ سەرچاوەکانی و لە باری تیۆرییە ئەکادیمییەکان رزگاری بکات. هوسەرل هەر پەیوەست بەم مەبەستەوە بانگەوازی دا بۆ "گەڕانەوە بۆ لای خودی شتەکان". بەڵام تەنیا گەر ئێمە بەرەو بناغەی چالاکییەکەی ئاگاییمان رۆبچین، ئەوسا بە شتەکان دەگەین، واتا بە فێنۆمێنەکان دەگەین کە ئەزموونی رۆژانەی جیهانمان پێکدەهێنن. هوسەرل ویستی ئەو پێشبڕیارە یەکالا بکاتەوە کە گوایە ئاگاییمان شێوەیەکی نۆرگانی تۆمارکردنە و هێدی هێدی بە ناوەرۆك پڕ دەبێتەوە. لە روانگەی هوسەرل نە سەبژێکتی پەتی و نە ئۆبژێکتی پەتی هەیە، بە پێچەوانەوە ئاگایی هەر لە سەرەتاوە بەستراوە بە شتەکانەوە. ئاگایی هەمیشە رووەو ئۆبژێکتەکان "ئاڕاستەی گرتووە" و جیهانی شیاوی دەرککردن وەك تۆڕێك لە نێوان ئێمە و شتەکاندا دەچنێت.

هوسەرل تەقەلایەکی گەورەی بەگەڕخست تاکو گۆڕان بە مێتۆدێکی فێنۆمێنۆلۆژیانەی لێکۆڵینەوە و "هەڵوێست"ێکی فێنۆمێنۆلۆژیانە بدات

کە تێیدا چالاکی و "ئاڕاستەدراوی"یەکەی ئاگایی لە فۆرمێکی هەتا رادەی شیان پەتیدا دەردەکەون. هوسەرل دەیویست سەرجەم "گریمانە پێشینەیی" و "پێشبڕیارەکا‌ن" بکوژێنێتەوە، تاکو دید بۆ چالاکیی پەتیی ئاگایی ئازاد ببێت و ئەوجا لە کۆتاییدا فینۆمێنەکان "دەربکەون".

هایدێگەری فێرخوازی زانکۆ بۆ ماوەی دوو ساڵ "لێکۆڵینەوە لۆگیکییەکان"ی هوسەرلی لە کتێبخانەی زانکۆ قەرز کرد بەبێ ئەوەی لەو ماوەیەدا یەك جار بیگەڕێنێتەوە بۆ کتێبخانە. هوسەرل دوای یەکەم جەنگی جیهانی لە گوێتینگنەوە چوو بۆ فرایبورگ و لەوێ کورسیی پێدرا، هایدێگەریش بوو بە یاریدەدەری زانستیی ئەو. ئێستا فینۆمێنۆلۆژی دەبێت بە نیشتمانە فەلسەفەییە نوێکەی هایدێگەر، بەمەش بە یەکجاری ماڵئاوایی لە فەلسەفەی کریستیانی دەکات.

بەڵام مامۆستا گەنجەکەی زانکۆ زۆر زوو لە خوێندنەوە و هزریندا رێگەی خۆی دەگرێتە بەر، هایدێگەر نیشەکانی ئەو فەیلەسوفانە دەخوێنێتەوە کە وەك نوێنەری "فەلسەفەی ژیان" ناسراون، بۆ نموونە فریدریش نیتچە، ڤیلهێلم دیلتی، ئۆنری بێرگسن. ئەم فەیلەسوفانە جەختیان لە فۆرمەکانی "تێگەیشتن"ی هەستمەندانە و ئینتوئیتیڤ دەکرد نەك لە رۆڵی ئاگایی و مەنریفە پەتییەکانی زەین. دیلتی ئاماژەی دا بەوە کە نەشیاوە مرۆڤ وەك ئۆبژێکتێکی ئاسایی زانستە سروشتییەکان "روونبکرێتەوە"، بەڵکو مرۆڤ لەنێو موئایەشە و بەدیهێنانە کولتوورییەکانییەوە شیاوی "تێگەیشتن"ـە. بێرگسن کە ئەو دەمە یەکێك بوو لە بەناوبانگترین فەیلەسوفەکانی ئەوروپا، لەپاڵ هەندێك بابەتی

دیکەدا هەروەها لەو فۆرمە جیاوازانە دەکۆڵییەوە کە ئێمە تێیاندا موئایەشەی "کات" دەکەین. بەڵام هایدێگەر هەروەها تیۆلۆژی دانیمارکی سوێرن کیرکەگۆردی دەخوێندەوە کە ئەو دەمە زۆر کەم ناسرا بوو. کیرکەگۆرد لە نووسینەکەیدا بە ناونیشانی "تێگەی ترس"، ئازادیی مرۆڤی پەیوەند کردبوو بە دۆخی ترسەوە و داوای لە مرۆڤ کردبوو کە بەرێی ئیختیارێکی بنەماییەوە مەغزایەك بە دەربوونی خۆی بدات.

مۆرکەکانی میزاج (Stimmung) لە سەردەمی دوای یەکەم جەنگی جیهانیدا بریتی بوون لە ئاگایی تەنگژە، گەڕانی هۆشەکییانە بۆ ناڕاستەوەرگرتن و هەروەها هەژانی دەستپێکردنەوە، ئەم میزاجەش هەروەها رۆڵێکی گێڕا کە هایدێگەر پتر رووبکاتە فێنۆمێنە کۆنکرێتەکانی دەربوونی مرۆڤ. لە هەموو لایەك بەئاشکرا پرسیاری دەربوون و ئیختیار دەکرا. بێگومان هایدێگەر پێش جەنگیش سۆزی بۆ ئەو بزووتنەوانەی لاوان هەبوو کە هەڵوێستیان بۆ سروشتێتی و رەسەنێتی، بۆ گەڕانەوە لە فۆرمە وشکهەڵهاتووە کۆمەڵایەتییەکان، رادەگەیاند و نەك تەنیا تەقەلایان بۆ نوێکردنەوەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دەدا، بەڵکو هەروەها بۆ "ریفۆرمی ژیان"ی تاکەکەسیش.

هەر بەم شێوەیە هایدێگەر بوو بە فێنۆمێنۆلۆژێکی زۆر تایبەت. ئەو لە هوسەرل ئەو داواکارییەی وەرگرتبوو کە مرۆ (المرو) گەرەکە لە بناغەوە، لە مەرجە بناغەییەکانی مرۆڤ خۆیەوە، لە دەرووی مرۆڤ رووەو جیهان بکۆڵێتەوە. بەڵام بۆ هایدێگەر نەك ئاگایی، بەڵکو ژینجیهان، ژیانی ئاسایی رۆژانەی مرۆڤ، دەبێت بە بابەتی لێکۆڵینەوە. هایدێگەر سەرجەم جۆری

فەلسەفاندنی خۆی ئاڕاستەی ئەم ژینجیهانە دەکات. ئەم جۆرەی فەلسەفاندن هایدێگەری بەناوبانگ کرد، ئەمە تەنانەت لەو کاتەشدا کە ئەو لە فرایبورگ هێشتا وانەبێژێکی گەنج بوو.

فێرخوازان ناویان نابوو "جادووگەرەکەی مێسکیرش"، چونکە دەیتوانی بە گرتنی شتە رۆژانەییەکان پرسیارگەلی فەلسەفەیی دابگیرسێنێت. هایدێگەر لە بەردەم فێرخوازانیدا لەبارەی مەنەسەکە دەدوا، ئەوجا هەوڵی دەدا روونی بکاتەوە کە لێڕوانەر و بابەت بەشێکن لە "جیهانێکی دەوروبەر"ی (Umwelt) نێوکۆیی، بەشێکن لە پەیوەندییەکی چنراوی بابەتگەل. لەنێو ئەم چنراوییەوە دەرفەت دەرەخسێت بۆ ئەوەی "واتا"ی بابەتەکان بناسین (erkennen). ئەوە کە لای هوسەرل بریتی بوو لە پێکەوەگرێدراویی سەبژێکت و ئۆبژێکت لەنێو ئاگاییدا، لای هایدێگەر بوو بە گرێدراویی مرۆڤ بە شتەکانەوە لەنێو جیهانێکی نێوکۆیی دەوروبەردا.

بۆیە جیهان کە ئێمە دەرکی دەکەین و لەنێویدا دەژین (ئەمە بنەما هزرییەکەی هایدێگەرە)، لە مەغزایەکی تەواو راستەوخۆدا هەمیشە جیهانی مرۆڤە. جیهان و مرۆڤ بەرانبەر یەك نەوەستاون، نەخێر، مرۆڤ هەمیشە کەرتێکی جیهانە. فەیلەسوفە مەزنەکان هەمیشە لە "بوون"ێکی نەگۆڕدا: لە ئیدێدا، لە پرنسیپ و کاتیگۆریدا، بۆ بناغەکانی هەقیقەتی ئەم جیهانە گەڕابوون، بەڵام ئێستا هایدێگەری بزوێنراو لە لایەن بێرگسنەوە هەوڵ دەدات ئەم "بوون"ـە بخاتە سەر بناغەیەکی تەواو نوێ: "کات". بەڵام لەبەر ئەوەی کات بەندە بە دۆخگۆڕییەوە، ئەوا ئیتر چیدی نەدەشیا مرۆ لەنێو پرنسیپی نەگۆڕدا بۆ بوون بگەڕێت.

کاتێك هایدێگەر ساڵی 1923 وەك پرۆفیسۆری یاریدەدەر بانگکرا بۆ ماربورگ، ئیتر بۆ ئەو بزێوترین کاتی ژیانی چ لە رووی فەلسەفەیی و چ لە رووی ژیانی تایبەتییەوە سەردتا دەگرێت. هایدێگەر ساڵی 1924 هانا ئارێنت دەناسێت کە کیژە فێرخوازێکی گەنجی فەلسەفە بوو و بۆ ماوەیەکیش بوو بە دەزگیرانی؛ ئەو لەتەك کارل یاسپەرسی زەمیلیدا لە هایدلبێرگ "کۆمەڵەی خەبات" دادەمەزرێنێت، کۆمەڵەیەك کە دەیەوێت بە شێوازی نوێ و تێمی نوێ تەحەدای فەلسەفەی ئەکادیمییانە بکات. هایدێگەر هەندێك کات لەنێو هەژانێکی ئافرێنەردا دەژی.

ئیتر هێدی هێدی وەك سەرەنجامی ئەم کەشە زۆر بەبەرهەمەی ژیان، ئەو ئیشەی هایدێگەر شێوەی کۆکرێتی وەرگرت کە ئەو بەرێیەوە لە زانایەکی گەنجی ئامازەبۆکراوی ژێرلێوەوە سەرکەوت بۆ سەر ئاستی پاشافەیلەسوفی ئەڵمانی. پرۆژەی 'بوون و کات' لە خەریکبوونێکی سەربەخۆی هایدێگەرەوە لەتەك فێنۆمێنۆلۆژیی هوسەرلدا پێگەیشت، بەڵام هاوکات بزوێنرا بوو لە لایەن میزاج و پرسیارە ژیانییەکانی ئەو قۆناغەوە. بەڵام دوایەمین پاڵهێز بۆ تەواوکردنی ئەو ئیشە لە لایەن خودی زانکۆوە هات؛ ساڵی 1925 دەبوو لە ماربورگ سەرلەنوێ پۆستی بەتاڵبووی پرۆفیسۆرێکی فەلسەفە بگیرێتەوە، لەوە دەچوو کە هایدێگەر یەکەم کەسی شیاو بێت بۆ ئەو پۆستە، بەڵام ئەو دەبوو بۆ وەرگرتنی بڕیارێکی ئەرێنی لە لایەن وەزارەتی کولتوورەوە لایەنی کەم بڵاوکراوەیەکی گرنگ بخاتە بەردەم وەزارەت. ئاخر هایدێگەر لە ساڵی 1916 بەدواوە، واتا ساڵی بڵاوبوونەوەی لێکۆڵینەوەی هابیلیتاسیۆنەکەی، هیچ ئیشێکی دیکەی بڵاونەکردبۆوە.

هایدێگەر لە وردە ئامادەکارییەکانی بۆ سەمینارەکان، لە موحازەرەگەلی پەرەپێدراو و گۆتاردانی نووسراو بۆ زانکۆ، دەستنووسی ʼبوون و کاتʼی دروست کرد. ئەو 24 ژولای 1924 لە بەردەم "کۆمەڵگەی تیۆلۆژیی ماربورگ"دا خوێندنەوەیەکی لەبارەی "تێگەی کات" ئەنجام دابوو و بەهۆی قەوارەکەیەوە نەدەشیا وەك گۆتار بڵاوبکرێتەوە. هایدێگەر ئەم نووسینەی پەرە پێدا بۆ لێکۆڵینەوەیەکی حەفتاوپێنج لاپەڕەیی، ئەوجا زەمێستەری هاوینەی 1925 لە موحازەرەیەکدا بەناونیشانی "مێژووی تێگەی کات" سەرلەنوێ دەستی دایەوە هەمان کێشە و لێرەشدا بۆ یەکەم جار رووی لە پرسیاری وەك "مەرگ" و "ویژدان" کرد. هایدێگەر لە پشووی زەمێستەردا لە کوخەکەی خۆی لە تۆتناوبێرگ ئەم تێمانەی هێنایە نێو تێکستەکەیەوە.

شکۆفەی دەستنووسێکی قەوارەفراوانی کتێب هەتا مانگی مارتی 1926ی خایاند. هایدێگەر یەکەمین بەشێکی دەستنووسەکەی گەیاند بە چاپ، ئەوجا لە رەوتی ساڵی 1926دا هەنگاوی نا بۆ کارکردن لە بەشی دیکەی کتێبەکەدا و پاشان یەکی نۆڤەمبەر توانی ئەوانیش بەرێت بۆ دەزگای پەخش. لە کۆتاییدا چەند بەشێك مانەوە کە هایدێگەر تێیاندا لەتەك کانت، دێکارت و ئەریستۆتێلیسدا خەریك بوو بوو، بەڵام نەیتوانی تەواویان بکات و لە بڵاوکراوەی درەنگتریدا فۆرماندنی. بڵاوبوونەوەی کتێبەکە رێی بۆ هایدێگەر خۆش کرد کە ناونیشانی پرۆفیسۆری پێبدرێت. ئەم ناونیشانپێدانە کە پێشتر دوو جار لە لایەن وەزارەتەوە رەفز کرابوو، ئۆکتۆبەری 1927 رووی دا.

کێ بۆ یەکەم جار 'بوون و کات' بخوێنێتەوە، ناچارە خۆی لەتەك زمانە نائاساییەکەی هایدێگەردا رابهێنێت. هایدێگەر یەکێکە لە ئافرێنەرە مەزنەکانی زمان، بەڵام ئەو هەروەها فەیلسوفێکە کە زمان وەردەگۆڕێت. تێگە ئاشناکانی وەك "لێرەبوون/دازاین" یان "مشوور" (زۆرگە - Sorge) واتای تەواو نوێ و وەرگۆڕراو وەردەگرن. هایدێگەر لێرەدا زۆر جار دەگەڕێتەوە بۆ مەغزایەکی سەرچاوەیی وشەکە، بۆ بناغەیەکی ئێتیمیۆلۆژیانەی وشەکە. بەڵام هەروەها دروستکردنی وشەی تەواو نوێ، وەك "داس مان" (مرۆ) یان "داس تسوهاندنە" (دەردەست/حازردەست)، تەحەدایەکی خوێنەرن. خوێنەر نابێت هیچ تێگەیەکی گرنگ کە هایدێگەر بەکاریدەهێنێت، لە واتا ئاساییەکەی رۆژانەیدا تێبگات یان ئەو واتایە وەك پێشمەرجی تێگەیشتن لە هایدێگەر دابنێت.

'بوون و کات' بە پرسیار لەبارەی "مەغزای بوون" سەرچاوە دەگرێت، بەڵام کتێبەکە لە کۆتاییدا وەڵامی ئەم پرسیارە ناداتەوە. لە روانگەی هایدێگەر بوون وەك بناغەی کردەکێتی بریتی نییە لە "بوونەوەر"ێك، واتا شتێکی شیاوی وەسفکردن و پێناسەکردن نییە، وەك چۆن پێشتر زۆرینەی فەیلەسوفان باوەڕیان دەکرد. بەڵام سەربارى ئەمە ئێمە بەڕێی بوونەوەرەوە دەگەین بە بوون، بێگومان بەڕێی بوونەوەرێکی تەواو تایبەتییەوە: مرۆڤ. بۆ هایدێگەر مرۆڤ پردێکە رووەو بوون، چونکە مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە (Wesen) کە پرسیار لەبارەی بوون دەکات، یان چونکە مرۆڤ "تێگەیشتن (ێکی) بوون"ی هەیە و لەبەر ئەم هۆیە لەو پێگە پەتییە تێپەڕ دەکات کە شت (Ding) یان کەلوپەل (Sache) هەیەتی، بۆیە مرۆڤ شێوازە بوونێکی تەواو تایبەتیی هەیە و هایدێگەر ناوی دەنێت

"دازاین". لێکۆڵینەوەی، یان وەك هایدێگەر دەبێژێت، "شرۆڤەی بناغەیی دازاین"، بریتییە لە تێمە راستەقینەکەی 'بوون و کات'.

لەتەك "دازاین"دا تێگەیەك دێتە نێوانەوە کە رەنگە بەناوبانگترین تێگەی 'بوون و کات' بێت: "دەربوون". بەڵام دەربوون بۆ هایدێگەر تەنیا هەقیقەتی ژیان یان هەقیقەتی 'پیادەکردنی دەربوون' (existieren) نییە، بەڵکو بەزۆریی پەیوەندییەکی نێوان دازاین و بوونە. ئێمە دەبێت ئەم تێگەیە لای هایدێگەر لە مەغزای وشە سەرچاوەییە لاتینییەکەدا تێبگەین: واتای وشەیی "ئێکس-زیستەرە" بریتییە لە "دەر-بوون" (herausstehen). لەبەر ئەوەی مرۆڤ دەتوانێت گۆڕان بە پەیوەندییەك لەتەك بووندا بدات، ئەوا بەم رێیەوە لە جیهانی ئاسایی شتەکان دەر-دەچێت (ragt heraus). دەربوون بریتییە لە دەربوونێکی ئاگامەندی بەدیهاتووی رووکردووە بوون.

هایدێگەر بەراستی دەیەوێت لێرەدا رێگەیەکی نوێ، رێگەیەکی شۆڕشگێڕانە، بگرێتە بەر. ئەو نایەوێت لە "پشت" یان لە "دەرەوە"ی شتەکانەوە بۆ بوون بگەڕێت، بەڵکو دەیەوێت لە بەدیهاتنێکی (Vollzug) تایبەتیی ژیانی مرۆڤدا بۆی دەگەڕێت: شێوەی بنیاتنانی دەربوونی مرۆڤ لە لایەن خودی ئەو خۆیەوە. پاشان گەرەکە لە "بوون ی دازاین"ـەوە "مەغزای بوون" وەك سەرجەم هەڵبدرێتەوە.

بەڵام ئەوە کە لە کۆتاییدا وەك سەرجەمە دارشتنێك لە بەردەم خوێنەردایە، تەنیا دوو باسی بەرفراوانی ئەومن کە هایدێگەر لە بنەڕەتدا مەبەستی بوو وەك بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە دابڕێژێت: هایدێگەر لە

باسی یەکەمیاندا بە ناونیشانی "شرۆڤەی ئامادەکەرانەی بناغەیی دازاین" شرۆڤەی جۆرە رۆژانەییەکەی ژیانی مرۆڤ لە جیهاندا دەکات، ئەوجا لە باسی دووەمدا بە ناونیشانی "دازاین و کاتێتی" لەتەك ئەو پرسیارەدا خەریك دەبێت کە چۆن مرۆڤ دەتوانێت پەیوەند بە پاشخانی کاتەوە دەربوونی خۆی بەدیبهێنێت، کە چۆن ئەو دەتوانێت روو لە بوون بکات. بەڵام باسێکی سێیەم کە هایدێگەر لە بنەڕەتدا مەبەستی بوو و دەبوو سەرەنجامی ئەم شرۆڤانە لەژێر ناونیشانی "کات و بوون"دا لە خۆ بگرێت، لەنێو نووسینەکەدا نییە، هەروەها بەشێکی دووەمیش لەنێو نووسینەکەدا نییە، کە هایدێگەر پلانی دارشتنێکی فراوانی بۆ دانا بوو و گەرەك بوو رۆشنایی بدات بە تێگەی بوون لەنێو مێژووی فەلسەفەدا.

هایدێگەر بە "شرۆڤەی دازاین" سەرچاوە دەگرێت، بەکورتی بە شرۆڤەی ئەوە کە مرۆڤ لە "بوونەوەر"ی دیکە جیادەکاتەوە. بەڵام ئەوە مرۆڤی ئاگامەند و خۆبەدیهێنەر نییە کە خۆی لە نێوەندی شرۆڤەکەدا دەبینێتەوە، بەڵکو مرۆڤی ئاسایی رۆژانەیە کە گرێدراوە بە جیهانە راهاتووەکەیەوە و هەست بە ژیانی خۆی وەك کێشەیەك ناکات. هایدێگەر بۆ ئەم دۆخە تێگەی "ناخۆیەتی"ی هێنایە نێوانەوە و بەرانبەر "خۆیەتی" داینا، واتا بەرانبەر ئەو دۆخە کە مرۆڤ تێیدا ئاگامەندانە پەرچەکردار لەسەر مەرجەکانی دەربوونی خۆی دەنوێنێت.

هایدێگەر بۆ ئەوەی مەرجەکانی ژیانی ئاسایی رۆژانە شرۆڤە بکات، بەتایبەتی پشت بە دوو هەوڵی تیۆریانە دەبەستێت: "هەڵوێست"ی فینۆمینۆلۆژیانەی هوسەرل کە بێگومان ئێستا لای هایدێگەر روو دەکاتە

زینجیهان، هەروەها "هێرمینیۆتیک"ی ڤیلهێلم دیلتی، واتا ڕێبازی تێگەیشتن لە موئایەشەی مرۆڤیی. هایدێگەر دەیەوێت "هێرمینیۆتیکی دازاین" بەگەڕ بخات، واتا دەیەوێت ئەو شێوەیە کە چۆن شتگەل و مرۆڤان لە کارئەنجامدانی ڕۆژانەدا بە یەکتریەوە پەیوەندن و پێکەوە ئاڵۆزکاون، ئاشکرا بکات و لە شێوازێکی نوێدا ڕوون بکاتەوە، هەتا ئیتر لە کۆتاییدا گۆتە سەبارەت بە مرۆڤ وەک سەرجەم شیاو بێت.

هایدێگەر بە تێگەی "لە-جیهان-بوون" پەیوەندییە بناغەییەکانی ژیانی مرۆڤ دیاری دەکات. پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە شتەکانەوە لە لایەک، پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە مرۆڤانی دیکەوە لە لایەکی دی، سەر بەم "لە-جیهان-بوون"ـەن. مرۆڤ هەردەم خۆی لە "دۆخ"ێکدا بەرانبەر شتگەل و مرۆڤانی دیکە دەبینێتەوە. گەر ئێمە بمانەوێت لەو کرۆکە تێبگەین کە بە مرۆڤ تایبەتە، ئەوا دەبێت دیدمان ڕووەو دۆخە بناغەییەکانی مرۆڤ بەر بدەین.

شتەکان بە هەمان شێوەی مرۆڤ سەر بە "جیهانێکی دەوروبەر"ی نێوکۆیین، کە لەنێویدا هەردووکیان پێکەوە پەیوەستن و هەردووکیان ئاماژە بۆ یەکتری دەدەن. پەیوەستبوونی شتەکان بە مرۆڤەوە بەڕێی بەکارهێنان و کەڵکەوە دێتە ئاراوە. بۆیە هایدێگەر شتەکان هەروەها وەک "ئامراز" (تسۆیگ / Zeug) دیاری دەکات. ئەمە یەکێکە لە وشەداهێنانەکانی هایدێگەر، ئەمە تەواو ئاگامەندانە تێگەکانی "ئامرازی کار" یان "ئامرازی نووسین"مان دەهێنێتەوە یاد. ئامراز بۆ مرۆڤ ئینسترومێنتێکە و لە ژیانی ئەودا کاراییەکی هەیە. ئامراز لە خزمەتی

شتێکدایە. شتەکان هەروا سووك و ئاسان "بەردەست/پێشدەست" (vorhanden) نین، وەك چۆن فەلسەفەیترادیسیۆنی نوێنەرایەتیی دەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە "دەردەست/حازردەست"ن (zuhanden)[1]، ئەوان بۆ ئەوە لێرەن تاکو "دەردەست"ی (حازردەستی) مرۆڤ بن. "دەردەستی" شەقڵی داوە بە جیهانی دەوروبەری مرۆڤ، بە واتایەکی دی، ئاشنایەتی شەقڵی پێداوە، بەڵام ئاشنایەتییەك کە لە لەتەك-مامەڵەکردنی رۆژانەوە هاتۆتە ئاراوە.

"لەتەك-بوون" مۆرکێکی دیکەی "لە-جیهان-بوون"ـە، ئەمەش بریتییە لەو هەقیقەتە کە مرۆڤ هەرگیز بەتەنیا ناژی، بەڵکو هەمیشە پەیوەستە بە مرۆڤانی دیکەوە. بە هەر حاڵ ئەم "لەتەکبوون"ـە فۆرمێکی تەواو تایبەتیی لە ژیانی رۆژانەدا وەرگرتووە و بریتییە لە گونجاوی و هاوهەڵوێستی. ئێمە لەبریی ئەوەی خۆمان بە ئەوانیدییەوە خەریك بکەین و بەم رێیەوە ئاراستەیەکی تەواو تایبەتی بە ژیانمان بدەین، بە پێچەوانەوە هەوڵ دەدەین دەرنەکەوین و تەقەلا دەدەین وەك ئەوانیدی بین. ئێمە بەرپرسیاری بۆ ژیانمان دەدەین بە تایبەتێکی بێڕوخسار و بێلایەنی سەیر، جا ئەو تایبەتە هۆشی سەردەم بێت، چێژی عەوام یان ئاکار بێت.

---

[1]) دەردەست: ئامادە (بڕوانە: گیوی موکریانی، فەرهەنگی کوردستان، 1999). دەردەست: ئامادە، حازر (بڕوانە: هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە، چاپ پنجم، 1385). (ك.ج.)

هایدێگەر ئەم تایبەتە ناو دەنێت "داس مان" (das Man - مرۆ / هەرکەس)، ئەمەش تێگەیەکە کە ئەو واتا و کارایی ناوێکی ئامادە (اسم مجارع)ی پێدەدات. مەبەست لە مرۆ بریتییە لەو سەروەرە (نۆتۆرێتییە) گشتییە کە هەرگیز بە کۆنکرێت شیاوی دیاریکردن نییە، ئەمەش بۆ نموونە لەم جۆرە داواکاریانەدا دەردەکەوێت؛ "مرۆ ئەمە دەکات" یان "مرۆ ئەمە ناکات". "دیکتاتۆریی مرۆ" کە هایدێگەر لێی دەدوێت، بریتییە لە دیکتاتۆریی مامناوەندێتی کە رێ لە مرۆڤ دەگرێت خودی خۆی بەدیبهێنێت. مرۆ بۆ هایدێگەر پێکهاتەیەکی ئاسایی ژیانی مرۆڤە و ئێمە هەرگیز ناتوانین بە تەواوی خۆمانی لێبپچڕێنین، بەڵام ئێمە دەتوانین بە شێوازێکی ئاگامەندانە هەڵوێست سەبارەت بەو وەربگرین، ئێمە دەتوانین کۆتایی بەو سەروەرییە بهێنین کە مرۆ بەسەر ژیانماندا دەینوێنێت.

شرۆڤەی مرۆ کە هایدێگەر ئەنجامی دەدات، سەر بە بەناوبانگترین بڕگەکانی کتێبەکەیە. ئەم شرۆڤەیە چووە پاڵ ئەو رەخنەیە کە لە نەناسراویی/ نادیاریی (Anonymität) کۆمەڵگەی مۆدێرنی جەماوەرەکان دەگیرا، بۆ نموونە لەو شێوەیەدا کە پاش چەند ساڵێکی کەم فەیلەسوفی ئیسپانی ئۆرتێگا یی گاسێت لە ئیشە سەرەکییەکەیدا بەناونیشانی "راپەڕینی جەماوەرەکان" گرتی. هایدێگەر هەروەها هەمیشە دژبەرێکی فۆرمە مۆدێرنەکانی ژیان مایەوە، دژبەرێکی جیهانی ئوربانی، جیهانی کۆگەرایی، کە بەتایبەتی لە شارە گەورەکاندا هاتبووە گۆڕێ. رەتکردنەوەکەی هایدێگەر رووی دەکردە دیمۆکراتی وەك فۆرمێکی سیاسیی ژیان، بەڵام هەروەها رووی دەکردە نێوەندی گشتیی شەقڵپێدراو

له لایەن میدیاکانەوە، واتا نێوەندێك بە هەواڵە یان ڕەهەندە خێراژیاوەکانییەوە. مۆدێرنە بۆ هایدێگەر بریتی بوو لە جێیەکی ژیانی "ناخۆیی".

لەم پەیوەندییەی ڕەخنەدا لە ژیانی ناخۆیی، هەروەها بڕگەیەکی دیکە لە 'بوون و کات'دا هەیە کە بە هەمان شێوە بەناوبانگە و لەتەك "چەقەچەق" و "فزوولیەت"دا خەریکە. مەبەستی هایدێگەر لە "چەقەچەق" یان "فزوولیەت" شێوە ڕواڵەتییەکانی کۆمونیکاسیۆنە (پێوەندیی نێومرۆڤییە) کە ڕێگرن لە تێگەیشتن لە نێوان مرۆڤاندا، نەك دەرفەتی لەیەکتێگەیشتنیان بۆ بڕەخسێنن. هەموو شتێك لەو ڕوانگەیەوە دەبینرێت کە داخۆ شتەکە وەك دەرکەوتەی نوێ یان هەواڵ شیاوی بەکارهێنان بێت. لە ڕوانگەی هایدێگەر "چەقەچەق و فزوولیەت لەنێو دووتواتاییەکەیاندا ڕۆڵێکی ئەوتۆ دەگێڕن کە ئیتر دروستکراوی ڕەسەن و نوێ یەکسەر لەتەك دەرکەوتنیدا بۆ نێوەندی گشتی کۆن بووە". گەر ئێمە لەنێو ئەم فۆرمانەی کۆمونیکاسیۆندا بمێنینەوە، ئەوسا دەربوون "بەربۆتەوە" (Verfallen). "بەربوونەوە" بۆ هایدێگەر ئەدگارێکی دەربوونی ناخۆییە. شێوەکانی پەیوەندیکردنی ڕۆژانە، بەڵام بەتایبەتی لەخشتەبردنەکانی جیهانی مۆدێرنی ڕاگەیاندن و میدیاکان، بەردەوام مرۆڤ دەخەنە مەترسیی ئەوەوە کە لە خودی خۆی دووربخرێتەوە، لە خودی خۆی ژێرببەرێت (ببچڕێت).

شێوە جیاوازەکانی لە-جیهان-بوون سەرەتا دەمان بەستنەوە بە ژیانێکی نامۆبووی ناخۆییەوە. هایدێگەر دەبێژێت کە "لە-جیهان-بوون هەمیشە

بەربوونەوەیە". مرۆڤ بۆ نێو جیهان فڕێدراوە، نەك ئەو خۆی لەوێ دانابێت. بەڵام ئەم فڕێدراوییە، وەك چۆن هایدێگەر دیاریی دەکات، دوو لایەنی هەیە: بەرمان دەدات بۆ کردەکێتی، بەڵام هەروەها ئەسپێکتی کراوەییش، شیمانەی پرۆژەی خۆیی ژیان، لە خۆ دەگرێت.

ئەم جۆرە تێڕوانینە دوولایەنییەی فڕێدراوی و توانینی پرۆژە لە تێگەی "زۆرگە"شدا (Sorge) دەردەکەوێت. هایدێگەر هەوڵ دەدات بەم تێگەیە روانگە کرۆکییەکانی دازاین پوختبکاتەوە، بەڵام ئەو لە حاڵەتی ئەم تێگەیەشدا لە بەکارهێنانی ئاسایی زمان لادەدات: تێگەی "زۆرگە" بۆ ئەو واتای "خەم" (Kummer) ناگەیەنێت، بەڵکو مەبەستی ئەو لەم تێگەیە مامەڵەی ئامانجداری پلانرێژی مرۆڤە لەتەك جیهاندا، ئەمەش بۆ نموونە بە وشەی بەتەنگەوەبوون (besorgen) دەردەبڕێت. کاتێك ئێمە بە شێوەیەکی بەتەنگەوەبوو رەفتار بە ئاراستەی شتەکانی جیهانی دەورمان دەنوێنین، ئەوا ئێمە فیورزۆرگەمان (Fürsorge) بۆ هاومرۆڤمان هەیە و بەرێیەوە پەیوەندین بە ئەوانەوە، واتا ئێمە لە پلانرشتنی ژیانماندا ئەویدی وەك دازاینی هاوبەها رەچاو دەکەین.

لە روانگەی هایدێگەر پەیوەندیی بەتەنگەوەبوو بە جیهانی دەورمانەوە مەرجێکە بۆ ئەوە کە مرۆڤ بتوانێت پەیوەندییەکی تەواو خۆیی بە بوونەوە بینا بکات، بەکورتی بتوانێت دەربوونی خۆیی بەرێوە بەرێت. ئاخر لە مامەڵەکردنی پلانرێژدا کە لەنێو ژیانی خۆدا رەچاوی شتگەل و مرۆڤان دەکات، رەهەندێکی نوێ دێتە نێوانەوە کە خۆی لە چەقی باسی دووەمی کتێبەکەدا دەبینێتەوە: کات. زۆرگە هەمیشە توخمێکی

یادهێنەرەوە و توخمێکی بەرەوپێشڕوانەرانەی لە خۆ گرتووە، واتا لە زۆرگەدا پەیوەندییەك بە رابوردوو و ئاییندەوە هەیە. دانانی دازاینی مرۆڤ وەك دازاینی کاتەکی، ئەو شرۆڤەیەی دازاین بە شێوەیەکی نوێ دیاردەهێنێت کە هایدێگەر لە باسی یەکەمی کتێبەکەدا ئەنجامی داوە. ئێستا مەسەلەکە روو لەوە دەکات کە داخۆ چۆن مرۆڤ لە ئاسۆی (هۆریزۆنتی) کاتدا، لە پەیوەندییەکانی رۆژانەوە کە ئەو لەنێویاندایە، لە لە-جیهان-بوونەوە، بە ژیانێکی خۆچارەنووسساز بگات.

ئەم خودبەدیهێنانەی مرۆڤ کە لای هایدێگەر واتای بەدیهێنانی "خۆیەتی"، بەدیهێنانی خود (Selbst) یان "دەربوون" دەگەیەنێت، نەك تەنیا گەڕانەوەیە لە نادیاری (ئانۆنیومێتی)، لە رواڵەتخوازی و خوو و نەریتەکان، بەڵکو بەتایبەتی هەروەها خودبەدیهێنانێکە کە پێکەوە لەتەك ئاگایی دوایەکێتیی ژیاندا، لەتەك ئاگاییەکی هەردەم لەگۆڕێبووی کاتدا، رەت دەبێت. 'بوون و کات' رێگەی رووەو ئەم ئاگاییە دەگرێتە بەر. ئەم رێگەیە بەسەر میزاجی (Stimmung) سامدا، بەسەر قبوولکردنی مەرگدا وەك ئاسۆی ژیان، بەسەر "بانگی ویژدان"دا، رەت دەبێت و هەتا ئەو قەناعەتە بردەکات کە مرۆڤ بە یاریدەی دەست بە دەربوونی خۆی دەکات.

کە مرۆڤ ئازادە بۆ ئەوەی فۆرم بە ژیانی خۆی بدات، هەروەها کە "بەربوونەوە" دوایەمین قەرار نییە، بەڵکو مرۆ هەروەها دەتوانێت ئاگامەندانە فۆرم بە مەرج و پەیوەندیی دیاریکراو بدات، ئەمە ئەو حاڵەتەیە کە لە میزاجدا پێش هەموو زانینێکی ئاوەزمەندانە

دەردەكەوێت، ئەم میزاجانەش بۆ هایدێگەر وەك هەستەوەر وان و ئێمە بەرێیانەوە پەیوەندی لەتەك جیهاندا دەبەستین، لێرەشدا بێگومان سام كە میزاجێكی بناغەییە، رۆڵێكی تایبەتی دەگێرێت.

كیركەگۆرد راڤەی ترسی كردبوو وەك هەستێكی دیارینەكراو كە گوناهباریی مرۆڤ، بەمەش ئازادی و بەرپرسیارێتیی ئەو بەرانبەر بە خودا، بۆ خودی ئەو خۆی ئاشكرا دەكات. سام (Angst) لای هایدێگەریش، بە پێچەوانەی ترس (Furcht)، میزاجێكی دیارینەكراوە كە روو ناكاتە رووداوێكی یان بابەتێكی تایبەتی، بەڵكو سامە لە نادیاریی (Anonymität) ژیانێكی كراوەی دامەزرێنراو لە لایەن خودی خۆوە. ئیدی هەموو شتە ئاسایی و وەك راستی وەرگیراوەكانی ژیان لەق ببن، هیچ (نابوون) دەنەنگوتێت و بەمەش هەروەها شیمانە بۆ ئەوە دێتە گۆڕێ كە بۆشاییە سەرهەڵداوەكە پڕبكرێتەوە، ئەمەش شیمانەیە بۆ ئیختیاركردنی دەربوونی خۆ. هایدێگەر دەنووسێت: سام "ئازادبوون بۆ ئازادیی خودی-خۆ-ئیختیاركردن" ئاشكرا دەكات.

مرۆڤ پێكەوە لەتەك دەركردندا بە بمرێتیی خۆ بەئاگا دێت لە ئاگایی ئازادی. مەرگ لەژێر سەروەریی مرۆڤدا لە ژیان دابڕێنراوە، چەپێنراوە. كاتێك هایدێگەر دەبێژێت كە ژیان "هەنگاونان"ـە رووەو مەرگ، ئەوا بەم دەربڕینە تەنیا مەبەستی لەو هەقیقەتە سادیە نییە كە مەرگ خۆی لە كۆتایی ژیانماندا دەبینێتەوە. كات لە لای هایدێگەر فەزا (راوەم) نییە و ئێمە بەنێویدا رەتببین، بەڵكو لەنێو ئێمەدایە. كات وەك دەزوولەیەكی

سوور بەنێو خۆتێگەیشتنماندا، بەنێو "لێڕوانین(مان)دا" بۆ ژیان، رایەڵ بووە. کات ئەوەیە کە لە لایەن مرۆڤەوە بەدیدەهێنرێت.

هایدێگەر بۆ ئەوەی پیشانی بدات کە کات روودان و ریالیزەکردنە/بەدیهێنانە، گۆڕان بە وشەی "بەکاتکردن" (zeitigen) دەدات. بەوەدا کە ئێمە لە بمرێتیی خۆمان بەئاگادێین، ئەوا لەم هەقیقەتەوە کاتیش ئاگامەندانە دەهێنینە نێو تێگەیشتنمانەوە بۆ ژیان. ژیانی مرۆڤ، واتا دازاین، لەو مەغزایەدا "بوون رووەو مەرگ"ـە، کە بە مەنریفەی سنووردکانی ئەو دازاینە هاوکات هێزی ژیان و پێویستی بۆ پرۆژەیەکی ژیانی خۆ پەرەدەسێنن.

مرۆڤ لەسەر رەوتێکی هێواش لەم پێویستییە بەئاگانایەت، بەڵکو لە بانگەوازێکدا، لە داواکارییەکدا بەئاگادێت، کە، هەر وەك بڵێین، مرۆڤ بەرەو رووی خودی خۆی دەکاتەوە. هایدێگەر لێرەدا تێگەی وەك "ویژدان" و "گوناه" بەکاردەهێنێت، بەڵام واتا ترادیسیۆنییە مۆرالی و ئاینییەکەیان لێدەکاتەوە. بۆ هایدێگەر "بانگی ویژدان" بێدرابوونەوەیە لە شێوازی نەریتیانەی ژیانی مرۆ. مەبەستی ئەو لە "گوناه" ئاگاییە سەبارەت بەوە کە مرۆڤ دەبێت خۆی بکات بە شتێك، ئاگاییە لەوە کە مرۆڤ شتێك "قەرزبار"ی شیمانەکانی دەربوونی خۆیەتی.

مرۆڤ بۆ نێو دازاین فڕێدراوە. بانگی ویژدان کە "گوناهباری"یەکەی ئەو دەهێنێتەوە یادی ئەو خۆی، وای لێدەکات کە چیدی درێژە بە ناچالاکی نەدات، بەڵکو بە پرۆژەیەکی خودی خۆی وەڵامی تەحەداکانی دازاین بداتەوە، بەکورتی دازاین بکات بە دەربوون. لەنێو قبووڵکردنی ئەم

تەحەدایەدا "ویستی ئیختیار" هەیە، ئەمەش لە زمانە تایبەتمەندەکەی هایدێگەردا ئەم واتایە دەگەیەنێت: "ویستی ئیختیار بەواتای: دەرفەت بدرێت کە خۆ بۆ خۆییترین گوناهباربوون بانگ بکرێت". مرۆڤ دەبێت لە روانگەی هایدێگەر تەسلیم ببێت: ئەو تەنیا کاتێك دەتوانێت پەیوەندییەك بە بوونەوە دابمەزرێنێت یان دەربوونی خۆی بەرێوە ببات، گەر ئەو لەنێو ئاگایی کاتدا بژی، گەر ئەو لەنێو ئاگایی رابوردووی خۆیدا، لەنێو گرتنی هەنووکە و لەنێو دیدی ئاراستەوەرگرتوو رووەو شیمانەکانی خۆی لە ئایندەدا، بژی. کێ خۆی بخاتە ژێر رکێفی دیکاتۆریی مرۆوە، ئەو یەکە رابوردووی خۆی لەیاددەچێتەوە و خۆی لەنێو بەتەنگەوەبوونەکانی (Besorgungen) رۆژانەدا بزر دەکات.

زۆر کەس بەوە ساکان کە 'بوون و کات' هیچ وەلامێکی ئەو پرسیارە ناداتەوە کە داخۆ مرۆ لە پرۆژەی ژیانی خۆیدا بریار بۆ چی بدات، کە داخۆ دەربوون، داخۆ دازاینی خۆچارەنووسساز، لە کرۆکەوە چۆن بنوێنێت. بەلام پەیامی کتێبەکە لە بنەرەتدا ئەمەیە: ئەوە گرنگ نییە کە تۆ بریار <u>بۆ چی</u> دەدەیت، بەلکو ئەوە گرنگە <u>کە</u> تۆ بەرەنگاری تەحەداکانی ژیان ببیتەوە و پرۆژەیەکی خۆیی ژیان هەلبژێریت، پرۆژەیەك کە لە مرۆدا، لەنێو نەریت (کۆنفەنسیۆن) و بێواتاییدا، نەچەقێت. 'بوون و کات' بانگەوازە بۆ هەلوێستێکی ژیان، بۆ بریاردان و هەلبژاردنێك. بەلام ئەوە بۆ خودی تاکەکەس جێهێلراوە کە داخۆ بریاردانەکەی چۆن بێت.

لایەنی کەم بەو تێزە کە دەڵێت پەیوەندیی دازاین بە بوونەوە هەمیشە بەرێی کاتەوە شەقڵی پێدراوە، روون دەبێتەوە کە هایدێگەر بە چ شێوازێکی نوێ لە تێگەی "بوون" تێدەگات. بوونێکی یان ژیانێکی نەزەلیی نەگۆڕ کە ناڕاستەیەکی رووەو پێورێکی نەگۆڕی سەربەخۆ لە کات وەرگرتبێت، چیدی لە لای هایدێگەر نەماوە. "بوون" و "کات" پەیوەندییەکی چڕیان بە یەکەوە هەیە. بەڵام خوێنەر ئەو ئەزموونە ناکات کە داخۆ چۆن ئەم پەیوەندییە بەپوختی روونبکرێتەوە. کتێبەکەی هایدێگەر بە پرسیار تەواو دەبێت، پرسیاری وەك: "ئایا رێگەیەك لە کاتی سەرچاوەییەوە رووەو مەغزای بوون هەیە؟ ئایا کات خۆیشی وەك ئاسۆی (هۆریزۆنتی) بوون دەردەکەوێت؟"

بەڵام لەبەر ئەوەی هایدێگەر وەڵامی ئەم پرسیارانە نەداتەوە، ئەوا 'بوون و کات' نابێت بەو "ئۆنتۆلۆژییە بناغەیی"یە کە هایدێگەر لە رێبەریی کتێبەکەیدا رایگەیاندووە، بە پێچەوانەوە ئیشەکە بریتییە لە تیۆرییەکی مرۆڤ و پەیوەندیی مرۆڤ بە جیهانەوە، لە چەقی ئەم تیۆرییەشدا شیمانەکانی خۆچارەنووسی تاکی و خودبەدیهێنان خۆیان دەبیننەوە.

نووسینەکە ئەپریلی 1927 وەك بەندی هەشتەمی 'ساڵنامەی فەلسەفە و توێژینەوەی فینۆمینۆلۆژیانە' ([2]) کە هوسەرل دەریدەکرد، بڵاوبۆوە و لەسەری نووسرا بوو: "پێشکەشە بە ئێدموند هوسەرل، بە رێز و دۆستایەتییەوە". بەڵام ئەم نووسینە بوو بە یەکێك لە بەناوبانگترین فراگمێنتەکانی مێژووی فەلسەفە. بێگومان ئەم ئیشە دەرفەتی بۆ

[2]) Jahrbuch für philosophische und phänomenologische Forschung.

هایدێگەر رەخساند کە تەرقیەی ئەکادیمی بکات، بەڵام ئەو بەم ئیشە هەروەها بۆ یەکەم جار لە نێوەندێکی گشتیی فراواندا ناسرا. بڵاوبوونەوەی کتێبەکە ناوبانگی ئەوی وەك یەکێك لە فەیلەسوفە بەواتاکانی سەردەمەکەی چەسپاند، بێگومان ناوبانگێك کە ئەو خۆی زیانی پێگەیاند، ئەویش بەوە کە ئەو ساڵی 1933 پەیوەندیی کرد بە نازیەکانەوە، هەروەها ئەو پێشکەشکردنەشی لەسەر کتێبەکە سڕییەوە کە لە یەکەم چاپدا ئاڕاستەی ئێدموند هوسەرلی رەچەڵەك جوولەکەی کردبوو.

'بوون و کات' بوو بە یەکێك لە کاریگەرترین ئیشەکانی فەلسەفەی سەدەی بیستەم، ئەم ئیشە، وەك بڕوانامەی دامەزرێنەری فەلسەفەی دەربوون (ئێکزیستێنس)، هەرەسێکی بەتایبەتی لە ئەڵمانیا و فەڕەنسا هێنایەگۆڕێ. ئیشە سەرەکییەکەی ژۆن-پۆل سارتر بەناونیشانی 'بوون و نابوون' یەکەم ئیشێکی پڕواتا بوو کە لە پرسیار و بابەتەکانیدا راستەوخۆ پابەند بوو بە 'بوون و کات'ـەوە. بەڵام هەروەها نوێدامەزراندنەوەی هێرمینیۆتیکی فەلسەفەیی لە لایەن هانز-گیۆرگ گادامەر لەسەر ئەم ئیشە سەرەکییەی سەرەتای هایدێگەر بنیات نراوە.

لە ئایندەدا بابەتی دەربوونی مرۆڤ لە لای هایدێگەر پاشەکشەی کرد، ئەمەش لە پێناوی بەرژەوەندیی هەوڵێکدا: نوێدیاریکردنەوەی تێگەی "بوون". هایدێگەر وەك رەخنەگر لە مێتافیزیکێکی ئاڕاستەوەرگرتوو رووەو ئاوەز و هۆش، بوو بە یەکێك لە باوکانی فەلسەفەیی پۆستمۆدێرنە.

بەڵام 'بوون و کات' سەرباری ئەوە هێشتا هەر پرۆژەیەکی مەزنی هایدێگەر مایەوە، کتێبێك کە (وەك زۆر دەگمەنە ئیشی دیکەی فەلسەفەیی) شرۆڤەگەلی ئاڵۆز گرێ دەدات بە کارەکتەری بانگەوازێکەوە کە کەسەکییانە ئاراستەی هەموو مرۆڤێك کراوە. ئەوە لە بنەڕەتدا بێدارکردنەوەیەکی فەلسەفەییە، ئەوە داواکارییە بۆ دابەزین لەو شتە کە ئاستەنگە لە بەردەم ژیانێکی هەڵبژێرراودا لە لایەن خودی خۆمانەوە.

سەرچاوە:

Robert Zimmer: Das Philosophenportal. Ein Schlüssel zu klassischen Werken. München 2004

# مارتین هایدێگەر[3]

کارن گلۆی

## ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لە ناوەڕۆك و دەربوون

کاتێك هوسەرل ڕێگەی فۆرمالیزم هەڵدەبژێرێت و بۆ بەدیهێنانە بونیادییەکانی سەبژێکت دەگەڕێتەوە، بەم ڕێیەشەوە بە فەلسەفەی ترانسسێندێنتال دەگات، واتا فەلسەفەیەك کە شرۆڤەی مەرجە فۆرمالەکانە بۆ شیمانەی ئەزموونکردن، ئەوا هایدێگەر بە پێچەوانەوە ڕێگەی ڕووەو دەربوونێتی، ڕووەو بوون، بەڵام بەتایبەتی ڕووەو دازاینی مرۆڤ هەڵدەبژێرێت و لێرەشەوە گۆڕان بە فەلسەفەکەی خۆی دەدات کە بریتییە لە شرۆڤەی دەربوون یان لە ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی (فوندامێنتال). بەڵام پێش ئەوەی ڕوو بکەینە ئیشە سەرەکییەکەی هایدێگەر بە ناونیشانی 'بوون و کات' (1927)، گەرەکە شتێك بەگشتی لەبارەی فەلسەفەی دەربوونگەرایی ببێژین، واتا ڕوو بکەینە ئەو جەرەیانە فەلسەفەییە کە نەك تەنیا هایدێگەر خۆی تێدا دەبینێتەوە، بەڵکو هەروەها سوێرن کیرکەگۆر، کارل یاسپەرس، ژۆن پۆل سارتر، ئالبێر کامیو - بێگومان بەبێ ئەوەی خۆمان بەم فەیلەسوفانەوە خەریك بکەین.

---

[3]: ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەی کارن گلۆی پەیوەند بە پلانی دابەشێنراوی کتێبەکەیەوە بریتییە لە "دەربوونگەرایی" (ئێکزیستێنسیالیزم). (ك.ج.)

زەمینەی واژەی "دەربوونگەرایی" یان "فەلسەفەی دەربوون" بریتییە لە واژەی "دەربوون". ئێمە دەتوانین لە دژبەریی جووتەتێگەی "دەربوون" (ئێکزیستێنسیا) و "جەوهەر" (ئێسێنسیا)وە کە لە سکۆلایستیکەوە سەریهەڵدا، بگەین بە دەروازەیەك بۆ ئەم واژەیەی دەربوون. سەرەتا گەرەکە بڵێین: چۆن سەرجەم فەلسەفەی سەدەی بیستەم و بیستویەکەم هیچی دیکە نییە جگە لە رەتکردنەوەی فەلسەفەی ترادیسیۆنی (وەك: فێنۆمێنۆلۆژی بە دروشمی 'گەڕانەوە بۆ لای خودی شتەکان' لە ئۆپۆزیسیۆندایە دژی بنیاتنانە مەزەنییە ئیدیالیستییەکان، فەلسەفەی زمانشرۆڤەیی، رەخنەی فەلسەفەیی زمان لە تیۆرییە کلاسیکییەکانی زمان دەگرێت، فەلسەفەی پۆستمۆدێرن وەك فەلسەفەی کۆگەرایی (پلورالێتی) و جیاوازی (دیفەرێنس) دژی هزری ترادیسیۆنیانەی یەکایەتی و ئیدێنتیتیێ دەوەستێتەوە و ئەم جۆرە هزرە ناو دەنێت "لۆگۆسەنتریزم"ی خۆرئاوا ([4])، هەروەها ئادۆرنۆ لە فەلسەفەکەی خۆی، واتا لە دیالێکتیکی نێگەتیف، فەلسەفەیەکی دژ بە بناغەکان تێدەگات و لە ئۆپۆزیسیۆندایە دژی هزری ترادیسیۆن کە هەوڵدانە بۆ روونکردنەوەی دوایەمین بناغەکان – بێگومان دەتوانین نموونەی زیاتر بهێنینەوە)، بە هەمان شێوە فەلسەفەی دەربوون لە ئۆپۆزیسیۆندایە دژی فەلسەفەی جەوهەر یان کرۆك کە لە مێتافیزیکی کلاسیکیدا نوێنەرایەتی دەکرێت. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم ئۆپۆزیسیۆن و هەوڵە فەلسەفییە نوێیە

---

[4]) ئەمە توانجەکەی دێریدایە. بڕوانە:
J. Derrida: Grammatologie, Frankfurt/Main 1974, S. 11.

روونبکەینەوە، گەرەکە سەرەتا دیدێك ئاراستەی فەلسەفەی ترادیسیۆنیانەی جەوهەر بکەین.

مێژووی فەلسەفەی جەوهەر لە ئەنتیکەدا لەتەك پلاتۆن و ئەرپستۆتێلیس سەرچاوە دەگرێت. بێگومان ناونیشانی مێتافیزیك کە لەژێریدا فەلسەفەی جەوهەر دیاری دەکرێت، لە لایەن پلاتۆن و ئەرپستۆتێلیسەوە بەکارنەهێنراوە، بەڵکو ئەم ناونیشانە دەگەرێتەوە بۆ کاتی پاش ئەرپستۆتێلیس: ئەندرۆنیکۆس ی رۆدۆسی کە ئیشەکانی ئەرپستۆتێلیسی رێکخست، بەدووی نووسینە فیزیکییەکاندا چواردە کتێبی نێو کۆئیشەکەی ئەرپستۆتێلیسی ناو نا 'مێتا تا فیزیکا' (پاش فیزیك)، چونکە بەگوێرەی ریزی نووسینەکان "پاش نووسینە فیزیکییەکان"ی ئەو دەهاتن. بەڵام ئەوە لە رێکخستنی کتێبخانەییدا تەنیا بەرێکەوت بوو، کە ئەم نووسینانەی مێتا تا فیزیکا نەك تەنیا بەگوێرەی ریزبەندییان، بەڵکو هەروەها لە رووی ناوەرۆکیشەوە لە فیزیك تێپەر دەکەن. ئەم لێکۆڵینەوانە لە رووی ناوەرۆکەوە لەتەك پرسی یەکەمین هۆکار و بناغەکانی بوونەوەردا خەریکن. کەواتە گەر لێرەوە لە کێشەکە بروانین، ئەوا دەبینین کە لەو دەمەدا مێتافیزیك ناوێك بوو بۆ "یەکەم فەلسەفە" (پریما فیلۆسۆفییا). کێشەی مێتافیزیك لێتوێژینەوەی بوونەوەرە وەك خودی بوونەوەر. ئەم خودی بوونەوەرە وەك کرۆکی یان وەك سروشتی بوونەوەر دیاری دەکرێت، وەك گشتێتی و نەگۆر، دروستنەکراو و نەشیاوی لەناوچوون، دەکرێت بە بناغەی بوونەوەری تاك و بگۆر و دروستبوو و تایبەتمەند بە لەناوچوون، ئەوجا لەبەر ئەوەی سەربەخۆیە لە سەرجەم ئەو شتانە کە تایبەتن بە دەرككردن، ئەوا مرۆ (المرو) تەنیا

بەرێی هزرەوە (Nous) دەتوانێت پێیبگات. باڵاترین بوونەوەری جەوهەری کە هۆکارێکە بناغە بە سەرجەم تاکە بوونەوەرەکان دەدات، تەنیا بەرێی خودی خۆیەوە لە خۆهزراندنی هزردا (*noêsis noêseôs*) شیاوی دیاریکردنە. ئیدی لەو دەمەوە بزووتنەوە بناغەییەکەی مێتافیزیك تێپەڕکردنی هزر بووە لە شتەکانی جیهانی ئەمپیری کە تەنیا بە دەرککردن تایبەتمەندن، یان بەرزبوونەوەی هزر بووە رووەو گشتێتی، رووەو نەگۆڕ.

شیمانەی ئەم بەرزبوونەوە و تێپەڕکردنە بەرێی ئەو جیاوازیکردنەوە هێنرایە گۆڕێ کە پلاتۆن لە نێوان جیهانی بگۆڕی ئارایی و جیهانی نەگۆڕ و ئەزەلیی ئیدێدا ئەنجامی دا. گشتێتی بۆ پلاتۆن بریتی بوو لە ئایدۆس، ئەمەش بۆ ئەو واتای "شێوە"، یان وەك ئیدێیا واتای "خۆ-پیشاندان"، واتای وێنەی بینینی دەگەیاند. ئایدۆس بریتییە لەو وێنەیە کە بوونەوەرێك دەیخاتەوە، ئەمەش بێگومان گەر هاتوو بوونەوەرەکە بناسرێت (بزانرێت)، ئەوجا ئەو وێنەیە کە بوونەوەرەکە خستوویەتیەوە، وێنەیەکە کە نەشیاوە بە سێنسەکان دەرکی پێبکرێت، بەڵکو تەنیا بە چاوی هۆشەکی دیاری دەکرێت (لێی دەڕوانرێت - و)، بەکورتی ئەو وێنەیە بریتییە لە: شێوەکە، فیگورەکە، ستروکتورەکە. سەرجەم فەلسەفەی ترادیسیۆنی کە لە ئاراستەیدا بەرەو رابوردوو هەتا ئەنتیکە و خودی پارمێنیدێس بڕ دەکات، هەوڵدانە بۆ دیاریکردنی کرۆکی نەگۆڕ و گشتیی شتەکان، ئەم دیاریکردنەش تەنیا بەرێی وەرچەرخانەوە لە جیهانی ئەزموون و رووکردنە ناوەرۆکە گشتی و نەگۆڕەکان رووی دەدا، ئەوجا بەرێی توانستی زمین یان توانستی تێگەییەوە بناغەی دەڕێژرا.

بەڵام لەم جۆرە هەوڵەوە سەرەنجامێك دەكەوتەوە كە بەشتكردنی (هیپۆستازكردنی /Verdinglichung) گشتێتی بوو، واتا بەشتكردنی ئەوە بوو كە تەنیا هۆشەكیانە شیاوی دیاریكردنە، هاوكات ئەو هەوڵە تایبەتێتی و مێژووی دەسرِییەوە و وەك لەكەدار دایدەنان. بەم پێیە لە مێتافیزیكی ترادیسیۆنیدا دژبەرییەك دەهێنرایە ئاراوە: گشتێتی بەرانبەر تایبەتێتی، رەها (المطلق) بەرانبەر دوایەكێتی، سەرمەدی بەرانبەر كاتێتی، هۆشەكێتی بەرانبەر تایبەتەكان بە دەرككردن. ئەوجا گەر مرۆڤ وەك بوونەوەرێكی دوایەكیی هزرڤان بیویستایە ئەم گشتێتییە بناسێت، ئەوا دەبوو رووەو ئەو گشتێتییە بەرزببێتەوە – ئەمە لە بنەرەتدا ئەركی فەلسەفەی هۆشە و بە ریشەییترین شێوە لە لای هێگل دەردەكەوێت. هێگل لە 'زانستی لۆگیك'دا بەم رستانە ئاوەڵای دەكات:

"ئەم جیهانە بریتییە لە راستی كە چۆن بەبێ بەرگ (Hülle) لە خۆدا و بۆ خۆ هەیە، بۆیە ئێمە دەتوانین ببێژین: ئەم ناوەرۆكە پیشاندانی خودایە كە چۆن لە كرۆكە ئەزەلییەكەیدا پێش خولقاندنی سروشت و هۆشێكی دوایەكی هەیە (ist)"[5].

ئێمە دەتوانین بەشداری لەم جیهانەدا بكەین، ئەویش بە روانین لێی.

بەڵام لەتەك فەلسەفەی دەربوون و هزرین لە تاك (سینگولێر) و مێژوو، لە تاكێتی (ئیندیڤیدوێل) و ناگشتێتی، لە ناجەوهەر، گەرِانەوەیەكی

---

[5]) G. W. F. Hegel: Wissenschaft der Logik, in: Werke in 20 Bdn. (Theorie Werkausgabe), auf der Grundlage der Werke von 1832-1845 neu editierte Ausgabe, Redaktion E. Koldenhauer und K. M. Michel, Bd. 5. Frankfurt a. M. 1969, S. 44.

ریشەیی لەو شێوازە هزرینە مێتافیزیکییە رووی دا. لە کرۆکی ئەم شێوازەی هزریندا ئەوە خۆی دەبینێتەوە کە "هەیە" (existiert)، لێرەشدا بەتایبەتی مرۆڤ وەك سەنتەری هزرین وەردەگیرێت.

لە ترادیسیۆندا دژبەرییەکەی نێوان جەوهەر و دەربوون بە چەشنێك دیاری دەکرا کە دەربوون وەك ریالیزەبوونی جەوهەر دادەنرا، بەکورتی وەك لێرەبوون ی شتێك دادەنرا کە تەنیا بە شێوەیەکی تێگەیی شیاوی دیاریکردنە. کاتێك جەوهەر بریتی بوو لە کرۆکی ئەبستراکت، لە ئەوها-بوون، یان لە چی-بوون ی شتەکە، ئەوا بە پێچەوانەوە دەربوون بریتی بوو لە بەکردەکی-بوونی شتەکە. دەربوون، بۆ نموونە لای ئەرِیستۆتێلیس، وەك ئامادەگیی بوونەوەر بیرکرایەوە، یان، بۆ نموونە لە سکۆلایستیکدا، وەك کردەکێتی (Aktualität) و کارابوویی بەرانبەر بە هێزەکێتی (Potentialität) بیرکرایەوە، یان، وەك لای فریدریش ڤیلهێلم شێلینگ، وەك یەکەم توانست (قودرە/پۆتێنس) دانرا.

ئێمە دەتوانین دوو نموونە بهێنینەوە بۆ ئەوەی تێگەی دەربوون بە باشترین شێوە دیاری بکەین؛ پێشبینییەکەی شێلینگ سەبارەت بە ئێکزیستەرەی بزۆك، یان فۆرمولە بەناوبانگەکەی فیختە ([6]) کە بریتییە لە بوون وەك کردەکێتیی پەتی (/ esse in mero actu)، ئەمەش بێگومان لەو شێوەیەدا کە چۆن بە دەربوون (existere) و بوون (esse) ی مرۆڤ

---

[6]) J. G. Fichte: Wissenschaftslehre von 1804, in: Werke, hrsg. Vom I. H. Fichte, fotomech. Nachdruck von Johann Gottlieb Fichtes sämtliche Werke, hrsg. Vom I. H. Fichte, 8 Bde., Berlin 1845/46, und Johann Gottlieb Fichtes nachgelassene Werke, hrsg. Von H. H. Fichte, 2 Bde., Bonn 1834/35, Bd. 10, Berlin 1971, S. 87-314, bes. S. 206.

تایبەت دەکرێت. کێشەکە لەم پێشبینییەی شێلینگ یان فۆرمولەکردنەی فیختەدا رووناکاتە کردەکی-بوون و هەبوونی شتێك یان رەوشێك کە نۆبژێکتیانە شیاوی دەرککردن بێت، هەروەها (لە رووی فەلسەفەی ژیانەوە) رووناکاتە هەستی سەبژێکتیی (subjektiv) کە لە لایەن بناغەیەکی ژیانەوە هەڵگیرابێت، بەڵکو لێرەدا مەبەست لە بوونی هەقیقیی مرۆڤە لەم مەغزایەدا، من هەم نەك من نیم. لەم روانگەیەوە دەربوون یەکانگیر نییە بە کەس-بوون یان بە سەبژێکت-بوون، بەڵکو یەکانگیرە بەو هەقیقەتە بناغەیی و بێ قەید و شەرتە کە "من هەم". کاتێك لە فەلسەفەی دێکارتیدا دەگۆترا: "من دەهزرێم کەواتە من هەم"، ئەوا ئێستا بە پێچەوانەوە لە فەلسەفەی دەربووندا دەگۆترێت: "من هەم کەواتە من دەهزرێم".

ئێمە ناتوانین بەرێی هزرینەوە یان لەنێو هزریندا لە دەربوون تێبگەین – ئاخر هزرین روو دەکاتە گشتێتی، بەڵکو تەنیا لە شێوازە سۆزمەندەکانی مونایەشە و ئەزموونکردندا لێی تێدەگەین، بۆ نموونە ناکامی، هێڵنج، سام، وەڕسی. ئەمانە شێوازەکانی گەیشتنن بە دەربوون، ئەم شێوازانەش بۆ فەلسەفەی دەربوون پێشینەیین. لەنێو ئەم شێوازانەدا سەرجەم رافەکانی جیهان و نرخاندنەکان هێزی بناغەڕێژ و رزگارکەریان دەدۆڕێنن، ئێستا هەموو چەسپاندنێکی نێو سەرجەم دەهیچێنرێت، بەڵێ تەنانەت جیهانی ئاشنای دەوروبەر نامۆ دەبێت بە مرۆڤ و لە کۆتاییدا مرۆڤ خۆیشی لە خۆی نامۆ دەبێت. مرۆڤ لە سەرەنجامی ئەم رووداوەدا چیدی ناتوانێت لەنێو سەرجەمێکدا لە خۆی تێبگات، سەرجەمێك کە ئەوی وەك مرۆڤ لە خۆ گرتبێت، جا با ئەو سەرجەمە راستییەکی ئەزەلی

یان دیاریکردنێکی کاتیگۆریانەی ناوەرۆك بێت، نەخێر، مرۆڤ ئێستا لەنێو تاکێتیی ڕەها و جێهێڵراویدا ئەزموونی خۆی دەکات.

ئێمە دەتوانین بۆ دیاریکردنی هەقیقەتی پەتیی دەربوون بیر لە چوار شیمانە بکەینەوە، کە هەر فەیلەسوفێکی بەواتای دەربوون نوێنەرایەتی یەکێکیان دەکات: 1) دەرچوونی هیچێنەر (نەفیکەر) لە دیاریکردنەکانی جەوهەرەوە – دیاریکردنی کاتیگۆریانە کە تەرخانکراوە بۆ گشتێتی و دروستنەبوو و لەناونەچوو، بەڵام ئەمە لەبار نییە بۆ ڕیزبەندییەك کە هەتا دەربوون بڕبکات (سوێرن کیرکەگۆر)؛ 2) بەدیهێنانێکی تایبەتیی دەربوون بەڕێی ئەو میزاجە بناغەیی و دۆخە بناغەییانەوە کە لەتەك خودی بەدیهێنانەکەدا یەکدەگرنەوە (ئالبێر کامیو)؛ 3) ڕۆشنکردنەوەی دەربوون (کارل یاسپەرس)؛ 4) وەرگۆڕینی سەرجەم زەخیرەی ترادیسیۆنیانەی تێگەکان، کارکردن لە شێوازی نوێی دەرچەدا کە ئێستا ناونانرێن کاتیگۆری، بەڵکو ناودەنرێن ئێکزیستێنسیال (مارتین هایدێگەر).

گەرچی هەر فەیلەسوفێکی دەربوون ڕێگەیەکی خۆیی هەیە، سەرەڕای ئەوە هەموویان لە هەندێك ئەدگاری تێگەیشتندا لە دەربوون یەکدەگرنەوە.

1) گەر هەتا ئێستا دەربوون تەنیا وەك هەقیقەتی دراو (فاکتوم) وەسفکرابێت، هێشتا هەر مۆرکەکەی ئەك تەنیا ئەوەیە کە ئەو 'هەیە' (ist)، بەڵکو ئەوەشە کە ئەو گەرەکە هەبێت. بوون هەروا سووك و ئاسان

نەدراوە، بەڵكو وازلێهێنراوە، بۆیە دەربوون بەگوێرەی ئەوە دیاریدەکرێت کە ئەو بەچی دەبێت یان بەچی نابێت.

2) دەربوون بەواتای پەیوەندییەك لەتەك خۆدا، لەم پەیوەندییەدا دەشێت شیمانە خۆییەکان بەدەستبهێنرێن یان رەتبکرێنەوە یان مرۆ پێیان نەگات. بۆ نموونە کیرکەگۆر دەربوون وەك پەیوەندییەك دیاری دەکات کە تێیدا پەیوەندییەکە پەیوەندی بە خۆیەوە دەکات، هایدێگەر لە پەیوەندییەکی بوون دەدوێت، مرۆڤیش بەرێی ئەو پەیوەندییەوە وەك بوونەوەرێك دیاریدەکرێت کە کێشەکەی لەنێو بوونی خۆیدا خودی ئەم بوونەیەتی. بەڵام پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بدەین کە ئەم خۆپەیوەندییە پێشتیۆریانەیە، یان خۆپەیوەندییەکی پێش-پەرچاندنە، بەدیهێنانێکە کە خۆی لە پێش هەموو شێوەیەکی تیۆریزەکردنەوە دەبینێتەوە. جگە لەوە پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بدەین کە ئێمە ناتوانین لەم حاڵەتەدا دەرچەیەك وەربگرین لە سەبژێکتەوە، لە 'من'ـەوە، لە 'مرۆ'وە، یان لە 'کەس'ـەوە کە کارەکتەر یان توانستی هەیە، واتا خاوەنێتی، بەڵکو دەربوون بریتییە لە شێوازی بەدیهێنان، لە 'چۆن'ی بەدەستهێنان یان لەدەستچوونی شیمانەکان.

3) مرۆڤ لەم بەدیهێنانانەدا هەر جارە پەیوەندییەکی تایبەتی بە جیهانەوە دەکات. ئەمە بەوەدا دەردەکەوێت کە مرۆڤ وەك پیادەکەری دەربوون (existierend) پەیوەند بە جیهانەوە بەئاگادێت، بۆ نموونە لە سامدا، لە وەڕسیدا. ئەم پەیوەندییە بە جیهانەوە پێکهێنەری دەربوونە. بێگومان دۆخ بە دانانی پەیوەندییەکە سەرهەڵنادات، یان بەو رێیەوە کە

بوونەوەرێکی جیهانی بچێتە نێو پەیوەندییەکی پاشیانییەوە لەتەك جیهاندا، بەڵکو بەرێی دیاریکردنێکەوە کە پابەندە بە جیهانەوە، ئەم دیاریکردنەش لەتەك هەر شیمانەیەك (ی من)دا یەکدەگرێتەوە یان دیاریکردنەکە نکۆڵیی لێدەکات.

4) بۆیە لە-جیهان-بوون، بەدەستهێنانی یان بەدەستنەهێنانی شیمانە خۆییەکان، هەمیشە بەندە بە دۆخەوە، هەمیشە لەنێو دۆخدا روودەدات و مرۆ هەرگیز ناتوانێت لە دۆخێك بێتە دەرەوە گەر نەچێتە نێو دۆخێکی دیکەوە. هەقیقەتی ئەم پابەندییە بە دۆخەوە نیشانەیەکە بۆ دوایەکێتی. ئەم پابەندییە بە رەهایی لە دۆخە سەرسنوورییەکانی وەك رێکەوت و گوناه و مەرگدا ئەزموونددەکرێت.

5) دەربوون لە جەوهەرەوە دوایەکییە. دەربوون سنوورێکی هەیە، بەڵام نەك لە واتای ئەو سنوورەدا کە بابەتەکان هەیانە، هەروەها نەك لەو واتایەدا کە دەربوون کاتەکیانە لە سەرەتایەکەود (زایین) هەتا کۆتاییەك (مەرگ) بردەکات، بەڵکو لەو واتایەدا کە دەربوون هەر سنوورێکی خۆی لەخۆگرتووە و تەنانەت خودی ئەو سنوورەیە. بۆیە پیادەکردنی دەربوون (ئێکزیستێنسکردن/existieren) هەڵوێستوەرگرتنێکی بەردەوامی جەختلێکراو یان جەختلێنەکراوی خۆیە لەتەك مەرگدا کە دەتوانین بەم رستەیە دەریببڕین: من دوایەکییانە یان وەك بمر دەربوون پیادە دەکەم.

6) قبوولکردنی یان رەتکردنەوەی خودی خۆ وەك بوونەوەرێکی بمر بریتین لە دوو شیمانە بنەڕەتییەکەی دەربوون. بەگوێرەی هەر

ڕەچەڵەکێکی فەلسەفەیی، ئەو شیمانانە وەك خۆییبوون یان خۆیینەبوون (هایدێگەر)، یان وەك خۆبوون و ناکامی (کیرکەگۆر) دیاریدەکرێن.

ڕەنگە ئەم پاشخانە گشتییە بەس بێت بۆ ئەوەی ئێستا وردتر ڕووبکەینە هایدێگەر، بەڵام با جارێ هەندێك زانیاری سەبارەت بە ژیان و بەرهەمی ئەو بخەینە بەردەم.

## 2- ڕەوتی پێگەیشتنی هایدێگەر

مارتین هایدێگەر لە 1889/09/26 لە مێسکیرش هاتە ژیانەوە، باوکی وەستای کووپە و خزمەتکاری کلێسەی مێسکیرش بوو. ئەو لە کۆنستانس و فرایبورگ (ی برایسگاو) "ئامادەیی هومانیستی"ی تەواو کرد. ساڵی 1907 کۆنراد گروێبەر کە دەرەنگتر بوو بە مەترانی فرایبورگ، لێکۆڵینەوەی دکتۆراکەی فرانتس برێنتانۆی بە هایدێگەر ناساند. ئەم لێکۆڵینەوەیەی برێنتانۆ بە ناونیشانی "سەبارەت بە واتای هەمەلایەنیی بوونەوەر" (1862) لەبارەی ئەرستۆتێلیس نووسرابوو و کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هایدێگەر نواند؛ وەك ئەو خۆی گۆتبووی، ئەم نووسینەی برێنتانۆ ئەوی خستە سەر ڕێگەی هزری خۆی، گەیاندی بە پرسیار سەبارەت بە مەغزای بوون، ئەمەش پرسیارێك بوو کە هایدێگەر بەدرێژایی ژیانی پێوەی خەریك بوو. کاریگەرییەکی دیکە کە کەمتر نەبوو لە کاریگەریی نووسینەکەی برێنتانۆ، نووسینێکی زانای دۆگمی

کریستیانی کارل برایگ بوو بە ناونیشانی "لەبارەی بوون. روانینێکی پوخت لە ئۆنتۆلۆژی". ئەم نووسینەی برایگ برگەی درێژی لە نووسینەکانی ئەریستۆتێلیس و تۆماسی ئەکوینی و سوئاریز لەخۆگرتبوو، هەروەها تێیدا ئێتیمۆلۆژییەکی تێگە بناغەییەکانی ئۆنتۆلۆژی ئامادەکرابوو. دوای ئەوەی هایدێگەر ساڵی 1909 ئامادەیی تەواو کرد، ئەوجا دوای بەرزکرنەوەی داواکارییەك بۆ وەرگرتن لە خۆیی فێرخوازانی تیۆلۆژی، بۆ ماوەی چوار ساڵ لە زانکۆی فرایبورگ تیۆلۆژیی کاتۆلیکیی خوێند، بەڵام پاش ئەم ماوەیە بەشەکەی خۆی گۆڕی و هەنگاوی نایە نێو خوێندنی فەلسەفە و ماتماتیك و زانستی سروشتییەوە. هایدێگەر لە ماوەی ئەم خوێندنە زانکۆییەدا "توێژینەوە لۆگیکییەکان"ی هوسەرلی خوێندەوە، هەروەها ئیشەکانی هوێلدەرلین، ریلکە، تراکل، نیتچە (بەتایبەتی ئیشە سەرەکییەکەی بە ناونیشانی "ویست بۆ دەسەڵات")، ئەوجا کیرکەگۆر و دۆستۆیێفسکی و دیلتی دەخوێندەوە. کارل برایگ هەروەها هایدێگەری لە شێلینگ و هێگل و واتایان بۆ فەلسەفەی تیۆریانە (spekulativ) بەئاگاهێنا. هایدێگەر ساڵی 1913 بە نووسینی "تیۆریی بڕیار لە پسیکۆلۆژیزم"دا دکتۆرای کرد، پاشان ساڵی 1916 لە لای هاینریش ریکەرت بە نووسینی "کاتیگۆرییەکان و تیۆریی واتا لای دەنس سکۆتوس" هابیلیتاسیۆنی کرد. هایدێگەر لەم نووسینەیدا بە ئیشێکەوە خەریك بوو بوو کە هەتا ئەو دەمە وەك ئیشی دەنس سکۆتوس ناسرا بوو، بەڵام درەنگتر ئاشکرا بوو کە ئەو ئیشە هینی تۆماس فۆن ئێرفورت بووە نەك دەنس سکۆتوس. هایدێگەر ساڵی 1916/17 بوو بە وانەبێژی فەلسەفە لە بواری تیۆلۆژیی کاتۆلیکیدا، بەڵام ماوەیەك دوای

دەستبەکاربوونی لەو بوارەدا، لە لای دۆستێکی خۆی بە ناوی ئێنگلبێرت کرێبس کە زانای دۆگمی کریستیانی بوو، درکاندبووی کە پرسیار و تێڕوانینەکانی تیۆریی مەئریفە گەیاندوویانە بەو هەڵوێستە کە چیدی کاتۆلیسیزم قبوول نەکات. ئەوە بوو هایدێگەر ساڵی 1919 بوو بە یاریدەدەری زانستیی هوسەرل کە ساڵی 1916 شوێنی ریکەرتی گرتبۆوە، پاشان 1922/23 بە هەوڵی پاول ناترۆپ بانگهێشت کرا بۆ زانکۆی ماربورگ و پۆستی پرۆفیسۆری یاریدەدەری پێدرا. دەشێت ئەم کاتەی ماربورگ پڕڕوداوترین و لە رووی هزریشەوە بزوێنەرترین کات بووبێت بۆ ژیانی هایدێگەر. بە گوتەی هانا ئارنت ئەو دەمە هایدێگەر بە پاشای نهێنیی جیهانی هزر دادەنرا. ئەو پێکەوە لەتەك فەیلەسوفان نیکۆلای هارتمان و پاول فریدلێندەردا، هەروەها شوێنەوارناس پاول یاکۆبستال و مێژووناسی کلێسە هانز فۆن زۆدن، گرووپێکیان پێکهێنا بۆ خوێندنەوەی فەیلەسوفان و نووسەرانی گریکی، کە لە نێویاندا هەروەها گرنگی بە هۆمێر و پیندار دەدرا. ئەوجا هایدێگەر ساڵی 1927، لە'ساڵنامەی فەلسەفە و توێژینەوەی فێنۆمێنۆلۆژیانە'دا ([7]) کە هوسەرل دەریدەکرد، ئیشە سەرەکییەکەی بە ناونیشانی 'بوون و کات' بڵاوکردەوە. ساڵی 1928 هایدێگەر بانگهێشت کرا بۆ وەرگرتنی کورسییەکەی هوسەرل لە زانکۆی فرایبورگ/ برایسگاو. بەڵام هێندەی نەخایاند لە نێوان هەردووکیاندا جیاوازیی هزری سەری هەڵدا و لە سەرەنجامدا پەیوەندییەکەیان کۆتایی پێهات. ئاخر هوسەرل هیوایەکی گەورەی بە هایدێگەر هەبوو کە درێژە بەو فێنۆمێنۆلۆژییە بدات کە خۆی بناغەی

---

[7]) Jahrbuch für philosophische und phänomenologische Forschung.

رشتبوو، بەڵام کاتێك هوسەرل بینی کە هایدێگەر بنەما فێنۆمێنۆلۆژییەکەی ئەوی وەرگۆڕیوە، ئیتر هیوای پێی نەما. هایدێگەر ساڵی 1933 بوو بە سەرۆکی زانکۆی فرایبورگ و بەم بۆنەیەوە گۆتارە بەناوبانگەکەی پێشکەش کرد: "خۆڕاگەیاندنی زانکۆی ئەڵمانی"، بەڵام ئەم گۆتارەی لە مەغزای هەڵچوونەکەی نازیزمدا نووسیبوو. بە هەر حاڵ هایدێگەر پاش ساڵێك وازی لەم پۆستە هێنا و بەدووی ئەمەشدا هەمیشە پتر تەنیا دەکەوت، ئەوجا درەنگتر هاوپەیمانەکان لە ساڵی 1945 هەتا خانەنشینبوونی لە ساڵی 1952 کاری وانەبێژییان لێ یاساغ کرد. بەڵام هایدێگەر بە نووسینی "نامەیەك لەبارەی هومانیزم" (1952) کە بۆ دۆستێکی فەرەنسیی گەنجی نووسی بوو، سەرلەنوێ هاتەوە نێوەندی دانوستانە هەنووکەییەکان و لێرەشەوە هێنرایە نێو دانوستاندنەکانەوە لەبارەی دەربوونگەرایی فەرەنسی. ئەوە بۆ دووەم جار بوو کە هزری هایدێگەر کاریگەریی نواند، ئەمەش چ لەسەر کیشوەری ئەوروپا و چ لە ژاپۆن و ئەمەریکای باشوور. بەڵام کاتێك لە ناوەڕاستی شەستەکان بەدوواوە لە ئەڵمانیا گرینگیدان بە هایدێگەر کەم بۆوە، بە پێچەوانەوە هزری ئەو لە دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پتر گرنگیی پەیدا کرد. جگە لەمە ئەو پەیوەندیی گفتوگۆی لەتەك دۆستانی ژاپۆنی و فەرەنسی، بەتایبەتی لەتەك هۆنەران و هونەرمەنداندا هەبوو. هایدێگەر لە 1966/5/26 مرد و لە مێسکیرشی زێدی خۆی نێژرا. لەکاتی ناشتنیدا چەند بەیتێکی هوێلدەرلین کە خۆی هەڵیبژاردبوون، خوێنرانەوە. بەڵام دانوستاندنەکان لەبارەی هایدێگەر پاش مردنیشی هەر ناتەبا مانەوە،

ئەوجا کتێبەکەی ڤیکتۆر فاریاس ([8]) کە هایدێگەری وەك لایەنگرێکی نازیزم دانا و بەمەش لە رووی سیاسییەوە بەرپرسیاری کرد، سەرلەنوێ دانوستاندنی هایدێگەری گەرم کردەوە.

بەدەگمەن هزرڤانێکی سەدەی بیستەم هەیە کە هاوشێوەی هایدێگەر مۆرکی دابێت بە ژیانی هۆشەکیی سەردەمەکەی، بەڵام ئەم کاریگەرییەی بەرهەمەکەی ئەو تەنیا لە بواری فەلسەفەدا نەبوو، بەڵکو هاوکات کاریگەرییەك بوو لەسەر تیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی، سایکۆلۆژی و زانستی ئەدەبی. هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ رەسەنێتیی ئەو ئاڕاستەیە کە هایدێگەر رووەو پرسیارە هەرە دێرینەکەی مێژووی خۆرئاوا وەری گرت: "ئایا بوون چییە؟"؛ "ئایا بوونەوەر لەنێو بوونی خۆیدا چییە؟". بەڵام هایدێگەر لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا ئاڕاستەیەك وەردەگرێت کە پێچەوانەی مێتافیزیکی ترادیسیۆنییە، واتا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە هەوڵ نادات کاتیگۆرییەکان وەربگرێت و بەرپێیانەوە شرۆڤەی کرۆك بکات، بەڵکو دەست دەداتە شرۆڤەی دەربوون و ئەم کارەش بە یاریدەی ئێکزیستێنسیال ئەنجام دەدات. بەڵام لەبەر ئەوەی شرۆڤەی دەربوون لە مەغزای بوون دەکۆڵێتەوە، ئەوا ئەو شرۆڤەیە هاوکات بریتییە لە ئۆنتۆلۆژییەکی بناغەیی (فوندامێنتال). لە خوارەوە شوێن نیشە سەرەکییەکەی هایدێگەر لە گرنگترین هەنگاوە کرۆکییەکانیدا دەکەوین و هاوکات هەوڵ دەدەین تێگە ئێکزیستێنسیال-فەلسەفەییەکان روون بکەینەوە.

---

[8]) V. Farias: Heidegger und der Nationalsozialismus (Originalausgabe: Heidegger et le Nazisme, Paris-Lagrasse 1987), dt. Frankfurt a. M. 1989.

# بوون و کات

"بوون و کات" بە سیتاتێکی پلاتۆن لە دیالۆگی "سۆفیستێس"دا (244 a) سەرچاوە دەگرێت:

"ئاخر کاتێك ئێوە واژەی 'هەبوو' بەکاردەهێنن، ئەوا وەك دیارە ئێوە دەمێکە ئاشنان بەوە کە ئێوە خۆتان دەری دەبڕن، بەڵام ئێمە پێشتر باوەڕمان دەکرد لێی تێبگەین و ئێستاش پەشۆکاوین".

بەڵام لەبەر ئەوەی هایدێگەر پرسیارەکە سەبارەت بەوە کە داخۆ وەڵامێکی شیاو بۆ کێشەی بوون هەبێت (کە بێگومان وەڵامەکەی نەرێنییە) ئاڕاستەی خودی خۆی دەکات، ئەوا دەبێت ئەو پرسیارە سەرلەنوێ بکرێتەوە.

مێتافیزیکی خۆرئاوایی وەڵامێکی تراديسيۆنیانەی بۆ ئەو پرسیارە هەیە، لەم وەڵامەدا بوونی بوونەوەر وەك ئامادەیی بەردەوامی کرۆك دادەنێت، ئەوجا گریمانە دەکات کە کرۆك تەنیا بە شێوەیەکی تێگەیی شیاوی دیاریکردنە و هەردەم دەرفەت لەگۆڕێدایە بۆ ئەوەی مرۆ رووی تێبکاتەوە. بەڵام کاتێك مێتافیزیکی خۆرئاوایی بوون وەك ئامادەییەکی بەردەوام دادەنێت، ئەوا بەم هەڵوێستەی تەنیا جەخت لە روویەکی مەدالیاکە دەکات، ئەم رووەش بریتییە لە هەنووکەیی بەشتکراو

(هیپۆستازکراو)، لێرەشدا پشتی کردۆتە رووەکەی دیکەی مەدالیاکە، واتا: بگۆڕی و مێژوویەتیی بوونەوەر. کاتێك مێتافیزیکی خۆرئاوایی هەوڵی داوە بۆ ئەوەی بوون دیاری بکات، لەم هەوڵەیدا کاتێتی (Temporalität) راستەقینەی چەپاندووە، بەڵێ ئەو هەر لە سەرەتاوە خزاوەتە نێو لەیادچوونەوەی بوون. ئێستاش هایدێگەر دەیەوێت لە 'بوون و کات'دا ئەم لەیادچوونەوەیەی بوون کە فەلسەفەی خۆرئاوایی تێیکەوتووە، نەك تەنیا رەخنەییانە دەربخات، بەڵکو تەنانەت دەیەوێت لەکاری بخات. بەڵام لەبەر ئەوەی ناشێت ئەم کارە راستەوخۆ رووبدات، چونکە نەك تەنیا مەغزای بوون، بەڵکو تەنانەت خودی پرسیارەکە لەبارەی مەغزای بوون، لەیادچۆتەوە، واتا مرۆڤ لەیادی چۆتەوە کە ئەو پرسیارەی لەیادچۆتەوە، ئەوا دەبێت سەرلەنوێ تێگەیشتن بۆ مەغزای ئەم پرسیارە بێداربکرێتەوە. بۆیە هایدێگەر لە "پێشگۆتن"ی لێکۆڵینەوەی 'بوون و کات'دا رایدەگەیەنێت کە:

"کارکردنی کۆنکرێت لە پرسیاری مەغزای 'بوون'دا بریتییە لە مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەیە، راڤەکردنی کات وەك هۆریزۆنتی (ئاسۆی) شیاوی هەر تێگەیشتنێکی بوون بریتییە لە ئامانجە کاتییەکەی".

بەڵام لەتەك ئەم پرسیارەدا دەبێت هاوکات پرسیارێکی دیکە بکرێت: ئایا ئەم هەوڵە تیۆرییەی هایدێگەر کە شرۆڤەی دەربوونە نەك مێتافیزیکی کرۆك، بریتییە لە تەکمیلەکردنی مێتافیزیکی ترادیسیۆنی یان هیچاندنی ئەو مێتافیزیکەیە؟

هایدێگەر سەرەتا سێ پێشبڕیار پەیوەست بە تێگەیشتنی بوونەوە دیاری دەکات:

1) بوون لە روانگەی بۆچوونیترادیسیۆنییەوە بریتییە لە "گشتیترین" تێگە و دەکەوێتە سەرووی سەرجەم تێگەکانی دیکەوە، بەڵێ تەنانەت گشتیترە لە گشتێتیی ئەو تێگە رەگەزییانە کە جۆرە تایبەتییەکانی بوون لەژێر خۆیاندا رادەگرن. بەڵام واتای ئەم گشتێتییە لە سەرجەم ترادیسیۆنی فەلسەفەدا، ئەمەش هەر لە پلاتۆنەوە هەتا هێگل، ناڕۆشن دەمێنێتەوە. تێگەیەك کە گوایە لە خۆیدا روونترینە، لە بنەڕەتدا تاریکترین تێگەیە. بەڵام گەر ئەمە ئاوها بێت، ئەوسا ئیتر مرۆ نابێت لەنێو رەگەزدا بۆ گشتێتی بگەڕێت - گشتێتی کە تەنیا جۆرە تایبەتییەکانی بوونەوەر لەژێر خۆیدا رێکدەخات، واتا مرۆ نابێت لەنێو بالاترینیدا بۆ گشتێتی بگەڕێت، بەڵکو لەنێو نزمترینیدا.

2) مرۆ لە ترادیسیۆنی فەلسەفەدا دەبێژێت: بوون بەهۆی گشتێتییەکەیەوە کە بەرەهایی سادەیە، شیاوی پێناسەکردن نییە. بوون نە لە تێگە بالاترینەکانەوە وەك دەرئەنجام دەبرێتەوە و نە لە تێگە نزمترینەکانەوە شیاوی روونکردنەوەیە. بەڵام بە دیدی هایدێگەر ناشێت لەمەوە ئەو دەرەنجامە ببرێتەوە کە گوایە مرۆ لە پرسیارەکە سەبارەت بە مەغزای بوون قوتاری بووە.

3) سێیەم پێشبڕیار ئەوەیە کە گوایە بوون تێگەیەکی تەواو رۆشنە و هەموو یەکێك دەتوانێت بەبێ کێشە لێی تێبگات. بەم پێیە هەموو یەکێك لە دەربڕینی وەك "ئاسمان شینە"، "من شادمانم" و هتد

تێدەگات. بەڵام هایدێگەر لاریی لەمە هەیە و دەبێژێت: لەبەر ئەوەی هەر یەکێك لە ئێمە لەنێو تێگەیشتنێکی تایبەتیی بووندا دەژی، ئەوا مەغزای بوون بە تاریکی تەنراوە و لێرەشەوە ئیتر پێویستییەك سەرهەڵدەدات بۆ ئەوەی سەرلەنوێ پرسیارەکە سەبارەت بە مەغزای بوون بێدار بکرێتەوە.

فەلسەفە لە دێرزەمانەوە ئەرکێکی لە ئەستۆ گرتووە: پرسیارکردن لەوە کە بەدەرە لە گومان، بەڵام کاتێك هیچ ئیدێیەك لەگۆڕێدا نابێت، ئیتر فەلسەفە دەکەوێتە بەردەم ئەرکی هزرین (پەرچاندن). بەم شێوەیە دەبینین کە زمان لە هەرە سەردەمانی دێریندا هەنگاوی نا بۆ ئەوەی تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ بوون دیاریبکات، زمان بۆ نموونە بوونێکی خەبەری (/prädikativ)ی لە راست-بوونێك (Wahr-Sein) و بوونێکی راستەقینە (vertativ)ی لە بوونێکی دەربوونی جیاکردەوە، کەچی پاشان مێتافیزیکی کلاسیکی ئەم فرەجیاوازییەی هاوتاکرد، تەنیا رووی کردە پرسیاری کرۆك، لێرەشدا راڤەکانی دیکەی بوونی پشتگوێ خست.

لاپەڕەکانی سەرەتای 'بوون و کات' پیشانی دەدەن کە هایدێگەر چ ئاراستەیەك بە تێڕوانینی فەلسەفە دەدات: فەلسەفە گەرەکە سەرلەنوێ پرسیارەکە سەبارەت بە مەغزای بوون بکاتەوە، هاوکات بە پرسیاری بوون بپرسێت کە داخۆ زانینی بوون لە لایەن ئێمە چ سەرچاوەیەکی هەبێت. بەڵام لێرەدا وەڵامەکە روو ناکاتە زانینێکی "تیۆرییانە"ی گونجاو بە کرۆك، بەڵکو روو دەکاتە تێگەیشتنێکی "پێشتیۆرییانە"، تێگەیشتنێکی نەپەرچاوە (پرێرێفلەکسیڤ) کە هەمیشە پێکەوە لەتەك "دازاین"دا دراوە. پێویستە ئەم تێگەیشتنە پێشیانی و راستەوخۆیەی بوون

بێداربکرێتەوە. هایدێگەر لەم مەغزایەدا لە "تیژکردن (...) ی تێگەیشتنی پێش-ئۆنتۆلۆژییانەی بوون" دەدوێت، لێرەشدا دەیەوێت گۆڕان بە "ئۆنتۆلۆژییەکی بناغەیی" بدات.

شێوازی بوونی مرۆڤ بریتییە لە دازاین، دەربوونیش کرۆکی ئەم دازاینەیە. بێگومان مەبەستی واژەی "کرۆك" بریتی نییە لە جەوهەری رەگەز، لە گشتێتی یان توخمێتی کە پێچەوانەی تایبەتێتییەکەی هەر تاکێکە (ئیندیفیدێکە)، بەڵکو کرۆك وەك بوونی خۆیی لەتەك دەربووندا یەکدەگرێتەوە، ئەمەش لە واتای کرداری (Verb)ی "پیادەکردن-ی-دەربوون"دا (existieren). مەسەلەکە روودەکاتە جۆر و شێوازی هەبوونی کەسێك و هایدێگەر دەیەوێت بە شرۆڤەیەکی دازاین یان دەربوون ئاشکرای بکات. فەلسەفەی ترادیسیۆنی بە چەشنێك روو لە پرسیاری "مرۆڤ چییە؟" دەکات، کە هاوشێوەیە بە پرسیاری "درەختێك چییە؟" یان "بەردێك چییە؟"، لێرەشدا ئاراستەیەك رووەو کرۆکی گشتیی رەگەز وەردەگرێت، ئەوجا هەوڵ دەدات ئەم کرۆکە بە دیاریکردنی 'رەگەزی باڵاتر و جیاوازیی جۆری' ( genus proximum per differentiam specificam) ساغبکاتەوە. ئەم کارە پەیوەند بە مرۆڤەوە سەرەنجامێکی ئەوتۆ دەخاتەوە کە مرۆڤ لەژێر سەرتێگەی "زیندەوەر"دا دادەنرێت. بە پێچەوانەوە راڤەی دەربوونیی لەم پرسیارەی "مرۆڤ چییە؟"دا روو دەکاتە "ـە"یەکە (ist / is)، بەڵام ئەم "ـە"یەی (بوونەی) مرۆڤ لە کرۆکەوە جیاوازە لە "ـە / بوون"ی بابەتەکان، چونکە مرۆڤ بە پێچەوانەی بابەتەکانی دیکەوە دەتوانێت سەبارەت بە خودی خۆی و مەغزای بوون بپرسێت. شێوازی بوونی مرۆڤ هەمیشە پێکەوە لەتەك

تێگەیشتنێکی بووندا دراوە، بەڵام دەبێت لەم جێیەدا بیهێنینەوە یاد، کە ئەم تێگەیشتنە تێگەیشتنێکی زانستی یان مێتافیزیکیانەی دازاینی شتەکان و سەبژێکتەکان نییە و لەژێر کاتیگۆریی لێرەبووندا (حچور/Anwesenheit) ([9]) دیاری کرابێت، بەڵکو تێگەیشتن و ئاوەڵاییەکی پێشیانییە وەك پێشمەرجێك بۆ پێشبینی و گۆتە دەرئەنجامییە زانستی و مێتافیزیکییەکان، هاوکات شێوەیەکی حەشارنەدراویی بوون پیشان دەدات، حەشارنەدراوییەك کە دەشێت بەرانبەر وشەی "راستی" لای گریکەکان دابنرێت، ئەم وشەیەی راستیش لە کرۆکدا واتای "حەشارنەدراوی"، "دانەپۆشراوی" یان "تێکنەدراوی" دەگەیەنێت.

بەمە مێتۆدی شرۆڤەی دازاینمان بۆ روون بۆوە کە فێنۆمێنۆلۆژییە: هایدێگەر بە مێتۆدی فێنۆمێنۆلۆژی پابەندە بە هوسەرلەوە، هاوکات خۆی لێ جیادەکاتەوە. ئامانجی هوسەرل فێنۆمێنۆلۆژییەکی ترانسێندێنتالە و دەیەوێت بەم رێیەوە بگات بە مەئریفەی روون و ئاشکرای کرۆك، واتا کرۆکدیدییەکی روون، ئەم مەئریفەیەش بە مێتۆدی 'رووەو-کرۆك-بردنەوەی' (رێدوکسیۆنی) فێنۆمێنۆلۆژییانە بە ئاراستەی من-ێکی رەها بەدیدەهێنرێت، بەڵام هوسەرل لە پێناوی گەیشتندا بەم ئامانجە دازاینی هەقیقی یان مێژوویی وەلاوە دەنێت (لە دەرەوەی کەوانە دایدەنێت)، بە پێچەوانەوە کێشەی هایدێگەر تێگەیشتنە لە دازاینی هەقیقی لەنێو ژینجیهان و مێژووی ژیانی خۆیدا، ئەمەش ئەو واتایە

---

[9])، بە پێچەوانەوەی لێرەنەبوون (غیاب). لێرەبوون (حضور) و ئامادە (حاضر) لای هایدێگەر دوو تێگەی جیاوازن. (ك.ج.)

دەگەیەنێت کە هایدێگەر روو دەکاتە دازاین وەك ئەو بوونەوەرە کە لەنێو بوونیدا لە خۆی تێدەگات و خۆی بەیان دەکات (auslegt)[10] - کەواتە کێشەی هایدێگەر هێرمینیۆتیکییە. بوونەوەرێکی بەم چەشنە تەنیا کاتێك بەگونجاوی دانوستان دەکرێت، گەر وەسفکردنی فێنۆمێنۆلۆژیانە بریتی بێت لە شرۆڤە و بەیانکردنی مێتۆدیانە. لەبەر ئەم هۆیە فێنۆمێنۆلۆژیی دازاین تەنیا وەك هێرمینیۆتیك دەشێت، ئەمەش لای هایدێگەر واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە فێنۆمێنۆلۆژییەکی هێرمینیۆتیکی بخرێتە جێی فێنۆمێنۆلۆژیی ترانسسێندێنتالی هوسەرل.

لەبەر ئەوەی مرۆڤ وەك ئەو بوونەوەرە دەرکەوت کە کێشەکەی لەنێو بوونیدا خودی بوونی خۆیەتی، ئەم بوونەش هەر لە سەرەتاوە بە ئەو ئاشنایە و بۆی ئاوەڵایە پێش ئەوەی تێگەیشتنی تیۆریی-فەلسەفەیی بەسەردا بەکارببرێت، ئەوا گەرەکە ئەم تێگەیشتنە سەرچاوەییەی بوون ئاشکرابکرێت. بەڵام ئەم ئاشکراکردنە بە یاریدەی کاتیگۆری، واتا بە یاریدەی تایبەتمەندییەکانی کرۆك ئەنجام نادرێت، بەڵکو تەنیا بەڕێی ئێکزیستێنسیالەوە ئەنجام دەدرێت کە بەتایبەتی سێ دانەیان پڕواتان. ئەم سێ ئێکزیستێنسیالە لە پێکهاتە بناغەییەکەی دازاینەوە کە لە-جیهان-بوونە، دەکەونەوە و بریتین لە: 1) جیهانێتی وەك خودی جیهانێتی؛ 2) لەتەك-بوون و خۆبوون؛ 3) لەنێو-بوون (In-Sein)، ئەمیش بەتایبەتی وەك حاڵی هەستەکی (Befindlichkeit) و تێگەیشتن، ئەوجا ئەم سێ ئێکزیستێنسیالە لەنێو تێگەی زۆرگە (Sorge)دا یەکدەخرێن.

---

[10]) دەبێت بەیانکردن لەبریی ڕاڤەکردن (Interpretation) دابنرێت. (ك.ج.)

هایدێگەر بە تێگەی زۆرگە هەوڵ دەدات کە دازاین وەك سەرجەم دیاریبکات. گومانی تێدا نییە کە هایدێگەر لە حاڵەتی بونیادە سێیەکییە دیالێکتیکییەکاندا قەرزی لە ئیدیالیزم کردووە و ئەم بونیادانەی بۆ نێو کۆنتێکستی کاتێتی تەرجومە کردووە، بەلام سەرەڕای ئەمە لە روونکردنەوەی پێکهاتە بناغەییەکەی دازایندا لە خودی دازاینەوە دەردەچێت و بەسەر پەیوەندیی جیهانیدا بۆ لای دازاین دەگەڕێتەوە. ئەم ساتانە گەرەکە لەتەك ساتگەلی دیکەدا کە سەر بە کۆنتێکستی ئەو ساتانەن، روونبکرێنەوە.

## 1- لە-جیهان-بوون ی دازاین

هایدێگەر لە سەرەتای 'بوون و کات'دا بونیادە بناغەییەکەی دازاین وەك لە-جیهان-بوون دیاری دەکات. بەلام پێدەچێت ئەم ناونیشانە بەهەڵەتێگەیشتنێکی جووتەنی بخاتەوە: رەنگە مرۆ لە حاڵەتی یەکەمیاندا وای بۆ بچێت کە لەنێو-بوون بریتی بێت لە شێوەیەکی "تێدابوون"، واتا مرۆڤ شوێنەکییانە لە جیهاندا بێت وەك چۆن ئاو لەنێو پەرداخدایە یان دانەوێڵە لە کوانوودایە؛ گەر ئەم جۆرە لێتێگەیشتنە وەربگرین، ئەوسا مرۆڤ سەر بە سەرجەمی بوونەوەرەکان دەبێت، ئەم سەرجەمەش وەك باوە ناو دەنرێت "جیهان" و مرۆڤیش هاوشێوەی شتەکانی دی لەنێویدا دەبێت. بەلام مەبەستی هایدێگەر بە هیچ شێوەیەك ئەمە نییە. تێگەیشتنێکی دیکە لە لەنێو-بوون دەشێت بە

چەشنێك بێت، هەروەك مەبەستی هایدێگەر بریتی بێت لە سەبژێکتێکی بێجیهان کە ناچارە لە کایە ناخەکییەکەی خۆی بچێتە دەرەوە بۆ ئەوەی پەیوەندی بە ئۆبژێکتەکانی جیهانی دەرەوەی خۆی بکات. بەڵام مەبەستی هایدێگەر ئەمیش نییە. لەنێو-بوون، وەك ئێکزیستێنسیال، بەرێی ناسینی ئۆبژێکتییانەی (موچوعی) جیهانەوە نایەتە گۆڕێ، بەڵکو خۆی مەرجی ئەو ناسینە ئۆبژێکتییە پێکدەهێنێت و واتاکەی بریتییە لە: "ئاشنایی لەتەك"، "لە نزیکەوە بوون ی"، "قەرارگرتن لە دەڤ جیهان"، "جیهانێکی هەردەم بە پێشیانی ئاشکراکراو". هایدێگەر ئەم "هەمیشە-لە-لا-ی-شتێك-بوون"ـە لە رووی ئێتیمۆلۆژییەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ وشەی "ئیننان" (innan) کە وشەیەکی ئەڵمانیی کۆنی باڵایە و واتای "گوزەران-تێدا-کردن" (بە ئەرەبی: سکن) دەگەیەنێت، یان دەیگەڕێنێتەوە بۆ هابیتارە (habitare)، واتا "نیشتەجێبوون لە لای ...". هەروەها جیهان لای هایدێگەر جیهانی بابەتی نییە کە بێلایەن و بێپەیوەندی بەرانبەر مرۆڤ وەستابێتەوە و لە لایەنی خۆیەوە پرسیارێك سەبارەت بەوە بخاتەوە کە داخۆ چۆن مرۆ وەك سەبژێکت بە ئۆبژێکتەکان بگات. ئەم جۆرە پرسیارانەی فەلسەفەی ترادیسیۆنی هیچ ئاشناییەکیان لەتەك شێوازی بوونی دازایندا نییە کە هەمیشە لەلای شتەکان و جیهانێکە. بابەتە دەرەکییەکان هەمیشە بە ئاشناییەکی کەم یان زۆر بە مرۆڤ دەگەن و بۆ ئەو واتای شتێك دەگەیەنن، ئاماژە بۆ شتێك دەدەن، یان داوای لێدەکەن شتێك بکات، یان دەردەستی / حازردەستی ئەون، بۆ نموونە وەك ئەو بوونەوەرە کە هایدێگەر ناوی دەنێت "تسۆیگ" (Zeug - ئامراز). مۆرکی ئامراز بریتییە لە شیمانەی سانای بەکارهێنان و خزمەتکارییەکەی،

هەروەها خۆی هەمیشە لەنێو پەیوەندییەکی ئاماژە و کارایيدا دەبینێتەوە و بناغەی ئەم پەیوەندییەش لەنێو بۆخاتری-ویست (-Um willen)ی دازایندایە. گەر کەسێك ببێژێت کە مرۆ بە شێوازی لە-جیهان-بوون دەربوون پیادە دەکات (existiert)، ئەوا مەبەستی لەوەیە کە ئەم جیهانە هەر لە سەرەتاوە بۆ ئەو ئاوەڵایە (erschlossen)، ئەمەش بە چەشنێك کە ئیتر پێویست ناکات ئەو پردێك رووەو جیهان رابکێشێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە جیهان لەسەر شێوازێکی زۆر رەسەن هەمیشە هەر لە ئێرەیە. ئێمە دەتوانین وایدابنێین کە لە-جیهان-بوون سەرهەڵدانی مرۆڤە لەنێو پەیوەندیی واتادا.

## 2- خودی جیهانێتی

لە رۆژانەوە شیمانە بۆ پیشاندانی ئاشنایەتیی دازاین بە بابەتەکانەوە دەرەخسێت. ئەو جیهانە کە سەرەتا بە ئێمە دەگات، جیهانی دەورمانە (Umwelt)، هەروەها ئەو بوونەوەرە کە ئێمە رۆژانە مامەڵەی لەتەکدا دەکەین، بریتی نییە لە شتێکی 'پێشدەست' (Vorhandenes)، واتا ئەو بوونەوەرە ئۆبژێکت نییە لە مەغزایەکی تیۆریانەدا، لە واتای ئۆبیسەرەی لاتینیدا (obicere = لە-بەردەم-خۆ-دانان، بەرانبەر-خۆ-دانان)، بەڵکو "دەردەست/حازردەست"ێکە (Zuhandenes)، شتێکە کە وەك دەردەستی کەسێك کەوتووە، وەستاوە، دەڕوات، بەڵام هەروەها دەشێت لەسەر رێگە کەوتبێت، سەغڵەت بکات. ئەو شتە لە واتایەکی پراکتیکیدا بریتییە لە

ئامراز. پیشاندانی ئەم جیاوازییە لە نێوان پێشدەستی و دەردەستیدا یەکێکە لە گرنگترین و رەسەنترین کار لە فەلسەفەی هایدێگەردا کە هەرگیز نەدەشیا بەبێ شرۆڤەی ئێکزیستێنسیال ئەنجام بدرێت. گەر لە رووی ترادیسیۆنییەوە بڕوانین، دەبینین کە ئۆبژێکت وەك پێشدەست لێدەڕوانرا، وەك بابەتی پەرچاندنی تیۆرییانە، بابەتی زانست، واتا وەك بابەتی لێڕوانینی میانەگیر، دادەنرا، بەڵام دەردەستی بە پێچەوانەوە تێگەیەکە کە شتەکان لە نزیکترین مامەڵەکردندا دیاری دەکات: وەك مامەڵەکردنی پراکتیکی. پێش ئەوەی شتەکان لە لێڕوانینی میانەگیری تیۆرییانەدا بەر دیدمان بکەون، پراکتیکییانە پێمان دەگەن. مۆرکی هەڵوێستی پراکتیکی بەرانبەر بە شتەکان بریتییە لە "هۆشمەندی/بینین لە گشت روویەکەوە" (Umsicht)، بەڵام مۆرکی هەڵوێستی تیۆرییانە بەرانبەر بە شتەکان بریتییە لە "لێڕوانین" (Hinsicht). هۆشمەندی بریتییە لە تێگەیشتن و قاڵبوون لەنێو پەیوەندیی ئاماژە و بەتەنگەوەبووندا، ئەمەش لەو شێوەیەدا کە چۆن ناڕاستەوەرگرتنی پراکتیکی بەردەوام لە ژیانی رۆژانەدا داوامان لێدەکات. گەر ئێمە ئەم هۆشمەندیە نەهێڵین/ هەڵبگرین (aufheben - هەڵگرتن)، ئەوسا ئێمە لە ئاشنایەتیی بابەتەکان دوور دەکەوینەوە و دەستبەرداری جیهان دەبین. گەر تیۆرییەکی مەتریفە روو بکاتە جیهان یان سروشت و تەنیا وەك پێشدەست دایبنێت، لەو شێوەیەدا کە زانست دەیکات، ئەوسا ئەو تیۆرییەی مەتریفە کارەکتەری لەجیهانخستنی (Entweltlichung) جیهان وەردەگرێت، ئەوسا فێنۆمێنی جیهانێتی، فێنۆمێنی هەمیشە ئاوەڵابوویی پەیوەندییەکانی واتا، وەلاوەدەنرێت.

هایدێگەر بە نموونەی ئامراز پیشانی دەدات کە چۆن هەمیشە پەیوەندییەکانی ئاماژە هەر لە سەرەتاوە ئاشکرا کراون. هەرگیز ئامراز تەواو سەربەخۆ و دابڕاو نییە، بەڵکو شتێکی بەکارهێنانە و وەك ئەم شتە ئاماژە بۆ شتێکی دیکە دەدات، جا ئەمە "بۆچی"ی بەکارهێنانەکەی، "لەکوێوە"ی دروستبوونەکەی یان "لەچییەوە"ی کەرەسەکەی و هتد بێت. ئێمە دەتوانین ئەم کێشەیە بە نموونە بەناوبانگەکەی هایدێگەر لەسەر چەکوش روون بکەینەوە: چەکوش بۆ ئەوە لێرەیە تاکو بزمار دابکوترێت، بزمار بۆ ئەوە لێرەیە تاکو کۆڵەکە بچەسپێنرێت، کۆڵەکە بۆیە لێرەیە تاکو خانوویەك دروست بکرێت، خانوویەك بۆیە لێرەیە تاکو مرۆڤ لە کەشی نالەبار بپارێزێت و هتد. هەموو ئامرازێك، جا ئامرازی دوورین یان نووسین، ئامرازی پێڵاو یان فڕین یان ئاژووتن بێت، یان ئەو ئامرازە بێت کە مرۆڤ لەبەری دەکات و ناوی پۆشاکی لێدەنێت، خۆی لەنێو پەیوەندییەکی ئاماژەداندا دەبینێتەوە، ئەوجا تەنیا لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکی ئاماژەدانی بەم چەشنە هەمیشە لەنێو بوونەوەرەکەدا ئاشکرا کراوە، ئەوا کارابوونی ئاسایی شتەکانی بەکارهێنان سەرهەڵدەدات. کاتێك مرۆ مامەڵەیەکی پراکتیکی لەتەك ئامرازدا دەکات، ئەوا دەردەستییەکە نابێت بە کێشە، بەڵکو دەردەستییەکە شتێکی ئاساییە و کەسی کردارنوێنیش هیچ پەرچاندنێك لەبارەی ئەنجام نادات، بەڵام دوای ئەوە کە ئامرازەکە چیدی کارا نابێت (فونکسیۆن ناکات - و)، ئیتر ئەو ئامرازە لەنێو پاسیڤێتییەکەی خۆیەوە دێتە دەرەوە و هاوکات مرۆ لە کارایی پێشینی ئەو ئامرازە بەئاگا دێت. ئێستا ئەو ئامرازە چیدی دەردەست نییە و مرۆ ناچارە بەهۆی بەرچاوکەوتووییەکەیەوە رەچاوێك

ناڕاستەی بکات، بۆیە ئێستا بووە بە پێشدەستێك. هایدێگەر لە حاڵەتی لەکارکەوتندا سێ پلە دیاری دەکات: 1) بەرچاوکەوتوویی (Auffälligkeit)؛ 2) سەغڵەتکەری (Aufdringlichkeit)، 3) گیریی (Aufsässigkeit). پلەی یەکەم بریتییە لە زیانپێکەوتوویی، واتا ئامرازەکە چیدی کارا نییە، ئەم حاڵەتەش دێتە ناراوە، گەر ئامرازەکە چیدی شیاوی بەکارهێنان نەبێت، جا هۆی ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە کەرسەکەی چیدی گونجاو نییە، یان لەنێو خودی ئامرازەکەدا خەوشێك هاتۆتەئاراوە. سەغڵەتکەری بریتییە لە پلەیەکی بەرزتری نادەردەستی. چیدی-دەردەست-نەبوون یان چیدی-خۆ-بەدەستەوەنەدان دێتە ناراوە، گەر مرۆ هەست بە دیارنەمانی شتێك بکات، گەر لەوێ نەبێت. ئەوجا گیری نیشانەیەکە بۆ ئەو دۆخە کە تێیدا شتێك لەسەر رێ کەوتووە، لەم لا و لا کەوتووە، مامەڵەکردنی پراکتیکی تێکدەدات، یان رێ بە کەسێك دەگرێت.

بێرتۆلد برێشت هەمان فێنۆمێنی ناو نا کارایی نامۆکردن (تەغریب) و لە دراماتورگییەکەیدا بەگەڕی خست. بۆ نموونە: ئێمە هەموو رۆژێك بەو کۆڵان و شەقامەدا کە دەیانناسین، دەڕۆین بۆ زانکۆ، لێرەشدا ئاشکرایە کە هەموو شتێك بە ئێمە ئاشنایە. ئێمە بە ئەوپەڕی مسۆگەری دەبزوێین بەبێ ئەوەی تەماشای لای راست و چەپ بکەین و رەچاوی شتێکی سەرنجڕاکێش بکەین. کتوپڕ، بەڵام نازانین چۆن، خانوویەکمان بەرچاو دەکەوێت، بۆ نموونە ئێرکەرێك کە لە خانەی بیناسازیی گۆتیکدا دادەنرێت، بەڵام ئێستا دەبینین کە ئەم تێڕوانینە ناگونجێت بە دەرشێوەی (Fassade) پەنجەرە و هەڵچنراوەکانی سەر سەربان (Dachgiebeln) کە بارۆکن. ئەو خانووە بەرچاوکەوتووە هەموو

فێنۆمێنەکانی دەوری تێوەدەگلێنێت؛ ئێستا ئەوانیش سەرنجمان بۆ لای خۆیان رادەکێشن، ئێستا رەچاوی ئەوانیش دەکەین پەیوەند بە گونجاوییان یان نەگونجاوییان بە خانووی دیکەوە. لەم فێنۆمێنانەوە پتر سەرنج دەدەین، لە خانووەوە بۆ خانووی تەنیشتی، لەویشەوە بۆ ریزی خانووەکان و هتد. کتوپڕ بونیادە ئاشناکان دەکرێنەوە، ئێستا پەیوەندیی نوێی شێوە و بونیاد دەبینین. برێشت ئەم مونایەشەیە ناودەنێت نامۆکردن (تەغریب) کە تێیدا ئاشنا دەبێت بە نائاشنا، دەبێت بە مەترسی (unheimlich)، چونکە چیدی 'خۆماڵی' (heimisch) نییە و بەهۆی بەرچاوکەوتووییەوە تەنیا بە لێهزرین شیاوی پێگەیشتنە.

هایدێگەر بەم شرۆڤە وردەی جۆری بوونی ئامراز دەیەوێت ئەو جیهانێتییە دیاربهێنێت کە مرۆ نێوجیهانییانە پێیدەگات، ئەو دەیەوێت پیشانی بدات کە جیهان لە گەیشتنیدا بە مرۆڤ هەمیشە لە سەرەتاوە وەك سەرجەم بە شێوازێکی تایبەتی ئاشکراکراوە، جا گەرچی ئەم ئاشکراکراوییە لە مامەڵەی پراکتیکیی رۆژانەدا ناکرێت بە بابەتی هزرین. ئاشکراکراویی یان ئاشکرابوویی پێشیانی هەمیشە سەرجەمێتیی بایەخمەندییەکە دەگرێتەوە و لەم سەرجەمێتییەدا تاکە شتەکانی بەکارهێنان وەك پرمەغزا دەردەکەون. بۆ نموونە لە وەرشەکەماندا کە شوێنی بەکارهێنانی ئەم یان ئەو بابەتەیە، هەموو تاکە ئامرازێك شوێن و واتای خۆی وەك سەرجەم وەردەگرێت، سەرجەمێتیی بایەخی وەرشەکە، لەپێناو-چی-بووی وەرشەکە، وا دەکەن کە دەردەستیی ئامرازەکان بکەوێتەوە، نەك بە پێچەوانەوە. ئاماژەدانەکان سەرجەمێتیی ئەو جۆرە پەیوەندییانەی بایەخمەندی بونیاددەنێن. بۆ نموونە ئامرازێك ئاماژە بۆ

یەکێکی دی، ئەمیش بۆ یەکێکی دی، ئەمیش بۆ سێیەمێك و چوارەمێك دەدات و بەم رێیەوە واتایەك پەیدادەكات. ئامرازێکی تایبەتی بۆ نموونە ئاماژە بۆ کەرەسەی بەرهەمەکە دەدات، بەرهەمەکە ئاماژە بۆ بەکارهێنانە تایبەتیەکەی لە لایەن مرۆڤەوە و هتد دەدات. لە کۆتاییدا ئاماژەدانەکانی لەپێناو-چی-بوون دەرژێنە نێو بۆخاتری-ویست (Um-willen)ـەوە کە دازاینە. تەنیا مرۆڤ لەخۆدا مەبەستە، ئەوە تەنیا دەربوونە کە کێشەکەی لەنێو دازاینی خۆیدا خودی ئەم بوونەی خۆیەتی، بۆیە کارەکتەری دەربوونی دازاین بناغەی جیهانێتیی جیهانە.

سەرجەمێتیی ئەو جۆرە پەیوەندییانەی ئاماژەدان بریتییە لە پێکهێنەری جیهان وەك جیهانی دەوروبەر (Umwelt). بێگومان جیهان لەنێو جیهانی دەوروبەردا خاڵی نابێتەوە، بەڵام بونیادی جیهانی دەوروبەر وەك واتا، ئاماژەیەکی گرنگ بۆ بونیادی خودی جیهان دەدات، یان بریتییە لەو سەرەتایە کە دەشێت لێوەی پرسیار لە جیهان بکرێت سەبارەت بە مەغزاکەی. بەڵام هەروەها لە-جیهان-بوون-یش وەك پێشمەرجێك بۆ شیمانەی مەئریفە دەردەکەوێت. تەنیا لەسەر بناغەی ئەم ئاشکراکراوییە پێشیانییەی جیهان دەرفەت بۆ هاتنەئارای ناسین/زانین دەڕەخسێت، بەڵام لە حاڵەتی ئەم زانینەدا سەبژێکت ناچارنەکراوە بۆ ئەوەی کتوپڕ بە شێوازێکی نارۆشن باز بۆ نێو کایەی دیکە بدات، واتا کردارێك ئەنجام بدات کە کێشەیەکی سەرەکیی روونکردنەوەیە لە هەموو ئەو تیۆریانەدا کە دووبەشبوونی سەبژێکت-ئۆبژێکت لەخۆدەگرن. فەلسەفەی هایدیگەر هاتە مەیدانەوە بۆ ئەوەی کۆتایی بە دوالیزمی تیۆریی مەئریفە بهێنێت کە لەکاتی دێکارتەوە لەگۆڕێدایە.

## 3- لەتەکبوون (das Mitsein)

دازاین تایبەت نییە بەوە کە تەنیا لە-جیهان-بوون بێت و ئامراز بخاتەوە، بەڵکو ئەو هەروەها هەمیشە لە-جیهان-بوون-ێکە کە لەتەک-دازاین ی ئەوانیدی دەخاتەوە. هەروەها ئەوانیدی بە یەک دەگەن لە مامەڵەکردنێکی بەتەنگەوەبوودا (besorgend)، بۆ نموونە لەو شێوەیەدا کە چەکوشەکە لە لای کەسێك کڕراوە، سەئاتەکە لە لایەن فلان جەناب یان فلان خانمەوە بەدیاری هێنراوە. ئەوانیدی لەنێو ئەم جۆرە کۆنتێکستانەدا وەك دروستکەر، نێرەر، کڕیار، دیاری پێبەخشراو و هتد دەردەکەون.

بەڵام پێویستە لەم حاڵەتەشدا رێ لە بەهەڵەتێگەیشتن بگرین. واتای لەتەکبوون ئەوە نییە کە سەبژێکتانی دی لە دەرەوەی هەبوونی خۆ هەبن و لێیان ئەم هەبوونەی خۆ جیابووبێتەوە، هەروەها واتاکەی ئەوە نییە کە هەروەك ئێمە بەردەوام پەیوەندیمان لەتەك مرۆڤانی دیکەدا هەبێت؛ بە پێچەوانەوە، لەتەکبوون، وەك ئێکزیستێنسیال، مەرجە بۆ ئەو شیمانەیە کە ئەویدی یان ئەوانیدی بۆیان بلوێت بەیەك بگەن، مەرجە بۆ هەبوونی دالدە یان پێچەوانەکەی کە تەنیاییە، هەروەها کراوەیی دازاین بۆ ئەوانیدی پێشمەرجێکە چ بۆ هەر خۆدەربڕین و خۆدرکاندنێك، چ بۆ هەر خۆداخستن و نامۆبوونێك.

بێگومان ئێمە بەتەنگەوەبوونمان نییە (nicht besorgt) بۆ ئەوانیدی وەك ئامراز، بەڵكو بۆ ئەوان فیورزۆرگەمان (Fürsorge) هەیە، ئەمەش نەك لە واتایەكی كۆمەڵایەتی-ئێتیكیدا، بەڵكو لە واتایەكی دەربوونگەراییدا. جۆرەكانی فیورزۆرگە بریتین لە خۆشەویستی، ئاگاداری، ڕێز، بەڵام هەروەها گرنگیپێنەدان، بەلاییەكتێپەڕبوون و هتد.

بەڵام لە كایەی لەتەكبووندا زۆر ئاسان پرسیارێك سەبارەت بە "كێ"ی دازاین و لەتەكبوون سەرهەڵدەدات. ئەو وەڵامە كە هایدێگەر پەیوەند بە ئەزموونی مێتافیزیكی ترادیسیۆنیی جەوهەر و سەبژێكتەوە دەیداتەوە، سەرەتا سووڕهێنەرە: كێی دازاین نە ئۆنتۆلۆژییانە جەوهەرە و نە ڕێزمانییانە سەبژێكتە، واتا بریتی نییە لە من-ی ڕستە، بەڵكو بریتییە لە داس مان (das Man): مرۆ/ هەركەس (المرو). خود سەرەتا و بەزۆریی وەك مرۆ بە ئێمە دەگات. مرۆ شێوازی دەربوونی ناخۆییە (uneigentlich) و دازاین لەم جۆرە دەربوونەدا جارێ شیمانە خۆییەكانی بەدەستنەهێناوە، بەڵكو دەرفەت دەدات لە لایەن ئەوانیدییەوە ڕابەری بكرێت و پێیانەوە پابەندبێت. گەر بەپوختی واتای "مرۆ" بگرین، ئەوا دەبینین كە "مرۆ" خۆیەتی نییە، بەڵكو هەڵاتنە لە توانین-ی-بوون (Sein-Können)ی خۆیی، ئەمەش هەڵاتنە ڕووەو ئەوە كە ئەوانیدی، هەموو ئەوانیدی، بۆچوونیان لەبارەی هەیە، دەیبێژن، دەیانەوێت، دەیكەن. هایدێگەر پەیوەست بەمەوە دەبێژێت:

"ئێمە چێژ و شادی دەبینین، وەك چۆن مرۆ چێژ دەبینێت؛ ئێمە دەخوێنینەوە و دەبینین، بڕیار بەسەر ئەدەب و هونەردا دەدەین، وەك

چۆن مرۆ دەبینێت و بڕیار دەدات؛ بەڵام ئێمە هەروەها لە 'ئاپۆرە' دوور دەکەوینەوە، وەك چۆن مرۆ دوور دەکەوێتەوە؛ ئێمە ئەو شتە وەك مایەی 'تووڕەبوون' دەبینین، کە مرۆ وەك مایەی تووڕەبوون دەیبینێت" ([11]).

لەبەر ئەوەی مرۆ دیاریکراو نییە، بەڵکو گشتێتییە، ئەوا مۆرکەکەی بریتییە لە مامناوەندێتی و پێکەوەگونجاندنی سەرجەم شیمانەکانی بوون. مرۆ بریتی نییە لەم یان لەو دیاریکراوە، هەروەها کۆی هەمووان نییە، بەڵکو نیۆترومە (جەمادە)، بریتییە لە نادیاری (Anonymität). کەچی ئێمە دەمانەوێت مرۆ بین، چونکە باری بوون لەسەرمان سووك دەکات. ئەمە بۆ نموونە لە حاڵەتی تاوان و بەرپرسیاریدا دەردەکەوێت: هەموو لە تاوانەکەدا بەشدار بوون و هیچ کامیان ئەو تاوانەی ئەنجام نەداوە، هیچ کامیان بەرپرسیاریی بۆ ئەو تاوانە وەرناگرێت. هەموو تاکێك دەتوانێت خۆی لە پشتی گشتێتییەوە حەشار بدات.

هایدێگەر دەربوونی ناخۆیی (uneigentlich) و خۆیی (eigentlich) لە یەك جیا دەکاتەوە. لە حاڵەتی دەربوونی ناخۆییدا، لە حاڵەتی 'مرۆ'دا، شیمانەکانی بوون داپۆشراون و تەنیا بە هەڵدانەوەیان شیاوی بردنەوەن. پرسیارێکی ساغنەبۆوە کە لە توێژینەوەکاندا سەبارەت بە هزری هایدێگەر دەکرێت، ئەوەیە کە داخۆ پەڕینەوە لە دەربوونی ناخۆییەوە بۆ دەربوونی خۆیی بریتی بێت لە ئاڕاستە و شوێنکەوتنی ئێتیکێکی تایبەتی، پابەند بەمەشەوە گەرەکە بپرسین کە ئایا مەبەست

[11]) Sein und Zeit, S. 126 f.

له چ ئێتیکێکه، یان ئایا واتاکەی پەڕینەوەیە لە دازاین و ژیانێکی دراوەبەری بێئاگا و نەهزریوەوە رووەو دازاینی ئاگامەند و هزریو؟ پێدەچێت ئەمەی دوایی مەبەستی هایدێگەر بێت، چونکە ناتوانین لای ئەو وەلامێك بۆ ئەم پرسیارە ببینینەوە. مەسەلەکە لە حاڵەتی ئەو ئەلتەرناتیفەشدا بە هەمان شێوەیە، کە داخۆ مەبەستی هایدێگەر رەخنەگرتن بێت لە ترادیسیۆن، رەخنەگرتن بێت لە خوو و ئاکارە گەیەنراوەکان لە ترادیسیۆنەوە کە پێویستە بۆ بەرژەوەندیی ئاکار و خووی دیکە وازیان لێبهێنرێت، یان داخۆ کێشەی ئەو ئاشکراکردنی ئەو پابەندییانە بێت کە هەرگیز شیاوی هیچاندن (هەلگرتن) نین. لەم حاڵەتەشدا پێدەچێت ئەمەی دوایی مەبەستی هایدێگەر بێت.

لەبەر ئەوەی ئاخۆیی وەك 'خودی مرۆ' و خۆیی وەك 'خودی من' ریشەیان لەنێو ئاوەلایی بنەڕەتیی دازایندا داکوتیوە، ئەوا گەرەکە وردتر روو لەم کێشەیە بکەین. دوو شێوازەکەی ئاوەلایی بریتین لە حالی هەستەکی (Befindlichkeit) و تێگەیشتن.

## 4- حاڵی هەستەکی و تێگەیشتن

ـ هەستەکی لای هایدێگەر واتای میزاج (Stimmung) یان میزاجمەندی (Gestimmtsein) دەگەیەنێت. لە حاڵی هەستەکیدا دەردەکەوێت کە رەوشی هەستەکیی کەسێك چۆنە، یان خودی جیهان چۆنە. بەڵام ئەمە واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە جیهان لە حاڵی هەستەکیدا میزاجمەندانە پێش هەر زانینێکی هزرڤانانە (ئینتەلەکتوێلی) و تیۆرییانە ئاشکراکراوە، جا ئەمە لە حاڵەتی ترسدا (Furcht) بێت وەك مەترسی یان پەخشاندنی ترس، یان لە حاڵەتی شادمانیدا بێت وەك ساکارێتی و جۆشداری کە تێیدا هەموو شتێك لەنێو رەنگی ئاڵووالآدا نقوم بووە. بێگومان نابێت لەمە ئاوها تێبگەین کە هەروەك جیهان پێش میزاج و سەربەخۆ لە میزاج درابێت و تەنیا لە شئورپێکردندا بە شێوەیەکی سەبژێکتی (زاتی) رەنگین ببێت، بە پێچەوانەوە لە میزاجدا جیهان لە ئاوها-بوون-یدا ئاشکرا کراوە.

ئەم ئێکزیستێنسیالەش پیشانی دەدات کە ئەوە هزر نییە، ئەوە توانستی هزرڤانانەی رووکردووە کرۆك نییە کە رۆڵی سەروەر دەنوێنێت، وەك چۆن ئەمە لە فەلسەفەی ترادیسیۆنیدا نوێنەرایەتی دەکرێت، بەڵکو ئەوە میزاجە، ئەوە هەست یان حاڵی جەستەییە کە لە ئاشکراکردنی شێوازی دەربوونی جیهاندا، یان پوختتر ببێژین، لە شێوازی لە-جیهان-بووندا، کاریگەرە. ئەوەش کە میزاج وەك ترس (Furcht) یان شادمانی، شەرمنی یان جەربەزەیی ئاشکرای دەکات، یا شیمانەی لە-جیهان-بوون-ن.

هایدێگەر بەتایبەتی جەخت لە دوو حاڵی هەستەکی دەکات: سام / هەیبەت (Angst) بە پێچەوانەی ترس، ئەوجا وەڕسی، ئەو هەروەها ناویان دەنێت حاڵە بناغەییەکان کە تێیاندا دازاین بۆ شیمانەکانی فڕێنەدراوە، بەڵکو بۆ خودی خۆی فڕێدراوەتەوە. کاتێك لە ترسدا لەچییەك هەیە (ئەوە کە مرۆ لێیدەترسێت)، واتا بەرانبەرێکی دیاریکراو هەیە، هەروەها ترسی لەدەستدان هەیە (بۆ نموونە ترسی لەدەستدانی ماڵ یان موڵکی خۆ)، بە پێچەوانەوە سام بێبابەت و بێهۆیە. لەم حاڵەتەدا لەچییەکە دیاری نەکراوە، بریتییە لە هیچێك/نابوونێك و هیچکوێیەك، ئەمە مەترسیی لەدەستدانیش دەگرێتەوە. لە سامدا، هەروەها لە وەڕسیدا، هەموو بوونەوەرێکی دیاریکراو پاشەکشە دەکات، بێواتا و ناگرنگ و بێباك دەبێت، ئێستا هیچ زامنێك بەدەستەوە نادات، ئەوجا کاتێك ڕۆدەچێت، ئیتر دازاین بۆ خودی خۆی فڕێدەداتەوە. لەبەر ئەوەی لە سامدا ئاشنایی بە جیهانی دەوروبەر (Umwelt) و هاوجیهان (Mitwelt) نامێنێت، ئەوا سام بۆ دازاینی ئاشکرا دەکات کە تەنیاکەوتنی ئەو پڕمەترسییە (unheimlich) (بێلانەییە – و). دازاین کە هیچ زامنێکی بە بوونەوەرەوە نەماوە، جا زامن بێت بە دەردەستەوە یان بە بەردەستەوە/پێشدەستەوە، بەتەواوی بۆ خودی خۆی فڕێدراوەتەوە. بۆیە سام خۆییترین بوون، تاکە بوون، ئاشکرا دەکات، ئەمەش بەواتای: ئازادبوون بۆ ئازادیی ئیختیارکردن یان نەکردن. بە شێوەیەکی دی ببێژین: ئەوە ئازادبوونە بۆ ئیختیارکردنی خۆیەتیی یان ناخۆیەتیی دازاین.

دووەم ساتی بناغەیی بۆ ئاوەڵایی دازاین بریتییە لە تێگەیشتن. ڕەنگە مرۆ بەهۆی بەرانبەریەکدانانی شێوازی تێگەیشتنی پێشزانستی و زانستییەوە وای بۆ بچێت کە هەروەك هایدێگەر تێگەیشتنی وەك دژبەری ڕوونکردنەوە دانابێت، بەڵام ئەمە ڕاست نییە. هەروەها تێگەیشتن بۆ هایدێگەر دژبەری بناغەڕشتن نییە، واتا بەرانبەر شێوازی مەئریفەی زانستە هۆشەکی (مرۆڤایەتی - و) و سروشتییەکان داینەناوە، بەڵکو ریشەییتر دایناوە و واتای "توانینی بوون" (Sein-Können) دەگەیەنێت. ئەم جۆرەی تێگەیشتن پشت بە شێوازی ئۆنتیی (ئەمپیریی –و) ئاخافتن دەبەستێت، واتا "شتێك بتوانرێت"، "دەرەقەتهاتنی شتێك"، "پەیبردنی خۆ بە شتێك".

مەبەستی ئەم دیدەی تێگەیشتن لە ڕووی دەربوونگەراییەوە ئەوەیە کە تێگەیشتنی دازاین لە خۆی و شتەکان مەئریفەیی (کۆگنیتیف) نییە، بەڵکو هەمیشە پێش مەئریفە لەبارەیان دەزانێت. ئەمە بەتەواوی بریتییە لە هەڵگێڕانەوەی ڕستە دێکارتییەکەی "من دەهزرێم کەواتە من هەم" بۆ ڕستەی "من هەم، کەواتە من دەهزرێم و تێدەگەم". بێگومان ئەم تێگەیشتنە لەو شێوەیەدا نییە کە هەروەك دازاین وەك ڕەچاوکەرێکی بێلایەنی خۆی و جیهان دەربکەوێت، یان بەڕێی ڕوانینەوە لە خۆی هەڵوێست ڕووەو خودی خۆی وەربگرێت، نەخێر، تێگەیشتن بۆ هایدێگەر بریتییە لە بەپرۆژەکردن (Entwerfen). لەم ڕوانگەیەوە دازاین پەیوەست بە شیمانەکانییەوە پرۆژەی توانای بوونی خۆیی یان ناخۆیی دادەنێت و تەنیا بەم ڕێیەوە توانای بوونی خۆی ئاشکرا دەکات. دازاین کە بۆ نێو دازاین، بۆ نێو فاکتیسیتیێ، فڕێدراوە، هاوکات پرۆژەی (Entwurf) شیمانە

خۆییەکانێتی. ئەم حاڵەتە لەلای هەموو فەیلەسوفەکانی دەربوون ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت. کردنی شیمانەکان بە پرۆژە هەوەسناسا نییە، بەڵکو بەندە بە مەودای شیمانە دراوەکانەوە (فاکتییەکانەوە)، یان خراوەتە نەستۆی فرێدراوی. یان پتر جەختلێکەرانە ببێژین: پرۆژە بریتییە لە 'پرۆژەی هەڵدراو/بەردراو' (geworfener Entwurf).

## 5- دازاین وەك زۆرگە

کێشەکە هەتا ئێستا بریتی بوو لە ڕوونکردنەوەی ساتە بناغەییەکانی دازاین؛ دازاین وەك لە-جیهان-بوون. بەڵام ئێستا کێشەکە بریتییە لە یەکێتیی ئەم ساتانە، واتا گەرەکە خۆمان بە سەرجەمێتیی دازاینەوە خەریك بکەین. بێگومان ئەم سەرجەمێتییە واتای پێکەوەلکاندن یان ناوێتەکردن ناگەیەنێت، بەڵکو یەکێتییەکی بنەڕەییە. لە پاشخانی ئەم کێشەیەدا تێزەکەی تیۆریی گێشتالت خۆی دەبینێتەوە کە دەڵێت سەرجەم لە کۆی کەرتەکان گەورەترە و تەنانەت جۆر و دەرکەوتنی کەرتەکان دیاری دەکات. ئەم یەکێتی و سەرجەمێتییە بۆ هایدێگەر بریتییە لە تێگەی "زۆرگە" (Sorge).

بەڵام گەرەکە لەم حاڵەتەشدا ڕێ لە بەهەڵەتێگەیشتن بگرین. مەبەستی هایدێگەر لە زۆرگە بریتی نییە لە نارەحەتی (Besorgnis)، خەمخۆری (Kümmernis)، تێکشکاوی/داماوی (Niedergeschlagenheit)، ئەوجا لەم

زۆرگەیەوە خۆزگەخواستن (Wünschen) و ویستن (Wollen) سەرهەڵبدەن – ئەمانە تایبەتمەندیی نۆنتین (ئەمپیرین -و)، بە پێچەوانەوە هایدێگەر لە مەغزایەکی نۆنتۆلۆژی-بناغەیی دەربوونگەراییدا تێگەی زۆرگە دیاری دەکات، واتا مەبەستی ئەو بوونی دازاینە کە لە فۆرمولێکی سیانەتیی ئاڵۆزدا پێناسەی دەکات وەك: "خۆ-سەرەتا (پرۆژە) هەر-هەبێت-لە (جیهاندا) {فرێدراوی} وەك بوون-لەلا (ی بوونەوەری نێوجیهانییانە پێگەییو) {بەربوونەوە}".

ئەم تێگەیەی زۆرگە کە سەرەتا سەیر دەنوێنێت، هێندە نوێ نییە. خودی هایدێگەر ئامازە بۆ فابلی کورا (Cura) دەدات کە کارل بورداخ لە نووسینەکەیدا بە ناونیشانی 'فاوست و زۆرگە' ([12]) لێیدەدوێت، کە هەروەها یۆهان ڤۆلفگانگ گوێتە لە بەشی دووەمی 'فاوست'دا کاری تێدا کرد، بەڵام خودی فابلەکە دەگەڕێتەوە بۆ دووسەدوبیستەمین فابلی هیگینیوس کە هەروەها یۆهان گۆتفرید هێردەر پشتی پێدەبەستێت.

فابلەکە ئەمەیە:

"جارێك 'زۆرگە' بەسەر روبارێکدا دەڕۆیشت و زەمینی قوڕینی بینی، بە مەبەستەوە تۆپەڵێکی لێهەڵگرت و دەستی کرد بە فۆرماندنی. کاتێك بیری لەوە کردەوە کە داخۆ چیی دروست کردبێت، یوپیتەر هات بۆ لای. 'زۆرگە' تکای لێکرد کە گیان بکات بە بەری ئەو پارچە قوڕە

---

[12]) لە گۆڤاری ( Deutsche Vierteljahresschrift für Literaturwissenschaft und Geistesgeschichte, I) بلاوی کردۆتەوە.

فۆرمێنراوەدا، یوپیتەریش بە شادییەوە خواستەکەی ئەوی بەجێگەیاند. بەڵام دوای ئەوە کە 'زۆرگە' ویستی ناوی خۆی لە دروستکراوەکەی بنێت، یوپیتەر رێی پێنەدا و داوای لێکرد ناوی خۆی لێبنێت. 'زۆرگە' و یوپیتەر کەوتنە شەڕ لەسەر ناونان لەو دروستکراوە، لەو کاتەدا زەمین (Tellus) راستبۆوە و ئەویش داوای کرد کە ناوی خۆی لەو دروستکراوە بنرێت، چونکە پارچەکی لە لەشی خۆی پێداوە. بەم چەشنە شەڕکەران ناچار بوون ساتورن بکەن بە دادوەر، ئەویش وا دیارە ئەم بڕیارە بەدادەی پێڕاگەیاندن: 'تۆ ئەی یوپیتەر، لەبەر ئەوەی گیانت بەبەردا کردووە، ئەوا پێویستە لەکاتی مردنیدا گیان وەربگریت، تۆ ئەی زەمین، لەبەر ئەوەی لەشت پێشکەش کردووە، ئەوا پێویستە لەش وەربگریت. بەڵام لەبەر ئەوەی 'زۆرگە' سەرەتا ئەم بوونەوەرەی دروستکردووە، ئەوا گەرەکە هەتا ئەو کاتەی لە ژیاندایە، 'زۆرگە' خاوەنی بێت، ئەوجا لەبەر ئەوەی سەبارەت بەو ناوە ناتەبایی هەیە، ئەوا با ناوبنرێت 'هۆمۆ'، چونکە لە هومموس (ئەرد) دروستکراوە'' ([13]).

زۆرگە، لەو شێوەیەدا کە هایدێگەر رافەی چیرۆکەکە دەکات، پەیوەست بە پێکهاتە ناسراوەکەی مرۆڤەوە وەك لەش و دەروون یان ئەرد و هۆش سەرهەڵدەدات. سەرچاوەی بوونی مرۆڤ لە زۆرگەدایە و هەتا لە ژیاندا بێت، لە لایەن ئەم سەرچاوەیەوە رادەگیرێت و لەژێر رکێفیدا دەبێت. بەم پێیە لە-جیهان-بوون لە رووی بوونەوە شەقڵی زۆرگەی وەرگرتووە. گەرچی بوونەوەری مرۆڤیی بە رەچاوکردنی ئەو شتە (واتا هومموس) ناوی لێنرا کە ئەو لێیپێکهاتووە، بەڵام ئەم دروستکراوە لە سەرەتاوە ئەك

[13]) Heidegger, Martin, Sein und Zeit, S. 198.

تەنیا بەندە بە رابەرە ئەستێرەی زۆرگەوە، بەڵکو هەروەها بەندە بە رابەرە ئەستێرەی ساتورنەوە، واتا بەندە بە کاتەوە، بەمەش فابلەکە هاوکات ئاماژە بۆ کاتێتیی گۆڕانەکانی نێو جیهان دەدات.

ئێمە لە رووی مێژووییەوە، پێش فابلی کورا، تێگەی زۆرگە وەك دیاریکەری بوونی مرۆڤ، لە دیالۆگی "ئەلکیبیادێس، 1"ی پلاتۆندا دەبینین. سەرەتا گەرەکە لەم پەیوەندییەدا ئاماژە بۆ ئەوە بدەین، کە هەتا ئەمڕۆ ساغنەبۆتەوە، کە داخۆ ئەم نووسینە هینی خودی پلاتۆن بێت یان کەسێکی دیکە نووسیبێتی، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەم دیالۆگە لە مەغزایەکی پلاتۆنیدا نووسراوە. لەم دیالۆگەدا بوونی مرۆڤ وەك بەتەنگەوەبوون-ی-خودی-خۆ و خەماوی-بۆ-خودی-خۆ، وەك زۆرگە بۆ خودی خۆ، پێناسە دەکرێت، ئەوجا بیر لە چەندین شیمانەی جیاواز دەکرێتەوە، کە داخۆ نۆبژێکتی زۆرگە چی بێت، داخۆ شتێك بێت کە سەر بە موڵکی دەرەکییە، داخۆ لەش یان دەروونی خۆ بێت، یان داخۆ لە کۆتاییدا ناخ، واتا خود (Self/das Selbst)، بێت. بەڵام ئەم بیرلێکردنەوەیە لەنێو دانوستاندنێکدا روودەدات کە ئاڕاستەیەکی لە دەرەوە رووەو ناوەوە وەرگرتووە: سەرەتا زۆرگە وەك مشوور بۆ موڵکی دەرەکیی دادەنرێت، وەك مشوور بۆ ئەو شتە کە لە فراوانترین واتادا هینی کەسێکە، بۆ نموونە پۆشاك، پێڵاو، ئەوجا وەك سومعەی دەرەکی یان بێڕێزی لای کەسانی دی، هەروەها وەك زۆرگە بۆ لەشی خۆ، پاشان بۆ دەروون و لە کۆتاییدا بۆ قووڵترین ناوکی دەروون. لەم روانگەیەوە هایدێگەر، بەئاگا یان بێئاگا، خۆی سەرلەنوێ لەنێو کۆنتێکستێکی راڤەکردندا دەبینێتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەنتیکە.

لەم فۆرموله سەیرەی زۆرگەدا: "خۆ-سەرەتا-هەر-هەبێت-لە (جیهاندا) وەك بوون-لەلا (ی بوونەوەری نێوجیهانییانە پێگەیيو)"، تاکە ساتەکان کە پێشتر وەسفکران، یەکخراون: دازاین هەمیشە لەنێو جیهاندایە، بەڵام لەنێو جیهانێکی تایبەتیدایە و بەرێی رەچەڵەك و زایین، پەروەردە و پێگەیاندنی فێرگەیی، زمان و کۆمەڵگەیەکەوە، شەقڵی پێدراوە؛ دازاین بریتییە لە فاکتیسیتیٚ، لە فرێدراوی (Geworfenheit)، بەڵام کاتێك ئەو لە لایەکی دیکەوە بونیادی پرۆژە لە خۆ دەگرێت، ئەوا خۆی روونکردنەوەی مەغزا و تێگەیشتنی شیمانەکانیەتی؛ سێیەم، ئەو وەك بەربۆوەیی (Verfallenheit) لە لای بوونەوەری لەنێو جیهان پێگەییودا دەردەکەوێت و دەبێت خۆی بەناچاری لەو بوونەوەرە رابپسکێنێت.

بەڵام ئیختیارکردن، بڕیاردان بۆ دازاینی خۆیی یان ناخۆیی، پێوەرێکی گەرەکە. لێرەدا پرسیار ئەوەیە کە داخۆ ئەم پێوەرە لە کوێوە بێت، یان: ئایا لە کوێوە دازاین دەزانێت کە ئەو گەرەکە چی بکات و خۆیەتییەکەی لە چیدایە؟ ئایا پێوەرێك هەیە کە ئەم خۆیەتییە پیشانی دازاین بدات؟ هایدیگەر ئەم پێوەرە لە دەنگی ویژداندا دەبینێت. دازاین لە دەنگی ویژداندا بانگی خۆی دەکات کە لە "مرۆ"ـەوە، لە دازاینی ناخۆییەوە، ببێت بە خۆییترین توانینی بوون. بەڵام لەم حاڵەتەشدا پێویستە رێ لە بەهەڵەتێگەیشتن بگرین. بانگی ویژدان نە هاوشێوەی دەنگی خودایە، نە لە خزمەتی بەدیهێنانی نۆرمێك و ئیدیالێتیی بەگشتی چواندووی دەربووندایە. بانگی ویژدان دازاین ناخاتە بەردەم رێکخراوێکی بەهاییانەی مێتافیزیکی و بەو رێکخراوە بەهاییە بپێورێت. لەم روانگەیەوە بەو بانگە هیچ شتێکی تایبەتی ناخرێتە بەردەم دازاین، بۆ

نموونە وەك "تۆ گەرەكە ئەمە و ئەمە بكەیت، بەڵام ئەوە نەكەیت!".
بەڵام گەر هیچ شتێكی تایبەتی نەدرێت بە گوێی دازایندا، ئەوا پێویست دەكات بپرسین كە داخۆ شتێكی ناتایبەتی بە گوێی ئەودا بدرێت. نەخێر ئەمیش روونادات. بانگی ویژدان دازاین دەخاتە بەردەم خودی خۆی، بەردەم فرێدراوییەكەی، فاكتیسێتییەكەی، دوایەكێتییەكەی.

بانگی ویژدان لە دازاین دەگەیەنێت كە ئەو گوناهبارە. بەڵام مەبەستی هایدێگەر لێرەدا نە گوناهباربوونێكی چالاكە و نە وازهێنانێكی پاسیڤە لە چاكە، هەروەها گوناهی رەچەڵەكیی مرۆڤیش نییە كە تیۆلۆژی لێیدەدوێت ([14])، بەڵكو تەنیا نەبوون (nothingness/Nichtigkcit) ی كرۆكیانەی دازاینە، ئەم نەبوونەش بریتییە لە دوایەكێتیی ئەو. بەڵام مرۆ بەرێی ئیختیاردنی خۆیەوە بە خۆی دەگات و بناغەی خۆبوونی دەرێژێت، لێرەشدا ئەم بناغەیە لە مەغزایەكی جووتەنیدا وەك ناتەواو/ نوقسان (nichtig) دەردەكەوێت: یەكەم، ئیختیاركردنەكە وەك ئیختیاركردنی هەڵدراو/بەردراو (geworfen) بەندە بە هەر شیمانەیەكی هەبووی دەستگیركراوەوە لەنێو دۆخدا و شیمانەكان هەرگیز بەتەواوی شیاوی كۆنترۆلكردن نین – ئەمە لە بنەرِەتدا كرۆكی كارەكتەری فرێدراوییە؛ بەڵام، دووەم، ئیختیاركردنەكە هەمیشە و لە هەموو جێیەك وەك ناتەواو دەردەكەوێت، چونكە ریالیزەكردنی هەردەم بریاردانە بۆ شیمانەیەكی تایبەتی، لێرەشدا شیمانەگەلی دیكە كە هەڵنابژێررێن، وەلاوەدەنرێن.

---

[14]) مەبەست لە گوناهباربوونی مرۆڤایەتیی بەهۆی خواردنی سێوەكەوە لە لایەن ئادەم و حەوا (ك.ج.).

ئەم شرۆڤانە کە هەتا ئێستا ئەنجامماندان، پیشانی دەدەن کە تێگەیشتنی فەلسەفەیی دەربوون نزیکە لە پێشبینییە ئایینی و تیۆلۆژییەکان. ئەم نزیکییە نەك تەنیا بەوەدا دەردەکەوێت کە هایدێگەر دازاینی مرۆڤ وەك زۆرگە دیاری دەکات و بەمەش لە خەمی خۆ بۆ رزگاربوونی (خلاص) ئەبەدی دەدوێت، بەڵکو ئاشکراتریش لەمە ئەوەیە کە هایدێگەر لە ویژدان و گوناه دەدوێت و بەمەش تێگەی تایبەتیی کریستیانی بەکاردەهێنێت، بێگومان بەتایبەتی بە شێوەیەکی پابەندکراو بە کۆنتێکستی کریستیانییەوە. بەڵام پێویستە لەم پەیوەندییەدا ئاماژە بۆ ئەوە بدەین، کە هایدێگەر سەرجەمی ئەم تێگانە لە ریشە مێتافیزیکی-تیۆلۆژییەکەیان دەکاتەوە و واتایەکی ناخەکییانەی پەتییان پێدەدات. زۆرگە بۆ خەڵاسی دەروون دەبێت بە زۆرگەی دیاریکەری دەربوونی مرۆڤ، گوناه یان تاوانی رەچەڵەکیی وەك رووداوێکی یەکجارەی مێژوویی یان وەك بنەمایەکی تیۆلۆژیانە دەبێت بە گوناهباربوون وەك بنەمایەکی دەربوونیانەی مرۆڤ، ویژدان وەك بانگی خودا دەبێت بە بانگی دەربوون کە بانگکردنی خودی خۆیەتی. ئەم وەرگۆڕینانە سەرەنجامێکی ئەوتۆیان خستەوە کە هایدێگەر ناوبنرێت "تیۆلۆژێکی کریستیانیی مورتەد" ([15]). ئەوەی راستی بێت، گەر تەنانەت خودی هایدێگەر هەمیشە لەنوێوە جەخت لەوە بکات کە ئەو تەواو بە شێوەیەکی دەربوونگەرایی لە تێگەکانی تێدەگات، ئەوا ئەم جەختکردنەی هێشتا هەر ئەو هەقیقەتە ناشارێتەوە کە لەتەك بەرەوپێشچوونی نووسینەکەدا بەردەوام پابەندییە

---

[15]) بڕوانە:
W. Stegmüller: Hauptströmungen der Gegenwartsphilosophie. Eine kritische Einleitung, Bd. 1, 6. Auflage. Stuttgart 1978, S. 156.

تیۆلۆژییەکان پەرەدەسێنن و قووڵتر دەبنەوە. ئاخر نزیکەی نەشیاوە لە شرۆڤەیەکی دەربوونگەرایی پەتییەوە ئەو هەموو تێگانە ببڕێنەوە کە تایبەتیشن بە تیۆلۆژی.

## 6- دازاین وەك بوون رووەو مەرگ (Sein zum Tode)

لە روانگەی هایدێگەر دوایەکێتیی دازاین پێکهاتەی ئەو دیاری دەکات. بەلاّم نابێت ئێمە لەم تێڕوانینەی هایدێگەر سەبارەت بە کۆتایی دازاین ئاوها تێبگەین کە هەروەك مەرگ بە دازاینەوە هەڵواسرابێت یان لە لەناوچوونی ئەو بەرپرسیار بێت، جا ئەمە کوژاندنەوەی هێڵێکی ژیان بێت یان لەکارکەوتن بێت لە مەغزای کۆتاییهاتنی کارایيە بیۆلۆژی و فیزیۆلۆژییەکاندا. ئەم دیاریکردنانە، یان دیاریکردنی پزیشکیانەی هاوشێوەیان، وەك دەرئەنجام دەستگیرکراون و مەرگ لە رووی دەربوونگەراییەوە پێشمەرجیانە.

ئەو کۆتاییە کە بە وشەی مەرگ دەردەبڕرێت، بۆ دازاین واتای تەواو-بوون ناگەیەنێت، بەڵکو بوونێکە رووەو کۆتایی، ئەمەش لەو مەغزایەدا کە دازاین هەمیشە دوا هەقیقەتی خۆی کە کۆتاییەتی، لە خۆ گرتووە، بۆیە دازاین خۆی هەمیشە پەیوەندییەکە بە مەرگەوە، ئەو خۆی هەمیشە

پێشبینییەکی پێشیانیی مەرگە، ئەمەش مۆرکی مرۆڤە: تەنیا مرۆڤ دەمرێت، بەڵام ئاژەڵ بە پێچەوانەوە کۆتایی پێدێت (verendet).

بەڵام ئایا چۆن ئەم پەیوەندییەی دازاین بە مەرگەوە پێشبینی بکەین؟ سەرەتا گەرەکە لەم حاڵەتەشدا رێ لە بەهەڵەتێگەیشتن بگرین. بوون رووەو مەرگ، یان هەنگاونان رووەو مەرگ، بریتی نییە لە چاوەڕوانیی مەرگ یان هێنانی مەرگ لە مەغزای بەدیهێنانی شیمانەکانی خۆدا کە خۆکوشتنە، هەروەها بریتی نییە لە خەریکبوونی بەردەوام بە مەرگەوە یان بیرکردنەوە لێی (وەك چۆن لە چەرخی ئاڤێندا دەگۆترا: "بزانە کە تۆ بمریت!")، هەروەها ئەوەش نییە کە جارێك سارتر گۆتی: مرۆڤ گەرەکە لە چاوەڕوانیی مەرگدا مەغزای ژیان بە خۆی بدات. مەبەست لە بوون رووەو مەرگ هەنگاونانە رووەو خۆییترین شیمانەی دازاین خۆی، هەنگاونانیش شێوازێکی ئاشکراکردن یان نزیککەوتنەوەیەکی لێتێگەییوە کە مەرگ دەناسێت وەك "خۆییترین شیمانەی دازاین، بێگومان شیمانەیەکی جەخت و یەکلاکەرەوەی دازاین. وەك ئەمەش شیمانەیەکە کە دیارینەکراوە و نەشیاوی بۆڕدانەوەیە" ([16]). ئەم ئاسینە لە خۆئاوەلاکردن و خۆئاوەلاهێشتنەوەدا بۆ ئەو کۆتاییە روو دەدات کە هەمیشە هەڕەشە لە دازاین دەکات. ئەمە لە دۆخی سامدا دەردەکەوێت. مسۆگەریی مەرگ وەك مەترسییەکی نەشیاوی خۆلێلادان لەسەر بناغەی تێگەیشتنێك دەردەکەوێت کە لە لایەن سامەوە دیاریکراوە و گەرەکە

[16]) Heidegger, Martin: Sein und Zeit (1927), 18. Auflage. Tübingen 2001, S. 258f.

بەرگەی بگیرێت. هەر بۆیە دروشمەکەی هایدێگەر دەڵێت: "غیرەتت بۆ سام هەبێت".

## 7- کاتێتی وەك مەغزای زۆرگە

ئێمە لە سەرەوە بینیمان کە هایدێگەر پێناسەی دازاین دەکات وەك زۆرگە بۆ خودی خۆ، کێشەی دازاین بەردەوام بوونی خۆیەتی، واتا ئەو لە بەردەم ئەلتەرناتیڤدایە: ئەو پرۆژەی خودی خۆی یان رووەو خۆییترین شیمانەکانی یان رووەو شیمانەی ناخۆیەتی پابەند بە "مرۆ"ـەوە بەگەڕ دەخات. پرۆژە بۆ خۆیەتی لە لایەك هەنگاونانە رووەو مەرگ، بەمەش هەنگاونانە رووەو ئاینده، بەم شێوەیەش کاتەکیانە ساتی ئاینده لە خۆ دەگرێت و هایدێگەر بە تێگەی "خۆ-سەرەتا-هەبێت" (Sich-vorweg-Sein)ی دازاین وەسفی دەکات، بەڵام دازاین لە لایەکی دی دەبینێت کە ئەو بۆ دەربوونە داکەوتییەکەی فڕێدراوە، واتا بۆ نێو ئەوە فڕێدراوە کە ئەو لە پێش خۆیدا دەیبینێتەوە و هەروەها چۆن ئەو لە پێش خۆیدا دەیبینێتەوە. لەم مەغزایەدا هەموو یەکێك لە ئێمە بۆ نێو جەستەیەکی تایبەتیی بیۆلۆژییانە، بۆ نێو پێکهاتەیەکی هۆشەکی، بۆ نێو زمانێك و کولتوورێك و هتد فڕێدراوە و دیاریکردنیان لە توانای ئەودا نییە، بۆیە دازاین ئێستا رابوردوویش دەهێنێتە نێوانەوە. هایدێگەر بۆ واژەی رابوردوو واژەی "هەبوویی" (Gewesenheit) بەکاردەهێنێت. ئەوجا لەبەر ئەوەی "لێرەکە" (das Da) ی هەنووکەیی خۆی لەنێو ئەم پرۆژە

پێشیانییەدا بۆ ئاینده و هەروەها لە گەڕانەوەدا رووەو "هەبوویی" دەبینێتەوە، ئەوا مەغزای کاتەکیی ئەم دازاینە بەڕێی یەکێتیی سێ رەهەندەکەی (یان سێ ئێکستازەکەی / Ekstase) ئاینده و هەبوویی و هەنووکەوە دیاری دەکرێت.

هایدێگەر بەم جۆرە دیاریکردنەی بوونی مرۆڤ وەك کاتێتی (Zeitlichkeit)، لە ریشەوە مێتافیزیکی ترادیسیۆنی دەهیچێنێت. ئاخر ئەم ترادیسیۆنە مرۆڤی سەربەخۆ لە کات و مێژوو و لەوەش کە شیاوی دۆخگۆڕییە، دیاری دەکرد: لەنێو ئەزەلییەتی سەرمەدیدا، لەنێو کرۆکدا بە ناوکێکی کەسییەوە دای دەنا، جا ئەم ناوکە دەروون بووبێت، بوونەوەری هۆشەکی یان ناوەزدار بووبێت. بەڵام ئەو جۆرە تێڕوانینە مێتافیزیکییە نەیدەتوانی دوایەکێتی و کاتێتی بە شێوەیەکی گونجاو بنرخێنێت، چونکە ئۆبژێکتیانە (موچوعی) لە ژیان تێدەگەیشت: ژیان کە وەك هەبوویەك (Vorhandenes) لە کاتێکی بناغەییدا رەت دەبوو؛ یان سەبژێکتیانە (ژاتی) لێی تێدەگەیشت وەك زنجیرەیەك مونایەشەی بهات و برۆ، مونایەشەیەك کە سەری ریزەکەی بە زایین سەرچاوەی دەگرت و بە مەرگ کۆتایی دەهات. مەرجی ئەم جۆرە تێگەیشتنە بریتی بوو لە تێگەیشتنێکی پنتییانەی (نوقتەیی) کات بە ئاڕاستەیەکی سەهمئاساوە. لەم جۆرە تێڕوانینە مێتافیزیکییەدا دازاین تەنیا لە پنت-کاتێکی هەنووکەییدا هەقیقی بوو و ئەوجا وەك ناهەقیقی لە سەرجەم ئەوانی دی، لە زایین و مەرگ، دابڕاو بوو. بەڵام کارەکتەری ئێکستازییانەی ئاینده و هەبوویی و هەنووکە، کە تێڕوانینی دازاین لای هایدێگەر وەك "خۆ-سەرەتا-هەبێت"، وەك هەنگاونان رووەو مەرگ،

هەروەها وەك گەڕانەوە بۆ لای خودی خۆ، داوای دەكات، لەنێو ئەو تێڕوانینە مێتافیزیكییەدا جێی نابێتەوە. ئەدگاری ئێكستازیی كات لەنێو ئێستا-زنجیرەی بێسەرەتا و بێكۆتاییدا، واتا لەو شێوەیەدا كە چۆن ئێمە لە كاتی باوی جیهانی تێدەگەین و لە زانستە سروشتییەكاندا بەكاری دەهێنین، بزر بووە. لەنێو كاتی بە ئۆبژێكت كراودا (واتا كاتی بێدوایەكی و هۆمۆگێن و بەردەوام)، رابوردوو و ئامادە و ئاینده بریتین لە كەرتی بەردەوامییەك، بەڵام بە پێچەوانەوە لەنێو تێڕوانینی دەربوونگەراییدا بریتین لە رەهەندی یان ئێكستازی روداوی پرۆژە. هەڵە نابێت گەر ئێمە سێ رەهەندەكەی كات لە روانگەی تیۆریی گێشتالتەوە وەسف بكەین، گەر ئێمە تێڕوانینی دوایەكیانەی دازاین تەنانەت لە پاشخانی تیۆریی گێشتالتەوە ببینین. تیۆریی گێشتالت لە كۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا شكۆفەی كرد. لێرەدا دەتوانین ناوی زانایانی وەك كریستیان فۆن ئێرنفێلز، فریدریش زاندەر، هانز فۆلكەلت، ئارۆن گورڤیچ، بهێنین ([17]). دەرچەی ئەم زانایانە هەمیشە بریتی بوو لە سەرجەمی كەرتەكان، لێرەشدا جەختیان دەكرد كە سەرجەمێتی و یەكایەتی، سەرکۆیی یان پتر-لە-کۆ-یەك، باڵادەستن. سەرجەم زۆرترە لە كۆی كەرتەكان، بەڵێ تەنانەت كەرتەكان بەندن بە سەرجەمەوە. ئەم تێڕوانینە هەروەها هەبوویی و ئامادە و ئاینده دەگرێتەوە، كە بە ڕیز

---

[17]) Vgl. Ch. Von Ehrensfels: Gestaltqualitäten, in: Vierteljahresschrift für wissenschaftliche Philosophie, Bd. 14 (1890), S. 249-292; F. Sander und H. Volkelt: Ganzheitspsychologie. Grundlagen, Ergebnisse, Anwendungen. Gesammelte Abhandlungen, München 1962, 2. Aufl. 1967; A. Gurwitsch: Phänomen gie der Thematik und des reinen Ich. Studien über Beziehungen von Gestalttheorie und Phänomenologie, in: Psychologische Forschung, Bd. 12 (1929), S. 279-381.

بەدووی یەکدا نایەن، بەڵکو پێکەوە هەن. ئاینده درەنگتر نییە لە هەبوویی و ئەمیش زووتر نییە لە ئاینده. هایدێگەر پەیوەست بەمەوە دەبێژێت:

"کاتێتی خۆی سەرجەمیانە لە هەر ئێکستازێکدا بەکاتدەکات (zeitigt)، ئەمە بەواتای، سەرجەمێتیی سەرجەمە بونیادی دەربوون و فاکتیسیتیّ و شکستهێنان (سەرنەگرتن — و) خۆی لەنێو یەکێتیی ئێکستازییانەی هەر بەکاتکردنێکی تەواوی کاتێتیدا دەبینێتەوە، ئەمەش بریتییە لە یەکێتیی بونیادی زۆرگە.

بەکاتکردن (Zeitigung) بریتی نییە لە بەدوویکداهاتنی ئێسکتازەکان. ئایینده درەنگتر نییە لە هەبوویی و ئەمیش زووتر نییە لە ئامادە. کاتێتی خۆی وەك ئاییندەی هەبوویی-ئامادەیی بەکاتدەکات" ([18]).

ئەم نموونەیەی خوارەوە پیشانی دەدات کە ئایینده و هەبوویی لە دەرەوەی دازاین نین، بەڵکو ساتی دازاینن، هەروەها پیشانی دەدات کە دازاین ئاینده و هەبوویی خۆیەتی، ئەویش کاتێك ئەو هەر جارە بە شێوازێکی تایبەتی هەیە: گەر دازاین لە حاڵەتی خەمباری، داهێزراوی و خەمۆکیدا بگەڕێتەوە بۆ هەبوویی-بوونی (Gewesensein) خۆی و هاوکات ئاینده بکوژێنێتەوە، ئەوا ئەم ئاییندەیە درەنگتر نییە لە هەبووییبوونەکە، بەڵکو یەکسەر لە بنەڕەتەوە پێکەوە لەتەك ئەودا دراوە. یان گەر دازاین هەڵاتبێت و خۆی لەنێو هەبووییدا مەڵاسدابێت،

---

[18]) Heidegger, Martin: Sein und Zeit (1927), 18. Auflage. Tübingen 2001, S. 350.

ئەوسا ئایینده دەچێته دۆخی بێهیواییەوە و سەرباری ئەمە هێشتا هەر لەتەك ئەودا لەگۆڕێدایە، دراوە. هاوشێوەی ئەمە دەتوانین نموونەی شێوازە هسترییاییەکانی رەفتار بهێنینەوە؛ گەر دازاین بخزێتە نێو پرۆژەی ئەندێشەیی ئایندەوە و نکۆڵی لە هەبوویی خۆی بکات، یان لە هەبوویی خۆی رابکات، ئەوا ئەو هەبوونییە نکۆڵیلێکراوە هێشتا هەر ئامادەیە، بەڵی بەتایبەتی لە هەڵاتندا ئامادەیە، یان بە واتایەکی دیکە ببێژین؛ دازاین وەك هەڵاتن بریتییە لە هەبووییبوونی نکۆڵیلێکراو.

لێرەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە دازاینی کاتەکیانەی ناخۆیی و خۆیی چ واتایەك بۆ هایدێگەر دەگەیەنن. ئاینده لە جۆری بەکاتکردنی ناخۆییدا ئامادە نییە وەك شیمانەیەکی بەرچاوی دەربوون، بەڵکو تەنیا نۆبژێکتی فزوولیەتە. فزوولیەت دەیەوێت ئاینده ببینێت و مونایەشەی بکات. بە هەمان شێوە رووکردنە هەبوویی بریتی نییە لە هێنانێك بۆ نێو دەربوون، بەڵکو لەیادکردنێکە. هەروەها هەنووکەیی‌بوونێکی ناخۆیی تەنیا بزربوونێکی بێورە و پەرتەوازە و ڤاڵبووە لەنێو ساتدا (مۆمێنتاندا). بەڵام بە پێچەوانەی ئەمەوە سێ ئێکستازەکەی کاتێتی لەنێو جۆری خۆیی بەکاتکردندا روون و ئاشکران (ئێڤیدێنتن)؛ دازاین ئایندەییە لەنێو هەنگاونانی بەورەدا رووەو مەرگ، دازاین هەروەها هەبووییە، ئەویش کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ دەربوونە ڤاکتییەکەی، بۆ فڕێدراوی و هەبوویییەکەی، بەڵام ئەو هەروەها هەنووکەییە، ئەویش کاتێك سەرجەمی ئەمە بە هەنووکەیی لەنێو دۆخی ساتییانەی ئێرەدا (des Da) روو دەدات. بێگومان سات بریتی نییە لە ئێستا-پنت (نوڤتە) و تێیدا شتێك روو بدات، هەروەها بە هیچ شێوەیەك پنتە ئەبستراکتەکەی

ماتماتیك نییە وەك سنوور لە نێوان بەردەوامیدا، بەڵكو بریتییە لە ئامادەییە خۆییەكەی دازاین. با ئەم كێشەیە بە زمانە ئاڵۆز و تاریكەكەی هایدێگەر دەرببڕین:

"تەنیا بوونەوەرێك كە گرۆكیانە لە بوونی خۆیدا ئایندەییە، بە چەشنێك كە ئەو شكستخواردوو لە بەردەم مەرگی خۆیدا ئازادانە ڕێدەدات بۆ لێرە داكەوتییەكەی فڕێبدرێتەوە، واتا تەنیا ئەو بوونەوەرە كە وەك ئایندەیی هاوكات لە بنەڕەتەوە بەگرۆكبووە (*gewesend* ist)، ئیتر ئەو، كاتێك خۆی داوەتە دەست شیمانەی موئایەشەكراو، دەتوانێت فڕێدراوییەكەی خۆی قبووڵبكات و ساتەكی بێت بۆ 'كاتی خۆی'" ([19]).

ئەم كاتێتییە كە هایدێگەر جەختی لێدەكات، هاوكات هەوڵێكی ئەوە بۆ بناغەڕشتنی مێژوویێتی (Geschichtlichkeit)ی دازاین. بەڵام دەبێت لەم حاڵەتەشدا ئاماژە بۆ ئەوە بدەین كە مەبەستی هایدێگەر لە مێژوویێتی ئەوە نییە كە هەروەك مرۆڤ پەیوەندییەكی مێژوویی لەتەك ئۆبژێكتان و مرۆڤانی دیكەدا هەبێت، ئیتر هەروەك مرۆڤ لەنێو زنجیرەی موئایەشەدا دیاریكرابێت و ئەویش لە لایەنی خۆیەوە شتانی دی دیاری بكات، نەخێر، مێژوویێتی بریتییە لە پێكهاتەی پێشیانیی-دەربوونییانەی دازاین و زەمینەیەكە بۆ مێژووی ئۆبژێكتییانەی جیهان.

لەم كۆنتێكستەدا كێشەیەكی دی دێتە ئاراوە: سەرچاوەی ئەو شیمانانە كە لەنێو دۆخدا ئاشكرا كراون، ئەوجا دازاین دەتوانێت پەیوەست پێیانەوە هەڵوێست وەربگرێت و خۆی بۆیان هەڵبدات (werfen) و بكات بە پرۆژە.

---

[19]) A.a.O., S. 385.

وەلامی ئەم کێشەیە بەم چەشنەیە: شیمانەکان لە "بۆماوەیی"یەوە دێن، ئەوان شیمانەی بۆماوەن و هایدێگەر ناویان دەنێت "چارەنووس" (Schicksal)، بەلام پەیوەند بە ئەوانیدیەوە ناویان دەنێت "قەدەر" (Geschick)[20]. بێگومان نابێت ئاوها تێبگەین کە هەروەك ئەم شیمانانە بەسەر دازایندا سەپێنرابن، یان بریتی بن لە فرمان بۆ دووبارەکردنەوەی رابوردوو، نەخێر، دازاین پێویستە هەلوێستێکی رەخنەیی بەرانبەر شیمانە هەبوویەکانی دەربوون وەربگرێت بۆ ئەوەی رێ لە کاریگەرییان لەسەر ئەمرۆ بگرێت یان هیچ نەبێت کاریگەرییان کەمبکاتەوە.

ئێستا دوای ئەم روونکردنەوانە دەتوانین تێروانینە بناغەییەکانی فەلسەفەی دەربوونی هایدێگەر بەم چەشنە پوخت بکەینەوە:

1) بە دابرین لە شتە هەبووەکان، مرۆڤ وەك بوونەوەرێك دیاریدەکرێت کە کێشەکەی تەنیا بوونی خۆیەتی.
2) هەرخۆمییێتی (Jemeinigkeit)، یان گەرانەوە بۆ هەر تاکە دەربوونێك، بریتییە لە بەدەرکردن و هیچاندنی هەموو

---

[20] ) هەردوو وشەکە بە کوردی یان بە ئەرەبی واتای قەدەر دەگەیەنن، بەلام وشەی "Schicksal" لە رووی کەسییەوە (persönlich) واتای چارەنوسیش دەگەیەنێ. وەك دەبینین، هایدێگەر جیاوازیی شیمانەک ، رووی کەسی و نێوکەسییەوە دەکات، لەبەر ئەم هۆیە بۆ حالەتەکەی یەکەم واژەی چارەنووسمان دانا — ك.ج.

هەوڵە فیزیکی-کۆسمۆلۆژی و بیۆلۆژییەکان، تیۆلۆژی و ترانسێندێنتاڵ-فەلسەفەییەکان، کە سەرجەمێتی چێدەکەن و مرۆڤ لەنێو سروشت و گەردوون، ئایین و تیۆلۆژیدا دادەنێن. گەڕانەوەکە لە بنەڕەتدا گەڕانەوەیەکی ستراتیژییە بۆ تەنیایی دەربوون.

3) ئەو شێوازە تایبەتیە کە تێیدا جیهان ئاشکرا دەکرێت، بریتی نییە لە تێگەیشتنی تیۆرییانە، وەك چۆن لە فەلسەفەی ترادیسیۆنی و زانستەکاندا دەبینرێت، بەڵکو بریتییە لە "میزاج"ی پێشتیۆرییانە، لە میزاجمەندی، لێرەشدا ئەوە سامە/هەیبەتە کە رۆڵێکی سەنترالی دەگێڕێت، چونکە سام کارەکتەری راستەقینەی جیهان، واتا مەترسی/بێلانەیی (Unheimlichkeit) ئاشکرا دەکات. بەڵام هەتا ئەو کاتە کە ئاشنایەتیی رۆژانەی مرۆڤ بە شتەکان سەروەر بێت، مەترسییەکە لەنێو ئەو ئاشنایەتییەدا شارراوەتەوە.

4) بەربوونەوە ئاماژەیەکە بۆ ئەوە کە مرۆڤ لە زۆرترین حاڵەتدا بەهەقیقی خودی خۆی نییە، بەڵکو بە شێوازی ئاخۆیی وەك "مرۆ" دەژی. مرۆڤ هەست دەکات، بیردەکاتەوە، کردار دەنوێنێت، چۆن ئەوانیدی هەست دەکەن، بیردەکەنەوە، کردار دەنوێنن. بەڵام بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بە خۆیەتیی دەربوون بگات، ئەوا پێویستی بە پەڕینەوەیەکی لەسەرخۆ نییە لە دۆخێکەوە بۆ نێو دۆخێکی دیکە، بەڵکو پێویستیی بە بازدانێك

یان بە وەرچەرخانێکی ریشەیی هەیە کە دەشێت بەراورد بکرێت بە دەروون لای پلاتۆن.

5) بانگی ویژدان وا دەکات کە مرۆڤ لە ناخۆیەتیی دازاینی رۆژانەی ئاسایی بەئاگا بێتەوە، ئەوجا دەیخاتە بەردەم ئەو ئەرکە کە ببێت بە خودی خۆی و هەروەها خودی خۆی بێت.

6) دوایەکێتی بریتییە لە دیاریکەری دەربوونی مرۆڤ؛ مرۆڤ بەهۆی رووداني مەرگ لە ئایندە و رووداني زایینەوە لە رابوردوودا، واتا بەهۆی رووداني فڕێدراوییەوە، لە دەربوونی خۆی بەئاگادێت.

7) مەبەست لە فڕێدراویی دەربوون ئەوەیە کە هەموو یەکێك بەبێ ئەوەی پرسی پێکرابێت و بەبێ ویستی خۆی لەنێو ئەم لەش و دەروونەی خۆیدا، لەنێو ئەم کولتوور و زەمانەدا، لەم شوێنە مێژووییەدا، لەم جێگەیەی ئێرە لەنێو گەردووندا، دانراوە و بۆ خودی خۆی جێهێڵراوە. هاوکات هەنگاونان رووەو مەرگ ئەو واتایە دەگەیەنێت کە هەموو یەکێك شیمانەیەکی هەیە بۆ ئەوەی لەو سنوورە ناخەکییە تێبگات کە دوایەکێتیی ئەوی دیاری کردووە.

8) کاتێتی کە لە ئێکستازەکانی هەبوویی و ئامادە و ئاییندە پێکدێت، بریتییە لە مۆرکی کۆکەرەوەی دازاینی دوایەکی، ساتەکانیش (مۆمێنتەکانیش) هاوکاتن یان پێکەوە لە هاوسەرچاوەوە هەن. ئەم ساتانە شێوەیەکی دوایەکییانەی کات دروست دەکەن.

9) به تێگەی کاتێتی، مێژوویەتیی مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی چەندپاتکەرەوە ناشکرادەکرێت، واتا بوونەوەرێك کە تەنیا گەر ناخەکیانە دەست بەسەر بۆماوەییە مێژووییەکەی خۆیدا بگرێت، ئەوسا دەتوانێت بە شیمانەکانی دەربوونی خۆی بگات – بێگومان هاوکات زۆر دەشێت پێیان نەگات.

ئێمە دەتوانین ببینین کە ئەم ساتانە پەیوەندییان هەیە بە ڕێبازە فەلسەفەییەکانی دیکەی کات و نزیکن لێیان، بەڵام هێشتا هەر جیاوازن لێیان. هەندێکی ئەو ڕێبازە فەلسەفەییانە بریتین لە:

1) فەلسەفەی ژیان-ی ڤیلهێلم دیلتی. لەم فەلسەفەیەدا هێشتا هەر هزرۆکەی دانانی دەربوونی مرۆڤ لەنێو سەرجەم گەردووندا سەروەرە، ئەم هزرۆکەیەش لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ پانتاییزم. لەم شێوازەی هزریندا گریمانە دەکرێت کە تاکەکەس لەنێو سەرچاوەیەکی گشتگیردا گونجاوە. بێگومان لەم فەلسەفەیەدا دەدرکێنرێت کە گۆڕانی تەواوەتی و هەنگێوەری تێگەکانمان ناگونجێت بە لێشاوی بەردەوامی ژیان، بەڵام سەرباری ئەم هەقیقەتە دەرفەرت دەڕەخسێنرێت بۆ ئەوەی کردەکێتی هەتا رادەی شیان دیاری بکرێت. بە پێچەوانەوە لە فەلسەفەی دەربوونی هایدیگەردا بێداڵدەیی و تەنیایی خود (Self/Selbst)، تاکەکەسێتیی نەشیاوی هەڵگرتن و هەرخۆمییێتی، پێشینەییە.

2) نیهیلیزم، بۆ نموونە نیهیلیزمی شۆپنهاوەر. شۆپنهاوەر، پابەند بە ڕێبازی بودیستییەوە، مەرگ بە هیچ/نابوون دادەنێت، یان وەك توانەوە لە نیرڤانادا کە دوانامانجە و تێیدا ژیانی

ڕەمەکییانەی سەرزەمین بەگوێرەی کوژانەوەی لەسەرخۆی ویست بۆ دازاین نامێنێت، بە پێچەوانەوە مەرگ بۆ هایدێگەر هیچە لەنێو جەرگەی دازایندا، مەرگ ئەوەیە کە مرۆڤ بۆ چالاکبوون دەبزوێنێت. بۆیە لای هایدێگەر هیچ پەیوەندییەك بە ڕۆمانتیکی مەرگەوە نییە.

3) میستیك. مرۆڤ لە قووڵبوونەوەی میستیکیدا بۆ نێو ناخ دەکەوێتە سۆراخی یەك‌بوونی دەروون لەتەك خودادا و دەیبینێتەوە، بە پێچەوانەوە میزاجی بناغەیی دەربوونگەرایی بریتی نییە لە هەستی ئاشتییەکی ڕەها، بەڵکو هەستی وازلێهێنراوییەکی بەردەوامە.

4) پێرسۆنالیزمی ماکس شێلەر. لە نێوان تێڕوانینی هایدێگەر و شێلەردا جیاوازی هەیە: هۆش لای شێلەر ئەو فۆرمە کرۆکییەی مونایەشەی دەروونە کە جیاوازە لە کایەی ڕەمەکی زیندەوەر، ئەوە هۆشە کە دەرووبەك ڕووەو جیهانی کرۆکەکان ئاوەڵا دەکات، بەڵام هایدێگەر بە پێچەوانەوە وایدادەنێت کە هۆش گرێدراوە بە دۆخە جەستەییەکانی سام و وەڕسی، گوناه و مەرگەوە ... هتد.

سەرچاوە:

Karen Gloy: Grundlagen der Gegenwartsphilosophie. Paderborn 2006

# مارتین هایدێگەر

ڤیللێم ڤان رایین

## 1- 'بوون و کات'. ئایا مەغزای بوون چییە؟

### ڕەوتی مێژوویی

سەرکەوتنی مەزنی 'بوون و کات' یەکسەر دوای بڵاوبوونەوەی لەساڵی 1927دا ئەو هەقیقەتەی شاردەوە کە 'بوون و کات' مێژوویەکی درێژخایەنی هەیە. هایدێگەر خۆی دەبێژێت، کە لە 1907 بەدواوە لێکۆڵینەوەی دکتۆراکەی فرانتس برێنتانۆ بەناونیشانی 'لەبارەی واتای هەمەلایەنیی بوونەوەر لەلای ئەرِیستۆتێلیس' کاریکردۆتە سەر هزری ئەو. وەك هایدێگەر دەبێژێت، ئاخافتن سەبارەت بە واتای هەمەلایەنیی بوونەوەر لای برێنتانۆ، بەبێ شیمانەی خۆلێلادان دەمانبات بۆ پرسیار لەبارەی "واتای بناغە ی رابەریکەر"، یان بە وشەگەلی دیکە ببێژین، دەمانبات بۆ پرسیار لەبارەی: "ئایا بوون چییە؟". بەڵام هەروەها 'توێژینەوە لۆگیکییەکان'ی ئێدموند هوسەرل و نووسینەکەی کارل برایگ بەناونیشانی 'لەبارەی بوون. روانینێکی پوخت لە ئۆنتۆلۆژی'

(1896)، فۆرم بە هزری هایدێگەری لاو دەدەن. بۆ ئەو هاوکات ئیشەکانی ئێمیل لاسك (1875-1915) کە فێرخوازێکی ریکەرت و هوسەرل بوو، بە ناونیشانی 'لۆگیکی فەلسەفە و تیۆریی کاتیگۆرییەکان' (1911) و 'تیۆریی بڕیار' (1912)، بەبایەخ بوون. هەروەها "ناجەختی" لە 'توێژینەوە لۆگیکییەکان'ی (1900/01) هوسەرلدا بابەتێك بوو کە هایدێگەری بە خۆیەوە خەریك کرد؛ هوسەرل لە لایەك لە بەندی یەکەمی 'توێژینەوە لۆگیکییەکان'دا هەوڵ دەدات پیشانی بدات کە پسیکۆلۆژی بناغەیەك نییە بۆ تێگەیشتن لە هزرین و ناسین، بەڵام لە لایەکی دیکەوە لە بەندی دووەمدا، کاتێك بینای مەتریفە روونەکاتەوە، لە کرداری ئاگاییەوە دەردەچێت.

جگە لەمە ئەریستۆتێلیس واتای بۆ هایدێگەر پەیدا کرد. هایدێگەر پایزی 1922 لێکۆڵینەوەیەکی بەم ناونیشانە نووسی: 'راڤەی فێنۆمێنۆلۆژیانەی ئەریستۆتێلیس (پیشاندانی دۆخی هێرمینیۆتیکی)'. ئەم لێکۆڵینەوەیە پیشانی دەدات کە هایدێگەر چەند بەچڕی کاری لە هزری ئەریستۆتێلیسدا کردووە. ئەم ئیشە کە ناوی راپۆرتی ناترۆپی لێنراوە، گەرەك بوو پشتیوانیی هایدێگەر بکات بۆ دامەزراندن لە ماربورگ و گۆێتینگن، چونکە ئەو دوای نووسینی هابیلیتاسیۆنەکەی هیچ نووسینێکی دیکەی بڵاونەکردبۆوە. لەپاڵ پەیوەندییەکانی فەلسەفەی ئەریستۆتێلیسدا بە ژیانی رۆژانەوە، کە بۆ هایدێگەر رێنومایيکەر بوون، پێویستە دوو پنتی دیکە دیاری بکەین کە هایدێگەریان بە خۆیانەوە خەریك کردبوو: یەکەم ئەریستۆتێلیس گۆڕانی دابوو بە هەرەمی جۆرەکانی زانین و لە لوتکەیدا "یەکەم فەلسەفە" خۆی دەبینییەوە،

هەروەها گریمانەی "بزوێنەری نەبزۆك". هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا هەوڵ دەدات لەم کۆنتێکستەوە بەرگری لەو گریمانەیە بکات کە وایدادەنێت فەلسەفە بناغەی زانینی تاکە زانستەکانە. تەنیا فەلسەفە دەتوانێت پیشانی بدات کە بۆچی مەئریفەکانی زانستەکان بەهەقیقی راستن، فەلسەفە کریتێرەکان دەخاتە بەردەم و ئێمەش بە یاریدەیان دەتوانین لەنێوان راستی و ناڕاستیی بڕیارەکانماندا جیاوازی بکەین.

دووەم پنت ئەو جیاوازییە دەگرێتەوە کە ئەرِیستۆتێلیس لەنێوان 'فرۆنێزیس' و 'سۆفییا'دا کردبووی. ئێمە دەتوانین لە فرۆنێزیس زانینی پراکتیکی تێبگەین، واتا ئەو زانینە کە روو دەکاتە بوونەوەر، لێرەشدا نەك تەنیا روو دەکاتە ئەوە کە لە رووی پراکتیکییەوە بەبایەخە، بەڵکو، لە مەغزایەکی پڕکرۆکی ئێتیکییانەدا، روو دەکاتە "ژیانی چاك" وەك سەرجەم. بەڵام 'سۆفییا' بە پێچەوانەوە زانینی ئەوەیە کە بەدەرە لە هەموو دۆخگۆڕییەك (واتا: بوون). ئەم زانینە کە باڵاترە، نەك تەنیا لە 'فرۆنێزیس' جیاکراوەتەوە، بەڵکو رابەریشی دەکات، کەواتە 'فرۆنێزیس' لە لایەنی خۆیەوە بەشداری لە 'سۆفییا'دا دەکات. ئەرِیستۆتێلیس لە کۆتاییدا جەخت دەکات کە تەنیا نەبزۆك یان ئەزەلێتی بابەتی گونجاوە بۆ 'سۆفییا'، بۆ 'نووس' یان بۆ 'تێگەیشتنی ناوەزمەندانە' (das Vernehmen). خودی ئەم تێگەیشتنە ناوەزمەندە، یان، لە پەرەسەندنی خۆپەرچیودا (selbstreflexiv)، لە تێگەیشتنی ناوەزمەندانەی تێگەیشتندا ('نۆئێزیس نۆئێزیوس')، نەبزۆکە، بەڵام هەموو شتێکی دی دەبزوێنێت. هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا بەم چەشنە لە بوون تێدەگات: بوون خۆبزوێنەر نییە، بەڵام پابەند بە

ئەرِیستۆتێلیسەوە جەخت دەکات کە بوون "تەواو ترانسسێندێنتە" و سەرەرای ئەمە نەگۆڕ نییە. پێشتر لێرە هەڵوەشاندنەوەی (دێ(کۆن)ستروکسیۆنی) ریشەیی ئەرِیستۆتێلیس و تەنانەت هەڵوەشاندنەوەی دەستپێکردنەکەی خودی خۆی لە 'بوون و کات'دا کە بە "وەرچەرخان" (die Kehre) ئەنجامی دەدات، دەردەکەوێت. ئاخر زانینی رۆژانە، زانینی پراکتیکی (کەواتە نەك تەنیا 'سۆفیا') و مامەڵەکردن لەنەك شتەکانی رۆژانەدا، خۆپەرچیون. هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا دەبێژێت، کێشەی دازاین پرسیارە لەبارەی بوون، کێشەی ئەو مەغزای بوونە – بەمەش دازاین پرسیار لەبارەی بوونی خۆی دەکات. مەرجی ئەم پرسیارکردنە ئەوەیە کە دازاین لەنێو میزاجەکانی (Stimmung) رۆژانەدا (کە بێگومان نابێت پسیکۆلۆژییانە لێیان تێبگەین) وەك "میزاج-مەندی" (Gestimmt-sein) رووی کردۆتە بوون، هەروەها لە پەرچاندنی رۆژانەدا تێگەیشتنێکی روونەکراوەی – تێگەیشتنێکی پێشئۆنتۆلۆژییانەی – بوونی هەیە. هایدێگەر دوای 1934، بە "وەرچەرخان"، بوون وەك خۆپەرچیو دەکات بە تەوەرەیەك، ئەمە بێگومان لەو مەغزایەدا کە ئەو ئێستا بە واتای وشە وەك شۆڕشی بەردەوام، وەك چوونی بەردەوامی تەوەرەکانی بوون و هیچ بۆ نێو یەکتری، لە بوون دەهزرێت، بەڵام بوون و هیچ بە مەرجێك دەبن بە یەکتری، گەر ئێستا لە بوونەوەری رۆژانەوە پرسیار سەبارەت بە بوون نەکرێت، بەڵکو لە خودی زاینەوە (لە بوونەوە - Sein) کە هایدێگەر وەك (زاین - Seyn) دەینووسێت، پرسیار لەبارەی زاین (Seyn) بکرێت.

هایدێگەر جگە لەوە ویستی پیشانی بدات کە تیۆلۆژیی کریستیانی بەندە بە فەلسەفەی ئەریستۆتێلیسەوە، یان بە رافەی چەرخی‌نافینانەی فەلسەفەی ئەریستۆتێلیسەوە. گەر فەلسەفە بییەوێت سەربەخۆ لە ئیمانی کریستیانی هەڵوێستێکی خۆیی وەربگرێت، ئەوسا ناچارە ماڵئاوایی لەم تیۆلۆژییە و لە رافەی کریستیانیانەی ئەریستۆتێلیس بکات، یان با ئەمە بە زمانی 'بوون و کات' دەربڕین: ناچارە هەردووکیان "هەڵبووەشێنێتەوە" و هاوکات سەرلەنوێ بینایان بکاتەوە. هایدێگەر هیچ گومانێکی سەبارەت بەوە نەهێشتەوە کە 'بوون و کات' دەیەوێت لە تێگەیشتنی مەغزای بووندا سەرجەم توخمە کریستیانییەکان لەکار بخات، ئەم کارەش بە دیدی ئەو هیچی دیکە نییە جگە لە "دەستهەڵبڕین دژی خودا". بەڵام هایدێگەر نایەوێت ئێمە لەم کارە ئاتێیزمێك لە مەغزای تراديسیۆنیدا تێبگەین. ئەوە کە لێرە و لە 'بوون و کات'دا لە مەترسیدایە، خۆی لەوبەر دژبەرییەکەی نێوان تێیزم و ئاتێیزمەوە دەبینێتەوە.

بەڵام پێویستە لەم لێهزرینە رێبەرییەدا تێبینییەکی کورت سەبارەت بەم پرسیارە بدەین: "ئایا، لە دەرەوەی سەرجەم ئەوە کە لە سەرەوە گۆترا، چی لە هایدێگەر دەمێنێتەوە؟". ئێمە تەنیا بە وەڵامێکی دابەشێنراو دەتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە.

جیهانی زانستەکان هەتا ئەمڕۆ بە ئیشی هەمەلایەنی سەبارەت بە پرسیارەکانی رافەی 'بوون و کات'، سەبارەت بە "هایدێگەر و پێشسۆکراتییەکان، هایدێگەر و ئەریستۆتێلیس و هتد"، خزمەتی گۆفار و

دەزگاکانی پەخشی کتێب دەکات. 'ڕێنومای تێگەیشتن لە هایدێگەر' شرۆڤەی ئیشەکانی پتر لە سیی فەیلەسوفی بەواتا دەکات لە رووی پەیوەندییان بە هایدێگەرەوە. بێگومان لەنێو ئەم فەیلەسوفانەدا لایەنگر و دژبەری سەخت هەن. بەلام لە رووی ئۆبژێکتییەوە هەموو لایەك لەوەدا کۆکن کە هایدێگەر کاریگەریی لەسەر هێرمینیۆتیك هەیە، ئەمەش لەو شێوەیەدا کە گادامەر گۆڕانی پێدا و ئەمڕۆش پەیوەند بە فێنۆمێنۆلۆژییەوە درێژەی پێدەدرێت.

هەروەها پێشتر لە رووی واتای سیستەماتیکییانەی ئیشەکەی هایدێگەرەوە بینیمان کە هزرۆکەی هەڵوەشاندنەوە (دێـ(کۆن)ستروکسیۆن) لە ناوچەی زمانی فەرەنسیدا زۆر سەرکەوتوو بوو.

ئەوجا پرسیارێکی دی روو دەکاتە هایدێگەری ئەنتی-فەیلەسوف.

هایدێگەر، هاوشێوەی ڤیتگنشتاین و نیتچە، هەوڵ دەدات پەیوەندیی خۆی بە ترادیسیۆنی فەلسەفەوە بپچڕێنێت، بەلام سەرەڕای ئەم هەوڵەی وەك بەشێکی ئەو ترادیسیۆنە دەمێنێتەوە. ئێمە ناتوانین هێندە زوو ببێژین کە داخۆ لەو خۆپچڕاندنە کەللەڕەقەی هایدێگەر لە راسیۆنالێتیی کلاسیکی، چی بمێنێتەوە. بەلام واتای قۆناغییانەی 'بوون و کات'، هەروەها ئەو هەموو بابەتە کە هایدێگەر لە دانوستاندنی پڕناکۆکیدا لێیاندوا، لەوانە زمان، هونەر، تێگەیشتن، مێژوو، پەیوەندیی مەتریفە و ژینجیهان، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ناگامەندیی فەلسەفەیی بۆ سەرجەم ئیشەکەی ئەو مسۆگەر دەکەن.

## بوون و کات

ئەمە، لە دەستپێکدا، پرۆگرامی 'بوون و کات'ـە. بەڵام هایدێگەر ئەم پرۆگرامەی هەڵوەشاندنەوە نەك تەنیا بەسەر ترادیسیۆندا، بەڵکو بە هەمان شێوە بەسەر هزری خۆیدا بەکاردەهێنێت، ئەمەش هۆیەکە بۆ ئەوە کە بۆچی هایدێگەر نەیتوانی درێژە بە نووسینی بەشی دووەمی 'بوون و کات' بدات. ئاخر نەشیاوە هەڵوەشاندنەوە لە فۆرمی لێکۆڵینەوەدا، لە فۆرمی ئاخافتنی ئیستیدلالیدا (دیسکورزیڤدا)، ئەنجام بدرێت. ئەوجا لە کۆتاییدا گەرەکە بزانین، ئەوە توندڕەویی سەرەتاگرییە هزرییەکەی هایدێگەر نییە کە هەمیشە لەنوێوە ئاسۆی نوێ ئاوەڵا دەکات و بەردەوام تێڕوانینە سەرەتاییەکانی ئەو وەردەچەرخێنێت، کە نیتر هەر وەك لە سەرەنجامدا هزری ئەو ببێت بە سووڕمێنەرێکی وەك خۆ ماوە، نەخێر.

نەك تەنیا ئەریستۆتێلیس، بەڵکو هەروەها پێشسۆکراتییەکانی وەك پارمێنیدێس، هێراکلیتێس و ئاناکسیماندەر، واتا بۆ پرۆژەکەی هایدێگەر وەردەگرن. بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە هەتا چەند هزری هایدێگەر

مێژووییە – بێگومان مێژوویی (geschichtlich) نەك هیستۆریانە (historisch). هیستۆری بۆ هایدێگەر بریتییە لە فۆرمی داوەشاوی مێژوو (Geschichte)؛ هیستۆری گرنگی بە تۆماری زانیاریەکان، بە قۆناغ و گرێبەست و دراوگەلی دیکە دەدات، بەڵام مێژوویی بە پێچەوانەوە واتای ئەو شتە دەگەیەنێت کە پارمەتیمان دەدات چ لە سەرەتاکانمان و چ لە ئایندەمانەوە لە دۆخی ئەمڕۆمان تێبگەین. بۆیە هایدێگەر فەلسەفەی پێشسۆکراتییەکان وەك ئەو سەرەتایانە دەبینێت کە نەك تەنیا لە پشتمانەوەن، بەڵکو هەروەها لە پێشمانەوەن. ئیتر لێرە بازنەکە دادەخرێت. هایدێگەر، لە پاشخانی سەرجەم بێخەوشیی مێژوویی و فیلۆلۆژییەوە کە لە توێژینەوەی مێژووی فەلسەفەدا هەیە، دەبێژێت: تاکە پرسیارێکی گرنگ لە فەلسەفەدا پرسیارە لەبارەی بوون، بێگومان پرسیارێك کە هەرگیز نەکراوە. ئەو درەنگتر ئەرگومێنت دەهێنێتەوە، کە پێشسۆکراتییەکان ئەزموونی پرسیارەکەیان لەبارەی بوون کردووە، بەڵام هەرگیز ئەو پرسیارەیان ئەهزراندووە، ئەوجا بەدووی ئەوەدا پلاتۆن و ئەرِیستۆتێلیس پرسیارەکەیان لەیادچۆتەوە. پاشان تیۆلۆژیی کریستیانی لە چەرخی ناڤیندا فەلسەفەی ئەرِیستۆتێلی وەردەگرێت و بەو وەرگرتنە بەتەواوی پرسیارەکە لەبارەی بوون لە هزری ئێمە دووردەخاتەوە. هایدێگەر دەبێژێت: ئێمە لەیادمانچۆتەوە کە ئێمە پرسیارمان لەبارەی بوون لەیادچۆتەوە.

هایدێگەر لەدژی ئەم لەیادچوونەوە جووتەنییە هەڵوێست وەردەگرێت: بە 'بوون و کات' دەگەڕێتەوە بەرەو پرسیارە سەرچاوەییەکە لەبارەی بوون. بەڵام ئەم پرسیارە تەنیا کاتێك بە شێوەیەکی سەرگرتوو دەکرێت،

گەر ئێمە لەدژی دۆڕاندنی هزرین لە جیهانی دەوروبەری رۆژانەمان و پەیوەندیی پراکتیکیمان پێوەی، پرسیاری بناغەیی لەبارەی دازاین و بوون بکەین. هایدێگەر ئەمە ناودەنێت ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی کە روو لە دوو جۆری کێشە دەکات:

1) پیشان بدرێت کە دازاین، لە ئاڕاستەوەرگرتنی پراکتیکیانەیدا (نەك لە بەرپرسیاریی تیۆریانەیدا)، بناغەی پرسیارە لەبارەی بوون.

2) بسەلێنرێت کە دازاین لەم پرسیارەدا شێوازی خۆپەرچیویی پیادەدەکات - ئەو تەنیا رووەدەکاتەوە خودی خۆی. ئاڕاستەوەرگرتنی پراکتیکی خۆیشی لە سەرەتاوە پێشئۆنتۆلۆژیانەیە، لێرەشدا گەردکە ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی ئەو زانستە بێت کە بناغە بە سەرجەم زانستەکانی دیکە بدات.

بەڵام گرنگ ئەوەیە لە کێشەیەك بەئاگابین: هایدێگەر بە واژەی بناغە (Grund) رووناکاتە شتێکی سرەوتوو، شتێکی وەك بناغە دانراو، بەڵکو رووەدەکاتە شتێك کە بەردەوام لە بزووتندایە، واتا ئێمە دەبێت لە کاتەوە لە دازاین تێبگەین – دازاین وەك بابەتی ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی. ئەو ناونیشانە کە لەژێریدا ئەمە پیشان دەدرێت، بریتییە لە 'بوون' و 'کات'، بەمەش هایدێگەر داواکارییەکی شۆڕشگێڕ بەرزدەکاتەوە. ئاخر لە ترادیسیۆنی ئۆنتۆلۆژیدا وا دادەنرا کە تەنیا نەگۆڕ، تەنیا بوونی هەمیشە وەك خۆ ماوە، بابەتی رەهای بالاترین هزرینە.

کات بە دیدی هایدێگەر بناغە بە بوون و بەمەش بە مەغزای بوون دەدات. بەڵام پێویستە بۆ تێگەیشتن لە بوون بزانین کە بوون بە هیچەوە / نابوونەوە بەستراوە و نەشیاوە لێی جیاببێتەوە، بەڵێ هیچ بوونی تەنیوە. شیمانە و ریالێتیی نا-بوون لە کرۆکەوە دازاینی ئێمە دیاریدەکەن. مەرگ ئەو شیمانەیەی نا-بوونە کە هەموو چرکەیەك ئامادەیە. بێگومان داکەوت لەو مەغزایەدا نا-بوونە، کە ئێمە دەزانین ماوەیەکی درێژخایەن پێش زایینمان نەبووین و کاتێکی درێژخایەنیش دێتە ئاراوە کە تێیدا ئێمە چیدی لێرە نابین. ئێمە هەروەها دەتوانین ببێژین، ئێمە لەنێو هیچدا راگیراوین، ئەمەش لەو شێوەیەدا کە چۆن هیچ ئێمە دەتەنێت. یان با کەمتر سۆزمەندانە بدوێین: دازاین تەواو کاتەکییە. مەغزای بوون لەوەدایە کە ئێمە بەردەوام "ئەویدی" رووەو بوون، واتا هیچ، لەنێو ئامادەدا رابگرین – ئێمە تەنیا کاتێك خۆیین (eigentlich)، گەر ئێمە بریتی بین لە بوون-رووەو-مەرگ. بەڵام ئێمە نابێت لەمە گۆجبوون و وشکهەڵهاتن تێبگەین و پراکتیزەی بکەین، بە پێچەوانەوە، ئێمە دەبێت وەك ئەوپەڕی بزواوی لێیتێبگەین، ئەم بزواوییەش واتایەکی سۆزمەندی نییە (واتایەکی خۆش-میزاج)، بەڵکو بریتییە لە میزاجمەندی (Gestimmt-sein) لە شێوەی خۆپەرچاندنی بەردەوامدا، کە بۆ ئامادەیی شیمانە و ناشیمانەی (مەحاڵێتیی – و) بوون ئاوەڵامان دەکات.

ئاوەڵاهێشتنەوەی پرسیار لەبارەی بوون بەدیدێت وەك 'تێگەیشتن'ی فاکتیسیتێی دازاین. ئایا ئەمە چ واتایەك دەگەیەنێت؟ هایدێگەر بە واژەی "تێگەیشتن" لێهزرینەکانی خۆی دەخاتە پاڵ هێرمینیۆتیکی کلاسیکی.

ئەو دەمە هێرمینیۆتیکی فریدریش شلایەرماخەر لە بەردەم هایدێگەری فێرخوازی تیۆلۆژیدا بوو. ئەو هەروەها لەم هێرمینیۆتیکەوە فێربوو کە لە تێگەیشتنی مەغزادا روانگەی مێژوویی بەجیددی وەربگرێت. هایدێگەر هێرمینیۆتیکی کلاسیکیی لکاند بە داواکارییەکەی فێنۆمێنۆلۆژییەوە کە بریتی بوو لە "رووکردنە خودی شتەکان". "خودی شتەکان" کە لای هوسەرل بریتین لە ناوەرۆکی ئاگایی یان لە پێشبینیی شتەکانی رۆژانە، لای هایدێگەر وەك فاکتیسیتیێ دەردەکەون، واتا وەك شتی ژیانراو و موئایەشەکراو، بەکورتی: وەك ژیان. بێگومان هایدێگەر لەم حاڵەتە هەموو شێوە تێگەیشتنێکی بیۆلۆژییانە بەدوور دەگرێت، بەڵێ تەنانەت لەکاتی چالاکبوونی نازیانەیدا دەستبەرداری ئەم میانەگیرییە نابێت و ئەم هەڵوێستەش دەیپارێزێت لە قایلبوون بە ئەگەرە بیۆلۆژییە رەگەزگەرایییەکانی نازیەکان. هایدێگەر بۆ یەکەم جار لە موحازەرەیەکدا کە زەمێستەری هاوینەی ساڵی 1925 بەناونیشانی 'رێبەری بۆ مێژووی تێگەی کات' خوێندییەوە، لەبریی "ژیان"، "دازاین" دادەنێت و "دازاین" وەك لە-بزووتندا-بوون و فاکتیسیتیێ دیاری دەکات. کەواتە ئێمە دەتوانین هزری هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا ناوبنێین هێرمینیۆتیکی فێنۆمێنۆلۆژیانەی فاکتیسیتیێ، یان بەناونیشانی موحازەرەکەی زەمێستەری هاوینەی 1923 ناوی بنێین 'ئۆنتۆلۆژی. (هێرمینیۆتیکی فاکتیسیتیێ)'. بێگومان ئەم دیاریکردنە تەنیا چواندنی بۆ بەشە بڵاوکراوەکەی 'بوون و کات' هەیە. بەشی دووەم دەبوو هەڵوەشاندنەوەی (دێ(کۆن)ستروکسیۆنی) فەلسەفەی ترادیسیۆنی تەواو بکات. ئێمە دەتوانین ببێژین کە هایدێگەر ئەم هەڵوەشاندنەوەیەی کرد

به ئامانجی خۆی. ئێمە پێویستە هێرمینیۆتیکی فاکتیسیتیّ وەك ئامادەکارییەك بۆ ئەم مەبەستە شۆڕشگێڕییە تێبگەین.

ئایا مەسەلەکە لە حاڵەتی ئەم ئۆنتۆلۆژییەدا چییە؟ کێ پەرەگرافی (8)ی 'بوون و کات' بکاتەوە، نەك تەنیا دەبینێت کە لێرەدا مەسەلەکە روو لە چی دەکات، بەڵکو هەروەها دەبینێت، کە دەبوو روو لە چی بکات. ئەو کەسە بەتایبەتی دەبینێت، کە لە بەشی دووەمی پلانبۆدانراو هیچ بڵاونەکرایەوە و لە بەشی یەکەمیش لە کۆی سێ تەوەر تەنیا دوو تەوەر بڵاوکرانەوە. هایدێگەر رایگەیەندبوو کە تەوەری سێیەمی بەشی یەکەم کێشەی 'کات و بوون' لەخۆدەگرێت، بەڵام ئەو کاری تێدانەکرد و لەبریی ئەم تەوەرە، 'کێشە بناغەییەکانی فینۆمینۆلۆژی'ی دانا کە موحازەرەیەك بوو و زەمێستەری هاوینەی 1927 لە ماربورگ خوێندبوویەوە.

بەشی دووەم دەبوو سێ تەوەر لەخۆبگرێت و هایدێگەر نیازی وابوو لەو تەوەرانەدا خۆی بە کانت و دێکارت و ئەرِستۆتێلیسەوە خەریك بکات. بەڕوونی دیارە کە هایدێگەر دەیویست مێژووی فەلسەفە لە مۆدێرنەوە بەرەو پاش بباتەوە بۆ لای گریکەکان. تەوەری یەکەم دەبوو ناونیشانی 'کانت و کێشەی مێتافیزیك' هەڵبگرێت، کە هایدێگەر لە موحازەرەیەکی زەمێستەری زستانەی 1925/26دا گۆڕانی پێدا، پاشان لەکاتی دانوستاندنە بەناوبانگەکەیدا لەتەك ئێرنست کاسیرەر لە داڤۆز (1929) خوێندیەوە و هەمان ساڵ وەك ئیشێکی سەربەخۆ بڵاوکرایەوە. پەرەگرافەکانی 19 هەتا 21 ی 'بوون و کات' یەکەم ئاماژەیەك رووەو

تەوەری دووەم لە خۆ دەگرن. پێدەچێت تەوەری سێیەمی بەشی دووەم ئەو تێکستە بێت کە نووسینی "راڤەی فێنۆمێنۆلۆژیانەی ئەریستۆتێلیس" هەنگاوە سەرەتاییەکانی پێکدەهێنن.

کەواتە 'بوون و کات' ئیشێکی تەواونەکراو مایەوە. پێدەچێت لەبەر ئەمە بووبێت کە هایدێگەر لە نامەیەکدا بۆ ماکس کۆممەرێل (4ی ئۆگوست ی 1942) ئەم تاکە کتێبەکەی خۆی ناونا "شکستێك": کتێبەکە، وەك هایدێگەر دەنووسێت، "پێش هەنگاوە بەواتاکە دەپچڕێت". کەواتە هایدێگەر لەکاتی بڵاوکردنەوەیدا دەیزانی کە ئەو ناتوانێت پرۆژەکەی بەگوێرەی پلان ئەنجام بدات. پاشان "وەرچەرخان" (Kehre) ئاشکرای دەکات کە بۆچی پرۆژەی 'بوون و کات' بە تەواونەکراوی مایەوە. ئێمە دەتوانین بەپوختی ببێژین کە "وەرچەرخان" چی لە خۆ دەگرێت: ئەوە بەس نییە کە لە بوونەوەرەوە پرسیار لەبارەی بوون بکرێت. بەڵام ئەمە هەروەها ئەو واتایە دەگەیەنێت کە: ئەوە بەس نییە لە دازاینەوە پرسیار لەبارەی بوون بکرێت، وەك چۆن هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا دەیکات، بە پێچەوانەوە، مرۆ دەبێت لە زاینەوە / بوونەوە (Seyn) لەبارەی بوون (Sein) بپرسێت. بێگومان مەسەلەکە لێرەدا تەنیا گۆڕینێکی روانگەکە نییە، بەڵکو پرسیارکردن لە زاینەوە (Seyn) ئەو واتایە دەگەیەنێت کە لە کاتەوە پرسیار بکرێت – بەڵێ زۆرتریش لەمە: ئەو واتایە دەگەیەنێت کە لە جیاوازیی ئۆنتۆلۆژییەوە پرسیار بکرێت.

کەواتە هایدێگەر نەیتوانی فەلسەفەی کلاسیکی وەك بناغە وەربگرێت و لەسەری شۆڕشەکەی خۆی لەدژی لەیادچوونەوەی پرسیاری بوون

بگێڕێت. بێگومان ئەو مەبەستی بوو ڕەخنەیەکی شۆڕشگێڕ لە ترادیسیۆن بگرێت، بەڵام گەر ئەو ڕەخنەیەی بگرتایە، ئەوسا ڕەخنەکە کۆنسێپتگەل و شرۆڤەگەل و دارشتنی ئیستیدلالیی (دیسکورزیڤی) دەتەقاندەوە، وەك چۆن ئیشەکانی 'Beiträge zur Philosophie' و 'Besinnung' لە 1936 بەدواوە ئەوە دەردەخەن. هەروەها دیاریکردنی تێگەی "بوون" لە پەرەگرافەکانی سەرەتای 'بوون و کات'دا پیشانی دەدات کە هایدێگەر چەند زۆر هەر لە سەرەتاوە خۆی لەسەر ئەم ڕێگە شۆڕشگێڕییە دەبینییەوە. ئەو هەوڵی دەدا پیشانی بدات کە مرۆ ناتوانێت لەبارەی "بوون" بەو شێوەیە پرسیار بکات کە لەبارەی ئەدگاری شتەکان بەگوێرەی فۆرمە باوەکانی بڕیار دەیکات. گەر ئێمە ببێژین شتێك "هەیە" (ist)، ئەوا ئەمە ئاماژە بۆ واتایەك دەدات کە جیاوازە لە هەر مۆرکێك لە مەغزایەکی ئەمپیریدا، یان وەك هایدێگەر دەبێژێت، جیاوازە لە هەر مۆرکێك کە لە کایەی "ئۆنتی"دا بە شتەکان دەدرێت. بڕیاری "مێزەکە سەوزە"، بڕیارە لە کایەی ئۆنتیدا، ئەم بڕیارەش دەشێت دروست (صحیح) یان هەڵە بێت، بەڵام گۆتەی مێزەکە "هەیە"، بە تێڕوانینی هایدێگەر لە دووانەی دروست/ هەڵە تێپەڕ دەکات. "بوون" ڕاستیی (Wahrheit) گۆتەکە دەگرێتەوە. مەسەلەکە لێرەدا بریتییە لە ئۆنتۆلۆژێتی، واتا کێشەکە ڕوو دەکاتە شتێکی ترانسسێندێنت. ئاخر "بوون تەواو ترانسسێندێنتە".

## دازاین

ئەم ترانسسێندێنتە تەنیا لە لایەن بوونەوەرێکەوە شیاوی هزرینە کە پەیوەندییەکی لەتەك خۆیدا هەیە، بوونەوەرێك کە بە ئاڕاستەی خودی خۆی دەپەرچێنێت (دەهزرێت —و). ناوی ئەم بوونەوەرە دازاینە کە شرۆڤەکردنی بریتییە لە بابەتە سەرەکییەکەی 'بوون و کات'. بێگومان ئەم شرۆڤەکردنە واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە دازاین تەنیا خۆی کردووە بە بابەت نەك شتێکی دیکەی جیاواز لە خۆی، ئەو شرۆڤەی خۆی دەکات و تەنیا و بەردەوام لەنێو ئەم شرۆڤەکردنەدا دەربوونی خۆی پیادە دەکات (existiert).

کەواتە دازاین لای هایدێگەر ئەو سەبژێکتە نییە کە لە ترادیسیۆنی فەلسەفەدا بیریلێکراوەتەوە، نەخێر، مەبەستی هایدێگەر ڕوودەکاتە شیمانەی خۆپەرچاندن، بەڵام خۆپەرچاندنێك کە پرسیارلێکراو و پرسیارکراو و پرسیارکردن وەك یەکایەتییەك تێدەگات نەك لەنێو کاتیگۆریی (واتا بڕیاری) ئەبستراکت و گشتێنەردا بییانچەسپێنێت. ئێمە لەم جێ نێوەندییەدا بە پێشبینییەکی زۆر نائاسایی هایدێگەر دەگەین. هەتا ئێستا هیچ گومانێك لەوە نەدەکرا کە مرۆ دەبوو لە توێژینەوەی فەلسەفەیی و زانستیدا بەڕوونی جیاوازی بکات لەنێوان بابەت و مێتۆد و هیپۆتێزدا، بەڵام ئێستا هایدێگەر پێشنیارێکی سانا بۆ ئەوە دەکات، کە ئەم جۆرە تێگەیشتنە بناغەییە هەڵبووەشێنرێتەوە و لە جێگەیدا پەیوەندیی خۆپەرچیوی پرسیارکەر و پرسیارلێکردن و پرسیارکراو

دابنرێت، بەم پێشنیارەش تەحەدای ترادیسیۆنی فەلسەفە و بەمەش سەرجەم لۆگیك دەکات. ئەو تێکستانە کە تێیاندا "وەرچەرخان" دەردەکەوێت، پیشانی دەدەن کە چ مەترسیەیەك بەم پەیوەندییە خۆپەرچیوە شیاوی پێگەیشتنە، بەلام هاوکات پیشانی دەدەن کە مرۆ دەبێت لە پێناوی گەیشتندا بەو مەترسیانە چ هەقێك بدات. هایدێگەر لە موحازەرەی زەمێستەری هاوینەی 1927دا ('کێشە بناغەییەکانی فێنۆمێنۆلۆژی') بەرکولێکمان سەبارەت بەم کێشەیە پێدەدات. ئەو دەبێژێت: هۆی ئەوە کە لەیادچوونەوە "نەك تەنیا لەیادچووەوە، بەڵکو تەنانەت خودی لەیادچوونەوەی لەیاددەچێتەوە"، دەگەرێتەوە بۆ "کرۆکی ئێکستازیانەی لەیادچوونەوە" ([21]). رەخنەی هایدێگەر لە ترادیسیۆنی فەلسەفە ئەوەیە، کە ئەو ترادیسیۆنە لە لایەك بوون و لە لایەکی دی پرسیاری لەبارەی بوون کردووە بە بوونەوەرێك، بە ئۆبژێکتێك، بەمەش لە خۆپەرچاندنی دەرکێشاون و دازاینی بەشتکردووە/بەبابەتکردووە (hypostasiert).

کەواتە بوون، دازاین و پرسیار لەبارەی بوون، حاڵەتێکی تایبەتییان هەیە و دەتوانین لەم حاڵەتە مەغزای بوون تێبیگەین. "مەغزا بریتییە لە ئاراستەی (Das Woraufhin) پرۆژە کە بەرێی مەبەست و پێش-بینین (Vorsicht)[22] و دەستبۆبردنەوە (Vorgriff)[23] بونیادنراوە و لێوەی

[21]) Martin Heidegger: Gesamtausgabe 24. S. 411.

[22]) لە پێشگری (-Vor) و ناوی (Sicht) پێکدێت، بەلام ئەم وازەیەی (Vorsicht) هیچ پەیوەندییەکی نییە بە رەفتاری ئاگادار یان حەزەرمەندەوە، بەڵکو دەبێت بە واتای وشە وەربگیرێت. (ك.ج.)

شتێك وەك شتێك شیاوی تێگەیشتن دەبێت"([24]). شرۆڤەی دازاین و تێگەیشتن هەرگیز تەواو نابن، ئەوان بەردەوام ئەنجام دەدرێن. گەر هایدێگەر ئەمە ناوبنێت ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی، ئەوا نابێت لە مەغزای بناغەڕشتنی کلاسیکیدا لێی تێبگەین. "بناغە" شیمانەیە (کە لە روانگەی هایدێگەر بالاترە لە هەقیقەت) بۆ پرسیار لەبارەی مەغزای بوون. ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی هەروەها پیشانی دەدات کە ئەو ئۆنتۆلۆژییە خۆی دەتوانێت و دەبێت رێنومایی بەشە زانستییە جیاوازەکان (ئۆنتۆلۆژییە دەفەرییەکان) بکات. بەلام هایدێگەر دوای کۆتاییهێنان بە نووسینی 'بوون و کات' واز لەم داواکارییەی فەلسەفە دەهێنێت.

دازاین نەك تەنیا توانستی تێگەیشتنی هەیە، ئەو خۆی تەنیا وەك تێگەیشتن شیاوی تێگەیشتنە. بێگومان ئەمە واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە دازاین نەتوانێت ئەم جۆرەی بوون، کە لە راستیدا سەرچاوەییە، پشتگوێ بخات یان تەنانەت ئاگامەندانە بیهیچێنێت، بەلام گەر دازاین ئەم کارە بکات، ئەوسا جۆری بوونی خۆی لەیاددەچێتەوە، ئەوسا ئەو چیدی خودی خۆی نییە، بەڵکو بەربۆتەوە (verfallen). دازاین پێش هەموو شتێك ناوەلاییە بۆ بوون، کێشەی ئەو خودی بوونە. هایدێگەر لە سێ رووەوە ناوەلاییی دیاری دەکات: حالی هەستەکی (Befindlichkeit) و تێگەیشتن و قسە. حالی هەستەکی ئاماژەیە بۆ میزاجمەندی، بەلام میزاجمەندی رووی نەکراوەتە ئەم یان ئەو مونایەشەیە، بەڵکو رووی

---

[23]) لە پێشگری (-Vor) و ناوی (Griff) پێکدێت، واتا دەستبۆبردن، یان گرتن وەك هێنان (بۆ خۆ). (ك.ج.)

[24]) Martin Heidegger: Sein und Zeit, S. 151.

کراوەتە شیمانە بۆ ئەزموونکردنی سەرجەمێتیی دەربوونی خۆمان و جیهانی دەورمان. ئەو سەرەنجامە کە لە بەرانبەریەکدانانی "مونایەشە" (کە بۆ هایدێگەری زاهید وشەیەکە بۆ دێکادێنس) و ئەزموون دەکەوێتەوە، ئەوەیە کە ئێمە لێرە مەبەستمانە. ئەزموون وشەیەکی دیکەیە بۆ ئەو یەکایەتییە کە لەنێوان ناوەڵایی خۆپەرچیوی دازاین و بووندا هەیە. هایدێگەر ئەمە بە نموونەی وەڕسی (Langeweile) روووندەکاتەوە. ئێمە لە وەڕسیدا ڤێزمان لە ئەم یان لە ئەو نابێتەوە، بەڵکو لە سەرجەم.

دێکارت بە جیاکردنەوەی شتی کشاو (رێس ئێکستێنزا) و شتی هزریو (رێس کۆگیتانس) ترادیسیۆنێکی چەندسەدساڵیی هێنایەگۆڕێ، بەڵام هایدێگەر دەیەوێت بە هزری دازاین خۆی لەم جیابوونەوەیە بەدووربگرێت. دێکارت منی هزریوی وەك جەوهەر دیاری کرد و ناوی نا شتی هزریو (رێس کۆگیتانس). ئەم شتە هزریوە بەتەواوی لە دازاینی جەستەیی پەتی جیابۆتەوە و بۆیە ناشێت خاوەنی هیچ مۆرکێکی جەستەیی بێت، بەمەش لە سەرجەم شتە ئەستوورییەکان، کە لەنێو لەشدا وەك شتێکی کشاو سەرهەڵدەدەن، جیابۆتەوە، بەمەش ئەستووی پەتی، وەك شتی کشاو، بەتەواوی لە شتی هزریو جیابۆتەوە. هایدێگەر لە سەرەتای 'بوون و کات'ـەوە (پەرەگرافی 8-11) دژی پێشبینییەك دەوەستێتەوە کە بە بڕوای ئەو دەگەڕێتەوە بۆ دێکارت، پێشبینییەکەش ئەوەیە کە داوادەکرێت سەبژێکت وەك بناغەی یان تەنانەت وەك سەنتەری فەلسەفە دابنرێت. بەڵام بە دیدی هایدێگەر کێ بەم چەشنە بهزرێت، ئەو کەسە بە هیچ شێوەیەك بە پرسیاری بوون و دازاین ناگات،

چونکە ئەو ئۆنتییانە (بە شێوەیەکی ئەمپیری — و) دەهزرێت. بەم تێڕوانینەی هایدێگەر کێشەیەکی دی ڕووندەبێتەوە؛ ئەو وایدەبینێت کە لە ترادیسیۆنی فەلسەفەدا هەرگیز بەگونجاوی پرسیاری ڕاستی نەکراوە. لەم ترادیسیۆنەدا بنەمای لێوەدەرچوون (کە هەتا پارمێنیدێس بردەکات و پاشان لێی دەدوێین) بریتی بوو لە جیابوونەوەی هزر و بوون، جیابوونەوەیەك کە بێگومان وەك گریمانە دانرابوو و پاشان سکۆلایستەکان هەوڵیان دا بە گریمانەی یەکگرتنەوەیەکی هۆش/زانین لەتەك شتەکان/بووندا پێکەوەی بگونجێننەوە ( adaequatio intellectus ad rem).

هایدێگەر لەدژی ئەمە هزرێك دادەنێت کە نەك تەنیا ڕەچاوی جیاوازیی نێوان بوون و بوونەوەر دەکات (بوون بوونەوەر نییە)، بەڵکو ئەم جیاوازییە هاوکات وەك یەکایەتی / ئیدێنتیتیٚ دادەنێت، چونکە پرسیار لەبارەی بوون پرسیار نییە لەبارەی بوونەوەر — پرسیارەکە سەر بە بوونە، پرسیارکردنێکی بوونە ( genitivus objectivus / genitivus subjectivus). کەواتە ئەوە کە هایدێگەر ناوی دەنێت 'جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە' (Die ontologische Differenz)، بریتییە لە جیاوازیی بوون و بوونەوەر، بەڵام هاوکات بریتییە لە یەکایەتییان، بێگومان یەکایەتییەك کە هایدێگەر وەك بزۆك دایناوە. ئەم یەکایەتییە شیاوی دیاریکردن یان پێناسەکردن نییە، بەڵکو لە ئاسۆ دەچێت: گەر مرۆ هەوڵ بدات لێی نزیك بکەوێتەوە، ئەو دوور دەکەوێتەوە. لێرەشدا ئەوە کە بۆ بوون چواندنی هەیە، بۆ دازاینیش هەیەتی: "بێگومان دازاین لە ڕووی ئۆنتییەوە نەك تەنیا نزیکییە یان نزیکترینە، بەڵکو ئێمە تەنانەت خودی

ئەوین. سەرەڕای ئەمە یان لەبەر ئەم هۆیە ئەو لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە دوورترینە" ([25]). دووانەتیی دوورترین و نزیکترین، ئاشنا و نامۆ، بناغەیە بۆ ئەو شتە کە هایدێگەر وەك جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە دیاریی دەکات. هەموو هەوڵێك بۆ دیاریکردنی یان ئاشناکردنی تێگەییانەی ئەو جیاوازییە شکست دەهێنێت، چونکە ئەو هەوڵە هەمیشە تێگەییە. پاشان هایدێگەر بە شرۆڤەی کۆنکرێتی فێنۆمێنۆلۆژیانە پیشانی دەدات کە چۆن گەرەکە بە پێچەوانەی ترادیسیۆنەوە بیر لە رۆژانەیێتی بکرێتەوە.

## زۆرگە، کراوەیی، سام

ئەوە کە ئێمە لە پێش خۆماندا دەیبینینەوە و لێرەیە بەبێ ئەوەی رەچاوی بکەین یان بەکاریبهێنێن (ئەم چەکوشە کە لەملا یان لەولا کەوتووە)، هەروەها دەردەست، ئامراز (ئەم چەکوشە)، کە ئێمە لە ژێرزەمینەکە هێناومانە بۆ ئەوەی کاری پێبکەین، هەروا ئاسان لێرە نین، بەڵکو، وەك هایدێگەر دەبێژێت، هەمیشە بایەخمەندن (Bewandnis)؛ هەموو بابەتێك سەرنەزموونیانە (بە ئاپریۆری - و) لە پێشدەستییەکەی (Vorhandenheit) خۆی تێپەڕدەکات، چونکە ئێمە هەمیشە لە سەرەتاوە لە جیهانی دەورمان تێگەیشتووین. گەرچی دازاین هەمیشە "هەرخۆمییێتییە"، بەڵام ئەم تێگەیشتنە هێشتا هەر لە لایەن منێکی

---

[25]) Martin Heidegger: Sein und Zeit, S. 15.

دابڕاوی دێکارتییەوە ناهێنرێتە ئاراوە. دازاین "لە جەوهەرەوە لەتەکبوونە". بێگومان ئەم دیاریکردنە نۆنتی نییە، مەبەستی لەوە نییە کە گوایە مرۆڤانی دیکە هەن. گەر مەبەستی هایدێگەر ئەمە بووایە، ئەوسا دیاریکردنەکە بەڕاستی بێواتا دەبوو. نەخێر، ئەم دیاریکردنە بە پێچەوانەوە مەغزایەکی ئێکزیستێنسیال-ئۆنتۆلۆژیانەی هەیە: ئەشیاوە بەبێ ئەوانیدی بیر لە دازاین بکرێتەوە. تەنانەت لەو کاتەدا کە من بەتەنیام، ئەوا تەنیا لەبەر ئەو هۆیە کەسانی دی لەوێ نین، چونکە من لە کرۆکەوە "لەتەک-بوون"م. ئەوجا هایدێگەر پەیوەندیی ئێمە بە شتە بێگیانەکانەوە، بە پێشدەست و دەردەستەوە، وەك بەتەنگەوەبوون (Besorgen) دیاری دەکات، بەڵام پەیوەندی بە ئەوانیدییەوە وەك فیورزۆرگە (Fürsorge)، و دازاین وەك زۆرگە دیاری دەکات. واتای زۆرگە لای هایدێگەر ئەوە نییە کە ئێمە لە ژیانی رۆژانەدا لێیتێدەگەین، واتا وەك "هەبوونی خەم" یان مشوور، نەخێر، "زۆرگە" جۆر و شێوازی بوونی کاتەکیمان پیشان دەدات. پێش ئەوەی رووبکەینە ئەم دیاریکردنە تایبەتمەندە، پێویستە ببینین کە هایدێگەر بە روونکردنەوەکانی پێشدەست و دەردەست/حازردەست و لەتەکبوون، لە روانگەیەکی فەزاییەوە پێشبینیی دازاینی کردووە. مایەی سووڕمان نییە گەر لێرە کاریگەریی ئەو روونکردنەوانە ببینین کە کانت سەبارەت بە لێڕوانین (Anschauung) ئەنجامی داون، ئاخر هایدێگەرساڵی 1929 ئەم بابەتەی لە نووسینی 'کانت و کێشەی مێتافیزیك'دا (واتا، وەك هایدێگەر خۆی لە پێشگۆتندا بۆ چاپی یەکەم دەبێژێت، لە "یەکەم داڕشتنی بەشی دووەمی (بڵاونەکراوەی) 'بوون و کات'دا) بەفراوانی خستە بەر باس. کانت لە

'ڕەخنەی ئاوەزی پەتی'دا فەزا و کات وەك فۆرمی لێڕوانینی پەتی پێناسەدەکات. فەزا بریتییە لە فۆرمی لێڕوانینی دەرەکی، کات بریتییە لە فۆرمی لێڕوانینی ناخەکی.

لای هایدێگەر سەرەتا "لێرە"کە (das Da) لە حاڵەتی دازایندا ڕوودەکاتە لە-جیهان-بوون-ی فەزایی. ئاخافتن لەبارەی لە-جیهان-بوون یان لەبارەی لەنێو-بوون هەر لە سەرەتاوە ئەو ڕەهەندەی هەیە کە "لەنێو"ەکە تەنیا تۆپۆگرافیانە دیاری نەکرێت. دازاین لەنێو جیهاندا نییە هاوشێوەی سەموون لەنێو زەرفدا. دازاین پەیوەندییەکی پەرچیوی (ڕێفلەکسیڤی) بە جیهانەوە هەیە، واتا "لەنێو"ەکە لە فەزایێتی تێپەڕدەکات. "بەڵام دازاین 'لەنێو' جیهاندایە لە مەغزای مامەڵەی ئاشنا-بەتەنگەوەبوودا کە لەتەك بوونەوەری نێوجیهانییانە پێگەییودا دەیکات" ([26]). ئەم سیتاتە بە ئامازەوە بۆ بەتەنگەوەبوون پیشانی دەدات کە کات، وەك فۆرمی پەتیی لێڕوانین، بۆ هایدێگەر زۆر لە فەزا گرنگترە. کات بۆ ئەو، هەروەها بۆ کانت، بریتییە لە "فۆرمی سێنس ی ناخەکی"، واتا فۆرمی "ڕوانین لە خۆمان و لە دۆخی ناخەکیمان". بەڕاستی مەسەلەکە بۆ هایدێگەر بە چەشنێکە کە کات، وەك فۆرمی سێنس ی ناخەکی، نەك تەنیا بناغەییە بۆ ڕەهەندی فەزاییانەی ئەزموونکردن، بەڵکو هەروەها پێکهاتەیەکی بناغەیی مەئریفەیە بەتەواوی. کانت دەبێژێت: "کات پێشئەزموونیانە (بە ئاپریۆری – و) بریتییە لە مەرجی فۆرمالی سەرجەم دیاردەکان"

---

[26]) Martin Heidegger: Sein und Zeit, S. 34.

([27])، هایدێگەریش بەتەواوی لەتەك ئەم تێڕوانینەی کانتدا یەکدەگرێتەوە.

ئێستا دەردەکەوێت کە واتای "لێرە" (das Da) ئەو پەیوەندییە تایبەتییەی دازاینە بە خۆی و جیهانەوە کە هایدێگەر ناوی دەنێت ئاوەڵایی (Erschlossenheit). ئاوەڵایی لە زۆرگەدا دەردەکەوێت، واتای زۆرگەش بریتییە لە: "خۆ-سەرەتا-هەر-هەبێت-لە (جیهاندا) وەك بوون-لەلا (ی بوونەوەری نێوجیهانییانە پێگەییو)". پێکەوەدانانی "خۆ-سەرەتا"، کەواتە هێنی دەستبۆبردن (Vorgreifen)، هەروەها "هەر-هەبێت"، واتا "هەمیشە-هەر-هەبوو-بێت"، لەتەك ئامادەیی بەردەوامدا، گەرەکە پیشانی بدات کە دازاین لە سێ ڕەهەندەکەی کاتدا: ڕابوردوو و ئاینده و ئامادە، هاوکات و بەهەمان شێوە دەربوون پیادە دەکات (existiert) – دازاین زۆرگەی نییە، ئەو، وەك دەرپەڕینی دەربوونیانە ڕووەو کات، بریتییە (ist) لە زۆرگە. شەشەم تەوەری 'بوون و کات' بە ناونیشانی 'زۆرگە وەك بوونی دازاین' ئەڵقەی گرێدانە لە نێوان بەشی یەکەم و دووەمی کتێبەکەدا و مرۆ دەتوانێت لەم ئەڵقەیەدا ڕوونکردنەوە گرنگەکانی کاتێتی ببینێتەوە.

پێشتر بینیمان: "کاتێتی وەك مەغزای زۆرگەی خۆیی دەردەکەوێت"، هەروەها بینیمان: "یەکێتییە سەرچاوەییەکەی بونیادی زۆرگە خۆی لە کاتێتیدا دەبینێتەوە". بەڵام ئێمە ئێستا دەبینین، کە بۆچی هایدێگەر دەتوانێت ببێژێت زۆرگە "بوون-ڕووەو-مەرگ"ە. ئەو "کراوەییە

---

[27]) Kant, Immanuel: Kritik der reinen Vernunft, 1781/1787, A 34 / B 50.

تایبەتییەی دازاین" کە وەك حاڵی هەستەکی و تێگەیشتن و قسە (Rede) دەردەکەوێت، رووەدەکاتە "سەرجەمێتیی سەرچاوەیی". ئەم سەرجەمێتییە لە سێ رەهەندەکەی کاتدا شیاوی دەرکەوتنە. فاکتیسیتێ و فرێدراوی پەیوەندی بە رابوردووەوە دەکەن، بوون-رووەو-مەرگ پەیوەندی بە ئایندەوە دەکات، پرێزێنس (ئامادەیی)، واتا "لێرە"کە ( ,dɑ Da)، پەیوەندی بە هەنووکەوە دەکات. فاکتیسیتێ (فرێدراوی) و دەربوون (پرۆژە) دوو تەوەرەی درشتن و هەردووکیان مەرجی یەکترین. "لێرە"کە ئەو "نێوان"ـە زۆر جار جەختلێکراوەیە کە بناغە بە جیاوازی و یەکایەتییەکان دەدات.

ناوەڵایی کە هاوکات ورەیە/قەرارە (Entschlossenheit)، شێوەیەکی جووڵێنەر وەردەگرێت، چونکە هایدێگەر وەك بوون-رووەو-مەرگ لێیتێدەگات. ئەمە لە شێوەی 'سام/هەیبەت'دا (Angst) دەردەکەوێت. سام، جیاواز لە ترس (Furcht) کە بەرێی شتێکی کۆنکرێتەوە دەهێنرێتە گۆرێ، هیچ هاوبەندێکی ئەمپیریی نییە. ئێمە سامەمان نییە، ئێمە بریتین لە سام، بێگومان گەر هاتوو ئێمە ئاوەڵا بین. ئێمە دەبێت ئەم سامە، واتا بوون-رووەو-مەرگ، قبووڵ بکەین. دازاینی خۆیی ورەیە بۆ قبووڵکردنی هیچ / نابوون. بێگومان ئێمە بۆ نێو دازاین فرێدراوین، بەڵام گەر دازاینمان بریتی بێت لە "هەنگاونان رووەو مەرگ"، ئەوسا ئێمە هەروەها پرۆژەین. ئەم هەنگاونانە باڵاترین شیمانەی ئازادبوونە. "دازاین شیمانەی ئازادبوونە بۆ خۆییترین توانینی بوون"([28]). هەروەها نەتوانینی بوون هاوبەهایە بە توانینی بوون. هەنگاونان بۆ نێو مەرگ ئەزموونێکی

---

[28]) Martin Heidegger: Sein und Zeit, S. 144

سنوورییه / ئەوپەڕی نادیارە (Grenzerfahrung) لەتەك ئەم (نا)شیمانانەدا/مەحاڵانەدا ((Un)-möglichkeiten).

## "مرۆ" و ویژدان

بێگومان مرۆ بەردەوام ئەزموونی سنووریی ناکات. کەواتە هیچ شتێك ئاساییتر نییە لە هەوڵدان بۆ لابردنی باری ئەو ئەزموونە لەسەر خودی خۆ. هایدێگەر بۆ خۆبەدوورگرتن لەم ئەزموونە سنوورییە، فۆرمولەکردنێکی شایانی سەرنج دەدۆزێتەوە:

"دازاین لەنێو خۆیەوە بۆ نێو خۆی بەردەبێتەوە، بۆ نێو بێزەمینەیی و هیچێتی ی رۆژانەی ناخۆیی" ([29]).

هایدێگەر لە پەرەگرافەکانی 35-38ی 'بوون و کات'دا بە جێناوی "ناخۆیی" هەموو شێوەکانی بەربوونەوە (Verfall)ی رەسەنێتی ( das Athentische)، بۆ نموونە چەقەچەق و فزوولییەت و دوواتایی، پیشاندەدات. بزووتنی بەربوونەوە (Absturz)[30] بۆ نێو بێزەمینەیی بوونی ناخۆیی لە "مان" ("مرۆ")ی بەناوبانگدا دەردەکەوێت. بەرێی "مرۆ"وە جارێکی دی روون دەبێتەوە: هایدێگەر سەرجەم فەلسەفە

---

[29]) Ebenda, S. 178.

[30]) ئەمە پێناسەی هایدێگەرە بۆ وشەی (Absturz). (ك.ج.)

تراديسيۆنييەكان كە مرۆڤ (سەبژێكت) وەك سەنتەر دادەنێن و لێرەشدا لە فێنۆمێنی دەروونییەوە (دۆخی دەروونی، موئایەشە) دەردەچن یان ئاخافتنی ئیستیدلالی و لۆگیك وەك پێوەر دادەنێن، بە هەوڵی سەرنەگرتوو دەزانێت. لە روانگەی هایدێگەر فێنۆمێنی "مرۆ" بەڵگەیەكی نەشیاوی هەڵوەشاندنەوەیە بۆ ئەو تێروانینە كە دۆخی ئەمرۆ وەك سەرجەم هیچی دیكە نییە جگە لە فۆرمێكی بەربوونەوە، ئەمەش تەنیا دیاریكردنێكی كولتووری-رەخنەیی نییە، بەڵكو هەروەها پاڵهێزێكی سیستەماتیكییە. "مرۆ" فیگورێكی خەوشداری دازاینە. دازاین بریتییە لەو بوونە تایبەتییە كە پرسیار لەبارەی مەغزای بوون دەكات. دازاین هاوكات ئەوەیە كە پرسیار دەكات و هەروەها پرسیار لەبارەی دەكرێت. بەڵام "مرۆ" بە پێچەوانەوە پرسیار ناكات، ئەو قایلە بە وەڵام، بە چەقەچەق. "مرۆ"، بە پێچەوانەی بزووتنی بەردەوامی پرسیاركردنەوە (كە كاتەكی و هیستۆریانەیە)، وشكهەڵهاتووە. بەڵام كاتێك ئێمە هایدێگەر دەخوێنینەوە، نابێت بە ئاخافتنی ئەو لە "مرۆ" بەسەهوودا بچین و بیر لە جەماوەری سەرجادەكان بكەینەوە. "مرۆ" ئەو دازاینەیە كە خۆپەرچیوییەكەی لەدەست داوە، ئەو بریتییە لە "غوربەت" بە ئێمەوە و لەنێو ئێمەدا.

تێروانینی هایدێگەر سەبارەت بە هەبوونی "مرۆ" تێروانینێكی قەدەریی نییە. هایدێگەر بە لۆگیكە تایبەتمەندەكەی دەبێژێت كە بەتایبەتی لە دازاندا (Zerfall) شیمانە بۆ پێچەوانەكەی دیاردەدات. ئاخر بڕیارەكانمان زۆر هەڵەن. ئێمە دەبێت جیهان و مەئریفەكانمان لەسەر سەرەوە هەڵبگێڕینەوە بۆ سەر پێ، یان ئەوە كە ناخەكیترینە، ئاراستەی دەرەوەی

بکەین بۆ ئەوەی راستی ببینین. تەواو ئاشکرایە کە هایدێگەر دۆخی سیاسی و کولتووری (و فەلسەفەیی) ی سەردەمەکەی بە گەندەڵ دادەنا. بەڵام هیچ چاکسازییەك لەدژی گەندەڵیی هەمەکییانەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورییەکان بەهانامانەوە نایەت، تاکە پارمەتیدەرێك کە هەبێت، شۆڕشە. دەتوانین ببێژین کە هایدێگەر هەوڵ دەدات ئەم شۆڕشە لە 'بوون و کات'دا ئەنجام بدات، بەبێ ئەوەی لێرەدا هیچ حوکمێکی مۆرالی بدات یان مۆرکێکی نێگەتیڤی پێبدات، هەروەها ئەو تێبینییەش راستە، کە کاتێك ئەو هەوڵ دەدات خۆی لە دەنگێکی گەڤکەری مۆرالی بەدووربگرێت، هێندە جێی متمانە نییە، بۆیە دەتوانین لە "بانگی ویژدان"ـەکەی هایدێگەردا هەروەها بانگەوازێك ببیستین کە لە وەسفکردنی پەتی تێپەڕدەکات. هایدێگەر لە "بانگی ویژدان"دا لێهزرینەکانی پێشینی کۆدەکاتەوە.

بە تێڕوانینی هایدێگەر ویژدان وا دەکات کە ئێمە لە "شتێك" تێبگەین. ویژدان ئاوەڵاکەرە. کاتێك ویژدان بانگ دەکات، ئیتر بەو بانگکردنە ئاوەڵامان دەکات. ئەوە خودی دازاینە کە بانگ دەکرێت — ئەو بانگ دەکرێت بۆ توانستی خۆییترین خودبوون و خۆییترین گوناهباربوون. بەم پێیە ویژدان، بە هەمان شێوەی دازاین، خۆپەرچیوە. هایدێگەر دەبێژێت: "دازاین لەنێو ویژداندا بانگی خۆی دەکات". ئێمە دەتوانین ئەو دەرەنجامە دەربکێشین، کە دازاین ویژدان نییە، بەلحو بر[illegible] لە ویژدان، بەڵام ئەو تەنیا کاتێك ویژدانە، گەر ئاوەڵابێت، ئەمەش، لە رووی کاتەکییەوە، ئەو واتایە دەگەیەنێت کە دازاین "بوون-رووەو-مەرگ"ـە. بێگومان بانگی ویژدان شتێك نییە و مرۆڤ بە کەیفی خۆی خاوەنی بێت.

ئاشکرایە کە ئەو بانگە "لەنێو منەوە" دێت، بەڵام هەروەها "بەسەر مندا" دێت. لێرەدا دەردەکەوێت کە شرۆڤەکەی هایدێگەر لە نێوان ئۆتۆنۆمییەکی رێژەیی و لەدەسەڵاتخستنی (لەسەنتەردەرهێنانی) دازایدا ئەمسەر و ئەوسەر دەکات – (لەنێو مندا) بانگ دێت ( "Es" ruft (in mir). هایدێگەر تێبینی دەدات کە "بانگ بە شێوازی مەترسیی بێدەنگبوون دەدوێت"، بەڵام ئەو هاوکات، لەپاڵ ئەم تێبینییەیدا، رێ لە پێشبینییەك دەگرێت: مرۆ بەسەهودا دەچێت گەر وایدابنێت کە ویژدان رێنومایەکی کۆنکرێت بۆ نواندنی کردار رادەگەیەنێت. بانگی ویژدان روو دەکاتە بوون-رووەو-مەرگی رەسەن ( authentisch) وەك سەرجەم و بەمەش روودەکاتە سام کە بریتییە لە سەرچاوەییترین کراوەیی هیچ.

## کات و کاتیی

دەتوانین ببێژین، کە بانگی ویژدان بۆ ئەو "نێوان"ـە بانگمان دەکات کە پێویستە وەك نێوانی فاکتیسیتێ و پرۆژە، بوون و بوونەوەر، لێیتێبگەین – بانگمان دەکات بۆ نێو جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە. ئەم "نێوان"ـە هاوکات یەکایەتی و جیاوازیی ئەو "تەوەر"انەیە کە ناوبراوان. جیاوازییەکە، یان ئەم "نێوان"ـە، لە 'بوون و کات'دا بریتییە لە شوێن (Ort) و کات ی پرسیار سەبارەت بە مەغزای بوون، بەڵام ئەم جیاوازییە خۆپەرچیوە بەدوورگیراوە لە وشکهەڵهاتنێکی هەرەشەکەر، چونکە گرنگ پرسیارکردنە نەك وەڵامی شیاو کە شتێکی چەسپیو وەك رەسەن و راست بسەپێنێت. بێگومان "نێوان"ـەکە تەنیا شێوەکییانە (فۆرماڵ / صوری) لە واتای باودا

دیاریکراوە و دیاریکردنێکی ژێرینەیی ئامادە، واتا دیاریکردنی ئێستا وەك سنووری نێوان فاکتیسیتیێ (فڕێدراوی) و پرۆژە، پەیوەندە پێوەی. هایدێگەر ئەمەی لە ئەرِیستۆتێلیس وەرگرتووە. ئەو لە موحازەرە ناوبراوەکەی زەمێستەری هاوینەی 1927دا کە بەناونیشانی 'کێشە بناغەییەکانی فێنۆمێنۆلۆژی' خوێندییەوە، خۆی بەفراوانی لەتەك تێڕوانینی ئەرِیستۆتێلیسدا بۆ کات خەریك دەکات. ئەرِیستۆتێلیس پێناسەی کات دەکات وەك سنووری نێوان رابوردوو و ئایندە. لایەنی هاوبەشی ئێستا لەتەك رابووردوودا کە چیدی نەماوە، هەروەها لەتەك ئایندەدا کە هێشتا نییە، ئەوەیە کە ئەویش وەك ئەوان نییە. ئاخر لەو ساتەدا کە رووەدکرێتە ئێستا، ئەو چیدی نەماوە. رەخنەی هایدێگەر لە ئەرِیستۆتێلیس ئەوەیە کە گوایە ئەو بەم تێڕوانینەی بۆ کات لە تێگەیشتنی رۆژانەی کات تێپەڕناکات. خۆخەریککردنەوەی هایدێگەر بە ئەرِیستۆتێلیسەوە هاوکات هەڵوەشاندنەوەی ((دیێ(کۆن)ستروکسیۆنی)) تیۆرییەکەی ئەوە. هایدێگەر فەلسەفەی کاتی ئەرِیستۆتێلیس بەوە تیژ دەکاتەوە کە ئەو لەدژی 'کات'، 'کاتێتی' (Zeitlichkeit) دەهێنێتە نێوانەوە.

ئێمە لە ژیانی رۆژانەدا دەبێژین: "ئێستا"، بەڵام، لە روانگەی هایدێگەر، گەر ئێمە خۆمان بەپەرچیوی دەرببڕین، ئەوسا دەبێژین: "ئێستا کات هاتووە بۆ ..."، "ئێستا جارێ کات ماوە بۆ ئەوەی ...". ئێمە لێرەدا روومان نەکردۆتە ئێستاکە، "بەڵکو روومان لەوە کردووە کە <u>بۆچی</u> و <u>لەبەرچی</u> ئێستا (هێشتا — و) کات ماوە / هەیە (ist)". رابوردوو ("هێشتنەوە")، ئایندە ("چاوەڕوانیی خۆ" das Gewärtigen) و هەنووکە

("بەئامادەکردن" das Gegenwärtigen)، کە هایدێگەر بە پێچەوانەی ئێستای ڕۆژانەوە ناویان دەنێت "سات"، دەبن بە دیاریکەری واتای جیهان یان کاتی جیهانی (Weltzeit). کاتێتی کات دیاریدەکات. ئەوجا هایدێگەر هەنگاوێکی دی بە ئاڕاستەی هەڵوەشاندنەوەی (دیکۆنستروکسیۆنی) هزری ترادیسیۆنیانەی کات دەنێت: ئەو پیشانی دەدات کە سێ "ڕەهەندەکەی کات" دابڕاو لەیەك بیرناکرێنەوە و ئەزموون ناکرێن، بەڵکو لەنێویەکتریدان. هەر ڕەهەندێکیان ئاماژە بۆ دووانەکەی دی دەدات، بەنێو ئەواندا زیتبۆتەوە – ئێکستازییە، وەك چۆن هایدێگەر ناوی دەنێت. بەڵام ئەم ئێکستازە تەنیا تاکە ڕەهەندەکان ناگرێتەوە، بەڵکو هەروەها، بەگوێرەی لۆگیکی خۆپەرچیوی هایدێگەر، خودی کاتێتی دەگرێتەوە.

"کات وەك ئایندە و هەبوویی و هەنووکە بۆ نێو خۆی کشاوەتەوە. ئێمە فێنۆمێنۆلۆژیانە ئەم ئەدگارەی کشانەوە (Entrückung) ناودەنێین ئەدگاری ئێکستازیانەی کات" ([31]).

کەواتە پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە نەك تەنیا دازاین، بەڵکو هەروەها کاتیش ئێکستازییە، ئەوجا هایدێگەر جەخت دەکات کە ئەم ئێکستازێتییە شێوەیەکی هەژان نییە، بەڵکو ئاماژە بۆ دەربوونی دازاین، بۆ یەکێتیی سەرچاوەیی سێ ڕەهەندەکەی کات دەدات – بەڵێ مەرجی پێکهاتەی بوونی دازاینە. دانانی کاتێتی وەك ئێکستازێتی دەبێت بە پێشمەرجێك بۆ ئەوە کە دازاین وەك تێپەڕین (ترانسسێندێنس) شیاو

[31]) Martin Heidegger: Gesamtausgabe 24. S. 377.

بێت ([32]). کەواتە ئێمە دەبینین، موحازەرەکەی زەمێستەری هاوینەی 1927 کە تەوەری سێیەمی بەشی یەکەمی 'بوون و کات' پێکدەهێنێت، پاساوێك بۆ ئەو فەزلەی کات بەسەر بووندا لەخۆ دەگرێت کە هایدێگەر جەختی لێدەکات.

دیاریکردنی کاتێتی دەمانگەڕێنێتەوە بۆ پرسیار سەبارەت بە پەیوەندیی بوون و بوونەوەر، سەبارەت بە جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە. هایدێگەر ماوەیەکی کورت دوای بڵاوبوونەوەی 'بوون و کات' دەگات بەو تێڕوانینە کە ئەو جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانەی یان ئەم "نێوان"ەی تا رادەیەکی زۆر بە کاتیگۆرییە گەیەنراوەکانی ترادیسیۆنی فەلسەفە هزراندووە. هایدێگەر بەدووی ئەمەدا بزووتنێك بە جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە دەدات و بەم رێیەشەوە فەلسەفەکەی خۆی، کە دوای "وەرچەرخان" (Die Kehre) ناوی دەنێت "هزرین"، وەك شۆڕشی بەردەوام گۆڕان پێدەدات.

هێنانی بانگی ویژدان بۆ بەر باس دەمانخاتە بەردەم ئەو پرسیارە کە داخۆ ئێمە بەڕاستی گوناهباری هیچبوون ی خۆمان بین. ئایا ئەمە چ واتایەك دەگەیەنێت؟ ئایا ئێمە بەڕاستی گوناهبارین چونکە ئێمە دراوینەتە دەست مەرگ؟ بێگومان دەبێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بدەین،

---

[32]) بە دیدی هایدێگەر کاتێك دازاین روو دەکاتە شتێك، ئەوا هەمیشە سەرجەمێتیی بایەخمەندیەکە وەردەگرێت (چەکوشێك بۆ داکوتین هەیە و بەرێیەوە خانوویەك دروست دەکرێت و ئەمیش مرۆڤ لە کەشی نالەبار دەپارێزێت. کەواتە دازاین هەمیشە لە تاکەشت تێپەڕدەکات. لەبەر ئەم هۆیە هایدێگەر لە ترانسسێندێنسی دازاین دەدوێت. (ك.ج.)

مەبەستی هایدێگەر ئەوە نییە کە گوایە ئێمە بەهۆی بمریمانەوە گوناهبارین، بەڵکو ئێمە گوناهبارین لەبەر ئەوەی ئاگامەندانە "بوون-رووەو-مەرگ" قبووڵ ناکەین. بەڵام ئایا دەشێت ئەم گرنگیپێنەدانە هەمان واتای ئەو گوناهبارییەی هەبێت کە ئێمە وەك باوە لێیدەدوێین؟ ئایا ئەرکی دازاین ئەوەیە کە بەردەوامییەکی نەبڕاوە بە "بوون-رووەو-مەرگ" بدات، ئەمەش وەك خۆپەرچاندنی میزاجی؟ ئەم پرسیارە زۆر لەمەش گرنگترە، چونکە ئێمە ناتوانین دازاین بە هیچ فۆرمێکی سەبژێکتێتی (الزاتیە) هاوتا بکەین. هەر دەربڕینێکی هایدێگەر لەبارەی دازاین بگرین، ئەو دەربڕینە هیچی دیکە نییە جگە لە "پشاندانی شێوەکی/فۆرمال"([33])ی پرسیار سەبارەت بە مەغزای بوون. بەڵام ئایا پرسیارکردنێك، کە نە پرسیارکردنی سەبژێکتێکە و نە پرسیارکردنە لەبارەی شتێکی کۆنکرێت، بەڵکو پرسیارکردنە لەبارەی خۆییترین شیمانە، دەکەوێتە ژێر نرخاندنی گوناهبار/بێگوناهەوە؟

هایدێگەر، هاوشێوەی ئەو هزرمەندانە کە لە بۆگەنبوونی ریشەیی پەیوەندییەکانەوە دەردەچن، لە بەردەم کێشەیەکدایە؛ ئەو ناچارە روونی بکاتەوە، کە چۆن کردەکێتیی رەسەن، واتا کردەکێتی خۆیی، بریتییە لە بناغەی فۆرمی بەربوونەوە یان ناخۆیەتی. لێرەدا پرسیار ئەوەیە، چۆن کەسێك کە لەنێو "ناڕاستی"دا دەژی، دەتوانێت بەو هزرۆکەیە بگات کە ئەو لەنێو ناڕاستیدا دەژی؟ ئاخر ژیان لەنێو "ناڕاستی"دا رێ لە مرۆڤ دەگرێت بە کوێربوونی خۆی بزانێت. هایدێگەر پابەند بەم کێشەیەوە

---

[33]) پیشاندانی فۆرمال/شێوەکی (Formale Anzeige) لە واتای (Bekanntgabe)دا. (ك.ج.)

دەبێژێت، کێشەکە شیاوی چارەسەرکردن دەبێت، گەر ئێمە درێژە بە ترادیسیۆن نەدەین و لە "من-سەبژێکتێک"ی دابڕاوەوە دەربچین، بەڵکو لە دیاریکردنی "لە-جیهان-بوون"ـەوە سەرچاوەبگرین. گەر ئێمە ئەمە بکەین، وەك هایدێگەر دەبێژێت، ئەوسا فێنۆمێنی بەربوونەوە "توخمیترین بەڵگەیە بۆ دەربوونێتیی دازاین".

گەر ئەمە بهێنینە پێش چاومان، ئەوسا باشتر تێدەگەین کە بۆچی هایدێگەر وەسفکردنی دازاین ناودەنێت "ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی". کێشەی هایدێگەر بریتی نییە لە ڕوویەکی ئۆنتیانەی (ئەمپیریی — و) بوونی ئێمە، بەڵکو کێشەی هایدێگەر ئەو بوونەیە کە لەبارەی "خۆیەتی"، لەبارەی مەغزای بوون، دەپرسێت. بەڵام تەنیا لە ئاسۆی کاتدا دەشێت پرسیار لەبارەی ئەم مەغزایە بکرێت، لێرەشدا دەبێت بەئاگابین لەوە کە رابوردوو و ئامادە و ئایندە بریتی نین لە کاتیگۆریی شرۆڤەیی. کاتێك دازاین ئاوەڵایی و ورە (Entschlossenheit) ریالیزە دەکات، ئەوا لێرەدا خۆی وەك بوون-ڕووەو-مەرگ دەکات بە پرۆژە. جگە لەمە واژەی "ئۆنتۆلۆژیانە" ئەو واتایە دەگەیەنێت کە مەسەلەکە لێرەدا بریتی نییە لە ڕوویەکی پسیکۆلۆژیانەی یان ئەمپیریی دازاین، بەڵکو ئەوەیە کە هایدێگەر ناوی دەنێت "پیشاندانی شێوەکی"ی دازاین. شێوەکی و تێپەڕیو (ترانسسێندێنت) هاوواتان. زۆر جار ئەم هەقیقەتە لە دەرککردنی هزری هایدێگەردا رەچاونەکراوە، ئەمەش سەرەنجامێکی ئەوتۆی لێکەوتۆتەوە کە 'بوون و کات' بە شێوەیەکی سۆسیۆلۆژیانە و پسیکۆلۆژیانە دەرککراوە نەك بە شێوەیەکی ئۆنتۆلۆژیانە. هایدێگەر بە شێوەیەك وەسفی دازاین، خۆیەتی، ناخۆیەتی و تێگەیشتن، دەکات کە دەتوانین لێوەی دەرك بە

بوونیادێکی خولگەیی بکەین - هایدێگەر خۆیشی ئەمە دەبینێت، بەڵام ئەو بە ئاماژەدان بۆ دانوستاندنی ئەم کێشەیە لە هێرمینیۆتیکدا دەبێژێت:

"ئەوە گرنگ نییە کە لە خولگەکە بێینە دەرەوە، بەڵکو ئەوە گرنگە کە بە شێوازێکی گونجاو بچینە نێویەوە" ([34]).

ئەم دەربڕینە دەشێت ببێت بە زامنێك بۆ ئەو تانووتە کە لە هایدێگەر دەدرێت: ئەو گوایە لۆگیك ڕەتدەکاتەوە. ئەم تێڕوانینە ڕەخنەییە بەهێزتر دەبێت، گەر بڕوانین کە هایدێگەر تەنانەت لە 'بوون و کات'دا پیشانی دەدات، کە ئەو لە گۆتەی دژبێژ ناسڵەمێتەوە. ئەو بۆ نموونە دەبێژێت: "لەبەر ئەوەی دازاین لە کرۆکەوە بەربوونەوەیە، ئەوا ئەو بەگوێرەی پێکهاتەی بوونی لەنێو 'ناڕاستی'دایە". بەڵام هایدێگەر هەروەها دەبێژێت: "دازاین لەنێو ڕاستیدایە". بۆیە پرسیارێك سەبارەت بە ئیشەکەی هایدێگەر، بەتایبەتی سەبارەت بە ئیشەکەی کۆتایی، هێشتا هەنووکەییە: ئایا لە وەسفکردنی دۆخێکدا کە بەڕێی هێزی دژبەرەوە هێنراوەتە گۆڕێ، ڕێ بە دژبێژیی لۆگیکی دەدرێت یان دەبێت وەسفکردنەکە بە پێوەرەکانی لۆگیکی دووبەهایی بگونجێت؟

ئۆنتۆلۆژێتی بریتییە لە ڕێسایەکی بنەمایی. تەنیا لەبەر ئەوەی شتێکی وەك بوون هەیە، ئەوا دەتوانین بوونەوەر وەك خودی خۆی دەرکپێبکەین و بیهزرێنین. بەڵام کارەکتەری بزۆکی هزرین کاتێك سەرهەڵدەدات، گەر ئێمە تێبگەین کە بوون و بوونەوەر لە لایەنی خۆیانەوە سەرچاوەیی نین،

---

[34]) Martin Heidegger: Sein und Zeit. S. 222.

بەڵکو، وەك هایدێگەر دەبێژێت، ئەوان لە جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانەوە، واتا لە جیاوازیی بوون و بوونەوەرەوە، هەڵدەقوڵێن. ئێمە پاشان جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە کە بە "وەرچەرخان" واتای تەواوەتیی خۆی ئاوەڵا دەکات، بە فراوانی دەهێنینە بەر باس. بەڵام لەم پەیوەندییەی ئێرەدا ئەوەندە بەسە بزانین کە: کاتێك هایدێگەر لەبارەی جیاوازی دەهزرێت، ئەوا لە تەوەرەی بەڕوونی پێناسەکراوەوە دەرناچێت، بەڵکو لە جیاوازییەوە لە تەوەرەکانی بوون و بوونەوەر دەهزرێت، لێرەشدا دەبێت لەوە بەئاگابین کە ئۆنتۆلۆژێتی فەزڵی بەسەر ئۆنتێتیدا هەیە. بەڵام هەڵە دەبێت گەر جەوهەرگەرایانە بیر لە ئۆنتۆلۆژێتی بکەینەوە. ئۆنتۆلۆژێتی وەك شتێك کە بەرپرسە لە کرانەوە، لە ئاوەڵاکردن، نابێت سنووری بۆ دابنرێت یان پێناسە بکرێت، بەڵێ، تەنانەت زۆر جار لەوە دەچێت کە هەروەك بوون و جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە لە یەك جیانەکرێنەوە.

بۆ هایدێگەر "جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە" تێگەیەکی بناغەییە، ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێت کە ئەو لەو موحازەرەکەی زەمێستەری هاوینەی 1941دا (بەناوی 'تێگەی بناغەیی') ڕوونی دەکاتەوە. بەگوێرەی ئەم موحازەرەیە، تێگە بناغەییەکان بریتی نین لە ئەبستراکتەکانی وەك 'دەوڵەت'، 'ماف'، 'مرۆڤ'، بەڵکو پێویستە بەو تێگانە لە "بناغە" تێبگەین، بیگرین (greifen)، ڕاگیری بکەین (fassen)، بەڵێ پێیبگەین، یان سەرەتا تەنیا خورپەیەکمان بۆی هەبێت. "تێگەیشتن لە بناغە" ئەو واتایە ناگەیەنێت کە ئێمە لە شتێکی بە خۆمان دەرەکی تێبگەین، بەڵکو ئەو واتایە دەگەیەنێت کە ئێمە "لە پەیوەندیدا بگەین بە 'بناغە'ی سەرجەم شتەکان". هایدێگەر لە دیاریکردنی 'بناغە'دا هەموو

پێشبینییەکی بناغە وەك هۆکار یان وەك شتێکی شیاوی پێشبینیکردن ڕەتدەکاتەوە. کەواتە 'بناغە' نەك تەنیا شتێکە کە ئێمە لێیتێدەگەین و دەیگرین، بەڵکو هەروەها وەك شتێك شیاوی تێگەیشتنە کە "ئێمە دەخاتە نێو کرۆکی خۆیەوە". کەواتە مەسەلەکە شتێکە کە هاوکات شتێکی جیاوازە لە ئێمە و "سەرەڕای ئەمە سەروەرە بەسەر کرۆکماندا". ئەم لایەنە، کە لە خۆیدا نەسازە، هەروەها تێگە بناغەییەکەی جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە دیاری دەکات. ئەمیش، وەك چۆن پاشان بەفراوانی پیشانی دەدەم، شتێکە کە هاوکات "لە دەرەوە"ی ئێمە و "لەنێو" ئێمەدایە. جگە لەمە ئێمە "لەنێو" ئەوداین. هایدێگەر بەم دیاریکردنانە هەوڵ دەدات شۆڕشگێڕێتی بدات بە دیاریکردنە باوەکانی تێگەی فەزا و کات، بە تێگەیشتنمان بۆ زانین و ڕاستی، هەروەها بە پەیوەندییە ترادیسیۆنییەکەی تیۆریی و پراکسیس.

## 2- جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە و وەرچەرخان دوای 'بوون و کات'

بناغە و نابناغەی فەلسەفەی هایدێگەر لەتەك جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانەدا یەکدەگرنەوە. لە خوارەوە هەوڵ دەدەم روونی بکەمەوە کە جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە و 'وەرچەرخان' چ واتایەکیان بۆ هزری هایدێگەر پاش 'بوون و کات' هەیە، لێرەدا تەرکیز دەخەمە سەر نووسینە بلاوکراوە و بلاونەکراوەکانی ئەو لە 1936 هەتا 1941.

جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە، بە واتایەکی دی: جیاوازیی بوون و بوونەوەر، بۆ هزری هایدێگەر بریتییە لە بناغە، چونکە هەر شتێك کە هەیە و شیمانەی تێگەیشتن لەو هەبووە، بەهۆی ئەم جیاوازییەوە دەشێت. بەلام جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە هەروەها نابناغەیە، چونکە سەرجەم بوونەوەر و تێگەیشتن لێی، لە کرۆکەوە پەیوەندن بە شیمانەی نا-بوون و نا-تێگەیشتنەوە: ئەوە ئێمە نین کە زاین (Seyn) وەك بناغە بەیان دەکەین (auslegen)، "بەڵکو بناغە وەك بەرهەڵستی خۆی پێکەوە لەتەك نا-بناغەدا لە کرۆکی زایندا ئاوەلا دەکات، هیچی زیتبۆوەش لەتەك سەرچاوەدا کە سەرجەم هیچاندن دەتەنێت" ([35]).

---

[35]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 66, S. 131, Frankfurt/Main 1975 ff.

پرسیارەکەی لایبنیتس، "بۆچی بەگشتی شتێك هەیە نەك بە پێچەوانەوە هیچ نەبێت"، لە سەرەتاوە ناوەڵیی فەلسەفەی هایدێگەر دەکات و ئەوجا لەو تێزەدا تیژدەبێتەوە کە بوون هیچە/نابوونە. هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا پرسیارەکەی لایبنیتس 'تەرجومە دەکات' بۆ پرسیار سەبارەت بە مەغزای بوون، بەڵام پرسیارێك کە زۆر لەو کتێبەی تێپەڕ دەکات. پرسیار سەبارەت بە مەغزای بوون لە پێناو ساغکردنەوەی ئەو جیاوازیانەدا نییە کە لە کایەی بوونەوەردا هەن (چۆنێتیی شتەکان) و زانستە ئەمپیریەکان لێیان دەتوێژنەوە، بەڵکو رووەدەکاتە جیاوازیی بوونەوەر و بوون — بەڵێ زۆرتریش لەمە؛ پرسیارەکە خۆی بریتییە (*ist*) لەم جیاوازییە.

هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا هێشتا شیمانەی جیاوازییەکی بە کراوەیی هێشتبۆبۆوە، بەڵام جیاوازییەك کە گەرەکە کاتەکیانە لێی تێبگەین؛ کاتەکی بۆیە، چونکە دازاین، گەر "خۆیی" بێت، ئەوا "بوون رووەو مەرگ"ـە، کەواتە "کاتەکی"یە ("هەنگاونان"ـە) و بوون (کە بە "و"ی نێو ناونیشانەکەی 'بوون و کات'دا دەردەکەوێت) خۆیشی کات"ـە". کەواتە گەرەکە جیاوازییەکە وەك جیاوازییەکی کاتەکی دابنرێت، چونکە جیاوازییە لە نێوان "لەنێو" و "لەدەرەوە"ی کاتدا. هایدێگەر لە 1936 بەدواوە پرسیارە ئۆنتۆلۆژی-بناغەییەکەی 'بوون و کات' وەك "پرسیاری پەڕینەوە" لێتێدەگات. بەڵام واژەی "پەڕینەوە" نابێت لە خشتەمان بەرێت و وایدابنێین کە مەسەلەکە شێوازێکی تەواو نوێی پرسیارکردنە، بەڵکو گەرەکە وایدابنێین کە جیاوازییەکە هاوکات جیاوازییە "لەنێو" و "لەدەرەوە"ی دازاین، لێرەشدا گەرەکە ئەم "لەنێو" و "لەدەرەوە"یە

هاوکات وەك فەزایی و کاتەکی، هەروەها وەك نا-فەزایی و نا-کاتەکی، لێتێبگەین. لۆگیك پێکەوەلکاندنی "لەنێو" و "لەدەرەوە"ی یاساغ کردووە، بەڵام هایدێگەر پێکەوەیان دەلکێنێت، ئەم کارەش پێشانی دەدات کە ئەو ڕەهەندی پراکسیسی ڕۆژانە کە تێیدا یاسای کاوسالێتی و یاسای یاساغی دژبێژی چواندنیان هەیە، هەڵدەزنێنێت بۆ ئاستێکی دیکە (ترانسسێندێنت دەکات). "پرسیاری دەروازەیی" سەبارەت بە جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە دەبێت بە پەڕینەوە بۆ پرسیاری بناغەیی سەبارەت بە ڕاستیی زاین (Seyn).

ئێستاش هایدێگەر دەیەوێت نەك تەنیا سەبارەت بە جیاکەردوەی بوونەوەر و زاین، بەڵکو هەروەها سەبارەت بە هەمانێتیی بوون و زاین پرسیار بکات. جیاوازییەکە تەنیا جیاکەرەوە نییە، بەڵکو هەروەها تەوەرەکان یەکدەخات. جیاوازییەکە لە جیاکردنەوەدا یەکدەخات، واتا چیدی ناشێت لە بوونەوەرەوە پرسیار سەبارەت بە بوون (Sein) بکرێت، بەڵکو دەبێت لە زاینەوە (Seyn) پرسیار بکرێت، ئەمەش بێگومان بە چەشنێك کە ئێستا لە زاینەوە پرسیار لەبارەی زاین دەکرێت. ئەوە کە لەخۆدا نەسازە (دژبەرە)، دەبێت بە خۆڕاگەیەنەر ( das Selbstreferentielle). گەر مرۆ بییەوێت بەسەر "جیاوازیی ئۆنتۆلۆژینە"دا سەروەر بێت، ئەوا گەرەکە هەوڵ بدات بۆ ئەوەی

"راستیی زاین لە کرۆکی خۆی‌یەوە دیاری بکات (تێگەیشتن بە روانین (Ereignis/" ([36]).

لەم جۆرە لێهزرینانەدا ئەو "وەرچەرخان"ـەی هایدێگەر روودەدات کە مرۆ هەتا ئەمرۆ بەتەواوی لێیتێنەگەیشتووە. مەسەلەی "وەرچەرخان" بریتی نییە لە گۆڕینی روانگەی پرسیارەکە، بەڵکو ئێمە بەندین بە دوو گۆڕانی ریشەییەوە لە هزری هایدێگەردا. بۆ ئەوەی لەمە تێبگەین، گەرەکە بیهێنینە پێش چاومان کە هایدێگەر چیدی مێتافۆرە فەزایی و کاتەکییەکان بە گونجاو دانانێت، جا گەرچی ئەم مێتافۆرانە لە وەسفکردنی پرسیارکردندا نەشیاوی دەستبەرداریش بن. پرسیارکردن لە زاینەوە ئەو واتایە دەگەیەنێت کە زاین پرسیار لە خۆی دەکات – ئەو بۆ نێو خۆی وەردەچەرخێت. ئەوجا لەتەك ئەمەدا وەرچەرخانێك لەنێو دازایندا یەکدەگرێتەوە. دێتەوە یادمان: سەرەتا فەیلەسوفەکان پرسیاریان سەبارەت بە بوونەوەر کرد، سەرەنجامی ئەم پرسیارکردنەش ئەوە بوو کە

---

[36]) هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا وشەی (Ereignis/ ئێرنایگنیس) تەواو لە واتا فەرهەنگییەکەیدا بەکاردەهێنێت وەك رووداو، بەڵام رووداوێکی نێوجیهانی. بەڵام ئەو لە (Beiträge zur Philosophie (Vom Ereignis) دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە ئێتیمۆلۆگییەکەی ئەو وشەیە لە ئەڵمانیی کۆنی باڵادا، واتا (irougen)، کە بە ئەڵمانیی نوێ بووە بە (mit den Augen erblicken= eräugen)، چاو-تێ-بڕین. بۆ تێگەیشتن لەمە پێویستە وشەکە شیتەڵبکەینەوە بۆ چاو، بۆ روانین، واتا لێتێگەیشتن بە روانین، بانگکردن بە روانین بۆ لای خۆ، بەمەش ئێرنایگنیس گەیشتنە بە واتای گونجاو. (ك.ج.)

ئەوان راستییان نەدۆزییەوە، بەڵکو دروستیان (صحیح) دۆزییەوە. بە پێچەوانەوە لەو وەرچەرخانەدا کە هایدیگەر وەك شیاو دایدەنێت، گەرەکە:

"بەڵام ئێستا وەرچەرخانی مەزن پێویستە کە خۆی لەوبەر سەرجەم 'وەرنرخاندنی نرخاندنەکانەوە' دەبینێتەوە، واتا ئەو وەرچەرخانە کە تێیدا بوونەوەر نەك لە مرۆڤەوە، بەڵکو مرۆڤ لە زاینەوە (Seyn) رووندەکرێتەوە" ([37]).

ئێمە گەرەکە، وەك هەر شتێکی دی لای هایدیگەر، مێژووییانە لە وەرچەرخان تێبگەین، چونکە بۆ ئەوەی بتوانین دەست بە سەرەتایەکی نوێ بکەین، دەبێت بزانین کە ئێمە لە "یەکەم سەرەتا"دا بە راستی نەگەیشتین.

"لە سەرەتاکەی دیکەدا راستی دەناسرێت و رووندەکرێتەوە وەك راستیی زاین، خودی زاینیش وەك زاینی راستی (رووندەکرێتەوە)، واتا ئێرنایگنیس / تێگەیشتن بە روانین کە بۆ نێو خۆی وەرچەرخاوە، کە بێزامنی ی سمراو و بەمەش نابناغە سەر بە ئەون" ([38]).

من سەرەتا پرسیارەکە سەبارەت بە جیاوازیی بوون و بوونەوەر هەتا ساڵی 1936 دادەڕێژم، پاشان بە فراوانی رووەکەمە وەرچەرخان. وەك دیارە پرسیاری ئۆنتۆلۆژی-بناغەیی سەرەتا داواکاریی زۆری نییە، ئەو تەنیا سەبارەت بە جیاوازیی بوون و بوونەوەر پرسیار دەکات. بۆ ئەوەی

---

[37]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 65, S. 184.

[38]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 65, S. 185.

لەم پرسیارە تێبگەین، دەبێت بیهێنینە پێش چاومان، هایدێگەر متمانەی بە زانستە ئەمپیریەکان نییە کە بتوانن شتیکی گرنگ بۆ ژیان ئاشکرا بکەن، ئەوان خۆیان تەنیا بە فێنۆمێنەکانەوە خەریك دەکەن — واتا فێنۆمێنەکان کە دوای ئەوەی "دەسرەوتێنرێن"، ئیتر لە بزووتنی ژیان دادەبڕرێن. هاوکات بەقەد ئەمەش مەتریفە ئەمپیرییەکان هەڵزنێنراون، ئەبستراکتن. بێگومان ئەم تانووتەی هایدێگەر لە زانستەکان ئەو دەمەش هێندە رەسەن (originell) نەبوو، بەڵام هێندە نەبێت کە هایدێگەر بە پێچەوانەی هەندێك لە هاوچەرخەکانییەوە نایلکێنێت بە داواکارییەوە بۆ وازهێنانی تەواوەتی لە زانستەکان. هایدێگەر هەتا "وەرچەرخان" دەیویست رۆشنایی بدات بە زانستەکان، تێگەیشتنی ناتەواویان بۆ راستی ئاشکرا بکات و بییانخاتە سەر بناغەیەکی راستەقینە — فەلسەفەکەی خۆی، بۆ ئەم کارەش پێشمەرجەکان لەگۆڕێدان، چونکە دەلاقەیەك لە نێوان زانستەکان و دازایندا نییە و نەشیاوی پڕکردنەوە بێت، نەخێر: "زانستیش 'شێوازە بوونێکی دازاین'ـە" ([39]).

سەرەتا وادەردەکەوێت کە زانست شتێك بێت بەپاڵ شتانی دیکەوە لە جیهانی ئەمپیریدا، زانست سووك و ئاسان هەیە، ئەو بوونەوەرێکە لەنێو بوونەوەرانی دیکەدا. بەڵام ئەم بوونەوەرە نەك تەنیا هەیە، بەڵکو هەروەها دەتوانێت بوونەوەری دیکە بکات بە ئۆبژێکتی خەریکبوونەکانی و بەمەش جیاوازییەك لە نێوان خۆی و ئۆبژێکتدا دابنێت، لەبەر ئەم هۆیە دەبێت لە زانستیشدا شتێك هەبێت کە لەم ئاستەی بوونەوەر تێپەڕ دەکات، ئەویش "بوون"ـە. بەڵام لە روانگەی هایدێگەر زانستەکان ئەم

[39]) Heidegger, Martin: Sein und Zeit. Tübingen 1927. S. 11.

بوونەیان لەیادچۆتەوە، واتا ئەم بوونە کە ئەوان بەردەوام لەکاتی کردنی شتەکاندا بە نۆبژێکت مامەڵەی لەتەکدا دەکەن. لێرەشدا بەڕاستی لایەنێك مایەی تەوسە: پێشکەوتنەکانی ئەوان، کە لە سەروەربوونی پەرەسەندوو بەسەر سروشتدا دەردەکەون، دەگەڕێنەوە بۆ ئەم لەیادچوونەوەیە. ئێمە ئەمڕۆ، وەك هایدێگەر دەبێژێت، بۆ ئەم پێشکەوتنانە هەقێك دەدەین: پێشکەوتنەکان چیدی لە بەرژەوەندیی "ژیان"دا نین، بەڵکو تەنیا بەگوێرەی مۆرکەکانی ئەنجامخوازی و قازانجی ساڵانە و شیمانەی ژێررکێفخستن ناڕاستەوەردەگرن، ئەوان "تەکنیکی" و "پابەند(ن) بە حسابکارییەوە".

دیاگنۆزی هایدێگەر بۆ فەلسەفەش ئەمەندە تاریکە. فەلسەفە نەك تەنیا بەو رێیەوە خیانەتی لە کرۆکی خۆی کرد کە هەوڵی دا هاوشێوەی زانستەکان گۆڕان بە زانینێك بۆ دەسەڵات بدات، بەڵکو بەو رێیەشەوە کە هەوڵی دا ئەو زانینە بۆ دەسەڵات لەیادبەرێتەوە و تاریك بکات. بەم پێیە فەیلەسوفەکان هەر لە سەرەتاوە – ئەمە لە کۆتاییدا تەنانەت پارمێنیدێس و هێراکلیتێس دەگرێتەوە- گۆتیان کە ئەوان بوون دەهزرێنن، کەچی لە راستیدا بوونەوەریان هزراند، ئەوان جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانەیان لەیادچۆوە. بەڵام گەر ئەم جیاوازییە لەیادبچێتەوە، ئەوسا نەك تەنیا جیاوازییەك یان تەنانەت خودی جیاوازی لەیاددەچێتەوە، بەڵکو هەروەها جیاوازیکراویش، واتا بوون و بوونەوەر کە جیاوازییەکە پێکهێنەریانە. ئەمەش بە واتای: تازە چیدی ناشێت هیچ شتێك "رەسەن" بێت و مرۆ لێی تێبگات.

هایدێگەر ئەم وەرچەرخانە زۆر بەڕوونی لە "Besinnung"دا بە نموونەی تێگەی هیچ (das Nichts) دەردەبڕێت. ئەو جیاوازی دەکات لە نێوان سێ تێگەی جیاوازی هیچدا؛

1- تێگەی مێتافیزیکییانەی هیچ (هێگل – نە-گەیەنراوی دیارینەکراو).
2- تێگەی مێتافیزیکیانەی هیچ کە لە رووی مێژووی زاینەوە (Seyn) هزرێنراوە – هیچێنەر (das Nichtende).
3- تێگەی هیچ کە لە رووی مێژووی زاینەوە هزرێنراوە – نا-بناغە وەك کرۆکی زاین.

مێتافیزیك کە بوونەوەری بە بوون دانابوو و وەك سەرەنجامی ئەم دانانەش تەنیا وەك داماڵین (ئەبستراکسیون) و گشتێتیپێدان و هۆکار پێشبینیی کرد، ناتوانێت نە زاین و نە هیچ بەگونجاوی بهزرێنێت. بەڵام ئێمە دەتوانین ئەم بەسەهووداچوونە راستبکەینەوە گەر تێگە مێتافیزیکییەکان لایەنی کەم لە رووی مێژووی زاینەوە بهزرێنین. گەر ئەم کارە بکەین، ئەوسا ئێمە لەم تێڕوانینەوە دەردەچین: مێژوو تەنیا مێژووی لەیادچوونەوەی بوونە. ئەوجا بەدووی ئەمەدا گەرەکە ئامرازە تێگەییە ترادیسیۆنییەکان وەك تێگەی نەهەنگێوەری ئامانج دەربخەین. کەواتە ئەمە واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە: بوون چیدی نەمابوو کاتێك لەیادچۆوە. بەڵام بوون سەرلەنوێ دەبێتەوە، گەر ئەو بهزرێنرێت، بەڵام ئەو دەهزرێنرێت گەر ئێمە جیاوازیی بوون و بوونەوەر بهزرێنین.

بێگومان ئێمە بە دیدی هایدێگەر ئەم جیاوازییە ناهزرێنین لەو مەغزایەدا کە چۆن زانستەکان بابەتەکانیان دەکەن بە ئۆبژێکت. ئاخر شێوازی کارکردنی زانستی، جیاواز لەوە کە مەبەستە و داوای دەکرێت، لەنێو خۆیدا هیچ زامنێك نادۆزێتەوە. کەواتە بۆ ئەو هزراندنە شێوازێکی دیکە پێویستە.

مەئریفە زانستییەکان لە بڕیاردا دەردەبڕڕێن، بەڵام هێشتا هەر ناجەختییەك سەبارەت بەوە لەگۆڕێدایە کە داخۆ بڕیار و کردەکێتی یەکبگرنەوە. هەروەها تەنانەت خودی ئەوە کە ناودەنرێت پشکنینی راستی، سەرلەنوێ بڕیارە. بۆیە باشترە هەر لە سەرەتاوە بنەمایەك قبووڵبکەین: بڕیار ناتوانێت داواکارییەکی رەها بۆ راستی بسەپێنێت. هەموو بڕیارێك رافەیە، یان وەك هایدێگەر دەبێژێت، بریتییە لە "تێگەیشتن". بەڵام ئامانجی هایدێگەر بە پێچەوانەوە شتێکی قووڵترە، ئەم شتەش دازاینە وەك "سەرچاوە". بێگومان ئێمە بەسەهوودا دەچین گەر وای دابنێین کە گوایە هایدێگەر بە واژەی "سەرچاوە" تەنیا نۆستالگیانە لە رابوردووی روانیوە. تەریب بە تێڕوانینی ئەو بۆ جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە کە هاوکات جیاوازی و یەکایەتییە، "سەرچاوە" هاوکات "سەرەتا"یە، بەڵێ تەنانەت ئایندەیە. ئێمە چەند زۆر لە سەرچاوە دووربکەوینەوە، ئەوەندەش ناخۆییتر (بەربۆوە) دەبین. ئەمە زانستیش دەگرێتەوە: " بەگوێرەی نزیکی لە سەرچاوە و زیندوویەتی بەپاڵیەوە (...) واتای زانستی راستەقینە دەپێورێت" ([40]).

---

40) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 58, S 148.

له موحازەرەی 'کێشە بناغەییەکانی فینۆمینۆلۆژی'دا (زەمێستەری زستانەی 1919/20) هێشتا فینۆمینۆلۆژی "وەك زانستی سەرچاوە" دادەنرێت و تایبەت دەکرێت بە نرخاندنی ئەم نزیکیی و زیندوویەتییە. بەڵام ئێستا بە پێچەوانەوە ئەو پرسیارە کراوەیە کە داخۆ چ زانستێك یان هزرێك گونجاو بێت بۆ ئەو نرخاندنە، یان پرسیارەکە جارێ ئەوەیە کە داخۆ هزرێکی بەو چەشنە چ جۆرێك بێت. ئایا راڤەکردنی نزیکیی تایبەتە بە سەرچاوە یان وەك دەرەنجام لە سەرچاوەوە براوەتەوە؟ ئەو راڤەیە لە حاڵەتی دووەمیاندا جێی متمانە نییە، لە حاڵەتی یەکەمیاندا هیچ دەرفەتێك نییە بۆ ئەوەی بچینە نێویەوە، چونکە ئێمە لە سەرچاوە ژێرپەڕیوین.

وەك هانز یۆناس (1991) تێبینیی کرد، نەك تەنیا وشەهەڵبژاردنەکەی هایدێگەر، بەڵکو هەروەها هزرۆکەکانی ئەو نزیکییەکی بەرچاویان لە رێبازە گنۆزتییەکان هەیە. ئاخر لەم رێبازانەشدا دەگۆترێت کە مرۆڤان بەربوونەتەوە و زۆرینەیان چیدی ناتوانێت بە زانین (گنۆزیس) بگات. بێگومان هایدێگەر بە جەختلێکراوی رایدەگەیەنێت کە "بەربوونەوە" بۆ ئەو نێگەتیڤ نییە، هەروەها مەبەستی ئەو لە "بەربوونەوە" داواکاری نییە بۆ بەرەوشتبوون، بەڵام گەر بڕوانین کە چۆن ئەو لە 'بوون و کات'دا بەربوونەوە پەیوەند دەکات بە چەقەچەق و فزوولیەت و نامۆبوونەوە، ئەوسا زەحمەتە بتوانین ئەو جێخلێکردنەی ئەو بەهەند وەربگرین.

له فەلسەفەی هایدێگەردا راستی و بەردەوامیی ناخەکی (Inständigkeit)، لەنێوان و بناغەڕشتن، ئەویدی و مێژوو، پەیوەندییەکی چڕچنراو پێکدەهێنن، بەڵام پەیوەندییەك کە نەشیاوی کردنەوەیە. گرنگترین ئەدگاری فەلسەفەی هایدێگەر ئەوەیە کە ئەو هەوڵدەدات گۆڕان بە زمانێکی نوێی دیکەی تەواو جیاواز بدات، ئەمەش له بنەڕەتدا پێویستە، چونکە بە دیدی ئەو زمانی فەلسەفەی ترادیسیۆنی ناتوانێت رەهەندی راستی کە لە پشت فێنۆمێنەکانی رۆژانەوە شارراوەتەوە، بەگونجاوی دیاری بکات.

هایدێگەر دەبێژێت، دابەشکردنی جیهان بەگوێرەی دژبەرییە یەکتر بەدەرکەرەکان کە لۆگیك سەپاندوویەتی، بریتییە لە شێوەی هەژارکراوی جیهانێکی دەوڵەمەندتر. دابەشکردنی سەرجەمێتییەکی سەرچاوەیی بەسەر راست و چەپ، سەرەوە و خوارەوە، دروست و هەڵە، چاك و خراپدا، هیچی دیکە نییە جگە لە هەژارکەوتنی لەبرنەهاتووی هزرمان — واتا ئەو هزرەمان کە لە کرۆکەوە دژبەرییەکان لەخۆدەگرێت. گەر ئێمە زۆر لە خۆمان بکەین بۆ ئەوەی جیهان لەسەر نموونەی هزرینێك بهزرێنین کە دژبەرییەکان بەردەر دەکات، ئەوسا ئێمە نەك تەنیا بە راستی ناگەین، بەڵکو تەنانەت وا دەکەین کە مەحاڵ بێت نەگەیشتنی خۆمان بە راستی ببینین. لە خوارەوە هەوڵ دەدەم بەو تێگانە کە لە سەرەتای ئەم بەشەدا هێنامنە نێوانەوە، پێشمەرج و مەبەستەکانی هزری هایدێگەر بخەمە ژێر لێتوێژینەوە.

هایدێگەر لە دووەم قۆناغی هزری خۆیدا کە تەرخانکراوە بە نیشکردن لە 'Beiträge zur Philosophie (vom Ereignis)'، بە تێبینییەکان: 'Besinnung'، بە موحازەرەی Grundfragen der Philosophie. ' 'Ausgewählte "Probleme" der "Logik"' و لێکۆڵینەوەی Die 'Geschichte des Seyns'، هەوڵ دەدات بوون/زاین (Sein) کە ئێستا وەك زاین (بوون/Seyn) دەینووسێت، هەروەها راستی و مێژوو لە نوێوە بهزرێنێت. بەڵام ئەم هزراندنە نوێیە سەرەنجام دەخاتەوە بۆ تێڕوانینی ئەو سەبارەت بە جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە. هایدێگەر لە 'Beiträge'دا کە سەرەتا مەبەستی نەبوو بڵاوی بکاتەوە، پرسیار ناکات لەبارەی "مەغزای بوون"، وەك چۆن لە 'بوون و کات'دا کردبووی، بەڵکو پرسیار لەبارەی خودی زاین (Seyn) دەکات، بەمەش هەوڵە تیۆرییەکەی خۆی تیژتردەکاتەوە. بوون/زاین (Seyn/Sein) و بوونەوەر کە لە 'بوون و کات'دا بەزۆری وەك جیاکراوە لە یەك نەك وەك یەکایەتی پێشبینی دەکران، ئێستا وەك دژبەری لەنێو یەکایەتییەکدا دەهزرێنرێن، هاوشێوەی ئەمەش راستی و زاین و مێژوو وەك یەك دەبینرێن:

"ئەم راستییەی زاین هەرگیز جیاوازێك نییە لە زاین، بەڵکو لە کرۆکەوە راستەقینەیەتی، هەر بۆیە خۆی لەنێو مێژووی زایندا دەبینێتەوە، جا گەر تەنانەت ئەو ئەم راستییە و خودی خۆی ببەخشێت یان تەسلیمی نەبێت و بەمەش نابناغە بهێنێتە نێو مێژووی خۆیەوە" ([41]).

---

[41]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 65, S. 93.

کەواتە مەسەلەکە بە 'Beiträge'دا، وەك چۆن لە موحازەرەی پێشتر نابراوی زەمێستەری زستانی 1937/38دا، بەبێ هیچ گومانێك رووبەکاتە کێشەی راستی و مێژوویێتیی راستی، لێرەشدا گەرەکە تێگەی مێژوو لە دوو دیدی جیاوازەوە ببینین: لە لایەك تێڕوانینی باوی مێژوو کە لە راستیدا نامێژوو و دازنانە (Zerfall) (هایدێگەر ناوی دەنێت هیستۆری)، لە لایەکی دی مێژووی راستەقینەی زاین. لێرەدا "پەڕینەوە"یەك پێویستە لە هزری ترادیسیۆنیانەی نا-راستی و نا-مێژووەوە بۆ راستی و مێژووی راستەقینە، یان "پەڕینەوە لە مێتافیزیکەوە بۆ هزری مێژوویی زاین"، ئێمە بەم پەڕینەوەیە "بەنێو کایەی هەتا ئێستا شارراوەی بەکرۆکبوون (Wesung)ی زایندا (تێپەڕدەبین) و هەر بەم شێوەیەش رۆشندەکرێتەوە" ([42]).

مێژووی ترادیسیۆنی لە گریکەکانی دێرینەوە هەتا ئەمرۆ مێژووی بەربوونەوەیە (Verfall). ئەمە تێزەکەی هایدێگەرە لە 'Beiträge'دا و لە نیشی دیکەی ئایندەیدا لێی پاشگەز نابێتەوە. مێژوو وەك مێژووی بەربوونەوە مەرجێکە بۆ ئەوە کە هزری هایدێگەر بتوانێت نامۆبوونی رەها رەتبکاتەوە و بەمەش پرسیاری راستەقینە لەبارەی راستی بکات. بەڵام ئەشیاوە ئەم کارە بە دەسوێژە باوەکانی لۆگیك و مێتافیزیك ئەنجام بدرێت، بەڵکو دەبێت زمانێکی "دیکە"، هزرێکی "دیکە"، یان باشتر ببێژین، پرسیارکردنێکی "دیکە" بدۆزرێنەوە، بە شێوەیەکی دیکە ببێژین: پرسیارکردنەکەی "دی" دەبێت ئێمە بدۆزێتەوە. هایدێگەر، جیاواز لە 'Beiträge'، لە موحازەرەی 'Grundfragen der Philosophie

---

[42]) Ebenda, S. 3.

'دا كە ئاراستەی جمهورێكی ئەكادیمیی فراوانی كرد، بەڕوونی ڕەخنە دەگرێت لە تێگەیشتنی راستی و پیشانی دەدات كە ئەم تێگەیشتنە لە رووی مێژووییەوە بۆگەنی كردووە. ئەو لەم موحازەرەیەدا دەبێژێت: پلاتۆن و ئەریستۆتێلیس بە هەڵە لە راستی تێگەیشتن، چونكە وایان دانا كە راستی بریتییە لە دروستیی گۆتە، ئەم بەهەڵەتێگەیشتنە سەرەنجامێكی ستەمی ئەوتۆی لێكەوتەوە كە ئیتر "ئاستەنگ لە بەردەم دیددا بۆ كرۆكی راستی زیتبۆوە" ([43]). لە ترادیسیۆندا گۆتەیەك بە "دروست" (صحیح) دادەنرێت، گەر ئەو مەئریفەیە كە لەنێو گۆتەكەدا دەربڕراوە، بەگوێرەی بابەتی بڕیار بەسەردا دراو هەڵوێست وەربگرێت. ئەریستۆتێلیس لێرەدا لە یەكگرتنەوە (homoiosis) دەدوێت. لێرەدا بڕیاری دروست بەندە بە پێشبینیكردنێكی گونجاوەوە كە (ئیدیالیستیانە) روودەكاتە پێشبینیكراو (perceptum یان idea)، یان (وەك لە ریالیزمدا) روودەكاتە بابەتەكە. هایدێگەر لە حاڵەتی ئەم جۆرە تێگەیشتنانەدا نەك تەنیا ڕەخنە لە جەختیی یەكلایەنییان دەگرێت، بەڵكو هەروەها لەوەش كە لەم شێوازانەی هزریندا روونییەك وەردەگیرێت، ئەوجا بەو روونییە گۆتەكە كە دەشێت هەڵە بێت، بەمسۆگەری دەكرێت بە جێگەی (Ort) راستی. هایدێگەر بە پێچەوانەوە وایدادەنێت كە "كراوەیی" (Offenheit) بریتییە لە پەیوەندیی نێوان هزر و بوونەوەر. دروست (صحیح) تەنیا بەڕێی كراوەییەوە دەشێت - نەك بە پێچەوانەوە. ئەم تێڕوانینە داوامان لێدەكات كە ئێمە پرسیارە ترادیسیۆنیەكە لەبارەی كرۆكی راستی (واتا لەبارەی پەیوەندییە یەكلایەنی و وشكهەڵهاتووەكەی نێوان پێشبینیكردن

[43]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 45, S. 11.

و پێشبینی/بابەت) "وەربچەرخێنین" بۆ پرسیار سەبارەت بە راستیی کرۆك.

"پرسیار سەبارەت بە کرۆکی راستی هاوکات و لەخۆدا پرسیارە سەبارەت بە راستیی کرۆك. پرسیاری راستی – کە وەك پرسیاری بناغەیی پرسیارکراوە – لەدژی خۆی بۆ نێو خۆی وەردەچەرخێت" ([44]).

بۆ ئەوەی مێتافۆری وەرچەرخان پیشان بدەین، دەتوانین نموونەیەك وەربگرین: حەزی هایدێگەر لە کردنی فێنۆمێنە گوندییەکانی وەك تولەرێی شاخ (Holzwege) و ترۆپك (Gipfel) بە تێگە، بەڵام پێویستە ئاگادار بین لەوە کە واتای وەرچەرخان تەنیا فەزایی و کاتەکی دیاری ناکرێت، چونکە بەتایبەتی شێوە خۆراگەیەنەرەکەی (selbstreferentiell) "لەدژی خۆ بۆ نێو خۆ" ئەم جۆرە دیاریکردنە یاساغ دەکات. وەرچەرخان داوامان لێدەکات، کە ئەو گرفتە بناسین کە دەمانخاتە بەردەم "پرسیارکردن و دەستپێکردنێکی دیکە". بە دیدی هایدێگەر نەکبەتییەکی سەردەمەکەمان ئەوەیە کە ئێمە ئەزموونی ئەم گرفتە ناکەین، ئێمە لەنێو بێگرفتییەکی تەوتۆدا دەژین کە لە لایەنی خۆیەوە گرفتە. هایدێگەر هەوڵ دەدات روونی بکاتەوە کە ئەو گرفتەی ئێمە لێرەدا لێیدەدوێین، واتای داماوی و خەمباری ناگەیەنێت، نەخێر، مەسەلەکە بریتییە لە "نییەیەك" (ein Nichthaftes / Nicht)، بەڵام ئەم نییەیە هاوشێوەی کەمایەسییەك نییە، بەڵکو بریتییە لە "رادەبەدەرێك لە زیادە". نییە بۆ هایدێگەر واتای "تێماوی" (نەزانین-

[44]) Ebenda, S. 152.

چی‌بکرێت / (ein „Nicht-aus-nicht-ein-Wissen" دەگەیەنێت، کەواتە دەرفەتێك نییە "بۆ ئەوەی مرۆ بتوانێت لەم تێماوییەوە / نەزانین‌چی‌بکرێت‌ـەوە دەربچێت و هەروەها بچێتە نێویەوە، (ئەمەش کردارێکی ئەوتۆیە - و) کە خۆی بە زانینێکی بەو چەشنە وەك ئەم فەزا نەدیو و روونەکراوەیە ئاوەڵا دەکات. ئەم فەزایە (کات‌فەزایە) — گەر بۆمان هەبێت ئاوها بدوێین — بریتییە لەو نێوانە کە تێیدا جارێ دیار نییە داخۆ چی هەبێت و چی نەبێت" ([45]).

ئێمە سەرلەنوێ بەم دیاریکردنەی زانین کە "لێوەی و بۆ نێوی" فەزایەك ئاوەڵا دەبێت، دەگەین بە دیاریکردنێکی خۆڕاگەیەنەر کە فەزاێتی جێدەهێڵێت (transzendiert)([46]). لێرەدا مەبەست لە "نێوان"ێکە کە نابێت وەك فەزا‌کاتی لێی تێبگەین، جگە لەوە ئێمە لەم فورمولەدا بە ئاسانی دەبینین کە هایدێگەر جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە تیژتر دەکاتەوە. ئێمە گەرەکە گرفت، گەرەکە نییە، وەك "بنەڕەت"ی مرۆڤ ببینین، "مرۆڤ سەرەتا لەم گرفتەوە دێتە ئاراوە کە کرۆکیترە لە ئەو خۆی و تەنیا و سەرەتا بەرێی ئەوەوە میزاجی پێدەدرێت (be-stimmt wird)" .([47])

---

[45]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 45, S. 152.

[46]) جێهێشتن (transzendieren) واتا شتێك جێبهێڵرێت و هەنگاوبنرێتە نێو کایەیەکی دیکەوە ( etwas hinter sich lassen, in einen neuen Bereich übergehen).

[47]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 45, S. 153.

بەمەش هایدێگەر پردێك رووەو ئەو ئەزموونە رادەکێشێت کە لە ترادیسیۆنەوە سەرچاوەی فەلسەفاندنە: رامان. "رامان بە تێماوی لەنێو میانەیەکدایە ..." ([48]). هەموو پرسیارکردنێك سەبارەت بە کرۆکی راستی، واتا ئەو کرۆکەی راستی کە لە لایەنی خۆیەوە دەرفەت دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی پرسیار لەبارەی راستیی کرۆك بکرێت، دەکەوێتە بەردەم ئەرکێك؛ پرسیارکردنەکە گەرەکە خۆی تەسلیمی ئەم میانەیە بکات، یان باشتر بیێژین، خۆی بخاتە نێو ئەم میانەیەوە، نێو جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانەوە. هایدێگەر بەم تێڕوانینە رەخنەیەك ئاڕاستەی هەوڵە تیۆرییەکەی خۆی دەکات لە 'بوون و کات'دا، بەڵام هاوکات بەردەوامیپێدانێك دەهێنێتە گۆڕێ، ئەویش بەوە کە دەبێژێت، "تێگەی 'جیاوازیی ئۆنتۆلۆژیانە' تەنیا رێخۆشکەرانە وەك پەڕینەوە لە پرسیاری دەروازەییەوە بۆ پرسیاری بناغەیی" شیاوی لێتێگەیشتنە ([49]).

"پرسیاری بناغەیی" رووەدەکاتە ئەو "وەرچەرخاوی"یەی زاین (Seyn) و بوونەوەر کە لەنێو دازایندا رووەدەدات. زاین و بوونەوەر کە وەك دژبەر لەدژی یەکتری وەردەچەرخێن، ئێستا لە یەکایەتییەکدا دیاری دەکرێن. ئەوان کەرتی سەرجەمێك نین، چونکە ئەوان هاوکات کەرت و سەرجەمن، ئاخر ئەوان بۆ یەکتری – و تەنانەت بۆ خۆدی خۆیان – ئەویدییەك و هەمانێکن. ئەمە دەشێت یان ئێمە دەتوانین لێی تێبگەین، چونکە پرسیاری راستی وەك "لەنێو خۆدا لەدژی خودی خۆ" چێدەبێت ([50]). ئێمە گەرەکە ئەم جۆرە تایبەتییەی خۆڕاگەیاندن وەك هەوڵێك تێبگەین

---

48) Ebenda, S 168.
49) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 65, S. 258.
50) Ebenda, S. 47.

بۆ ئەوە کە دزایەتیی هەموو شێوەیەکی وشکهەڵهاتنی تێگەیی و پراکتیکی بکرێت. ئاخر وشکهەڵهاتن نیشانە و سەرەنجامی هەموو ئەو هەوڵانەیە کە دەدرێن بۆ نواندنی دەسەڵات. مەغزای هزرۆکەی وەرچەرخان بەتایبەتی ئەوەیە کە لە هێزە دژبەرەکان هاوسەنگییەکی بەردەوام وەك کرۆکی راستەقینەی زاین و دازاین جێبکرێت. بەدبەختیی مێژووەکەمان ئەوەیە کە ئێمە بەردەوام دەمانەوێت هەموو شتێك بە واتای وشە دیاری بکەین، چونکە تەنیا بەم رێیەوە دەرفەتمان بۆ دەرەخسێت دەسەڵات پیادەبکەین، هاوکات تەنیا بەم رێیەوە هەموو شیمانەیەکمان لێدەسەنرێت کە بتوانین دەسەڵات بە شێوەیەکی رەخنەیی روونبکەینەوە. لەم پەیوەندییەشدا مەسەلەیەك ئاشکرایە: ئێمە ناتوانین بە شێوە باوەکانی رەخنە دەسەڵات و شێوازی پیادەکرنی بخەینە ژێر رەخنەوە. ئاخر لۆگیکی شێوەکی و شێوازی کارکردنی زانستەکان کە پابەندی ئەو لۆگیکەیە، لە بنەماوە رێ بە چواندنی جووتواتایی و دژبێژی نادەن. کەواتە پێویستە روانگەیەك بۆ رەخنەی کرۆکی بدۆزرێتەوە کە لە مەتریفە باوەکان تێپەڕ بکات، واتا لەو مەتریفانە کە بە شێوەیەکی سەلمێنەرانە دەستگیرکراون و ئەمپیریانە شیاوی پشکنینن. هایدێگەر باوەڕ دەکات ئەم روانگەیەی لە جۆرە تایبەتییەکەی خۆڕاگەیاندندا (Selbstreferentialität) دۆزیبێتەوە کە لە سەرەوە روونکرایەوە، ئەمەش خۆڕاگەیاندنێکە کە هاوکات دژبێژی و یەکایەتی، هەمان و جیاواز، لە خۆ دەگرێت. هزرینی زەقترین دژبەری کە هزرینی بوون و هیچە، دەبێت بە پاڵهێز بۆ پراوەکردنی روونی ئەم روانگەیە. ئاخر هایدێگەر وایدادەنێت کە "لە ئاخی هیچەوە لەنێو زایندا سەرچاوەی ناتەبایی"یەکە دیاری دەکرێت. پاشان ئەو بەردەوام دەبێت و

دەبێژێت: "تەنیا لەبەر ئەوەی زاین (Seyn) نییەئاسا (nichthaft) بەکرۆك دەبێت، ئەوا نامۆبوونی وەك ئەویدییەکەی خۆی لەخۆگرتووە. ئاخر ئەم ئەویدییە بریتییە لە ئەویدیی خودی خۆی" ([51]).

نەشیاوە لە هزرینی ئەمپیریدا هیچ شیمانەیەك بۆ دەربڕینی ئەم جۆرە هزرۆکانە هەبێت. بۆیە ئێمە دەتوانین یان دەبێت وایدابنێین کە هەڵوێستوەرگرتنەکانی هایدێگەر بە ئاراستەی خودا (وەك بۆ نموونە لە دیمانەکەی گۆڤاری دێر شپیگلدا) گۆڕینی روانگەن لە کایەی ئەمپیرییەوە رووەو کایەی "تەواو ئەویدی"، بەڵێ زۆرتریش لەمە: تەنیا لە "تەواو ئەویدی"یەوە دەشێت نوقسانییەکانی جیهانی ئەمپیری و زانستەکان ببینرێت، هەروەها تەنیا لەسەر ئەم شێوەیە دەتوانین تێبگەین کە چۆن ئێمە گەرەکە هەوڵی "دەستپێکردنەکەی دی" بدەین – جا گەر تەنانەت لۆگیك ئەم جۆرە دەستپێکردنەی یاساغ کردبێت. بە دیدی هایدێگەر لۆگیك هەرگیز پێوەر نییە، چونکە لۆگیك "بە کەمترین رادە شێوازی کارکردنی بێکەڵێن و جیدییە بۆ دیاریکردنی کرۆك، هەروەها (لۆگیك) تەنیا دیاردەیە ...، بێگومان زەروورترین دیاردە کە هەتا ئێستا مێژووی زاین ناسیبێتی" ([52]).

هایدێگەر هەروەها دەبێژێت، ئەم هەوڵە بۆ دەستپێکردنی "سەرەتایەکی دی" هەرگیز کۆتایی نایەت. رێگە بە دیدی ئەو ئامانجە. کەواتە لە هزرێکدا کە هەردەم "بەرێوە"یە، هەمیشە دەرفەت بۆ دیاریکردنی دژبەر (ی نەشیاوی چارەسەرکردن) لەگۆڕێدایە: "کەواتە هزریش وەك (هزری)

---

[51]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 65, S. 267.
[52]) Ebneda, S. 461.

دەستپێکردووی سەرەتاکەی دی دەتوانێت بێتە نزیکی ی دوورەوە لە دوایەمین خودا" ([53]). هایدێگەر دژی لۆگیك دەوەستێتەوە - لۆگیك کە هەتا ئێستا بێ قەید و شەرت وەك ئەدگاری هزرینی دروست قبوولکراوە؛ "لە مەودای دیدی باوی 'لۆگیك' و هزری خاوەن دەسەڵات"دا وادادەنرێت کە گوایە "پرۆژەی بناغەڕشتنی راستی تەواو بێبڕۆەوە" ([54]).

بەڵام بۆ هایدێگەر بە هیچ شێوەیەك بەس نییە کە ئێمە تەنیا دژی لۆگیك و هزری ئیستیدلالی و پێشکەوتن (التقدم) بووەستینەوە، چونکە گەر لێرەدا بچەقێین، ئەوسا هێشتا هەر لەسەر هەمان ئاستی ئەوان هەڵوێست وەردەگرین، ئەوسا بەرپرسیار دەبین لەوە کە نەك تەنیا کشانەوەی بوون لەیاددەچێتەوە، بەڵکو تەنانەت پەرەی پێدەدرێت. نەك بەڕێی هەڵبژاردنەوە کە هەمیشە شیمانەیەکە لەنێو شیمانەگەلی دیکەدا، بەڵکو تەنیا بەڕێی "ئەوپەڕی ورە"وە کە بە شێوەیەکی جەختلێکەری شۆڕشگێڕانە بیرکراوەتەوە و هاوشێوەی "وەرچەرخان"ـە، دەرفەت دەڕەخسێت بۆ ئەوەی هزرێکی ریشەیی جیاواز و "ئێرئایگنیس" (Ereignis) ئامادەبکرێن – ئەمە بێگومان گەر هاتوو بزووتنی لەناوچوون رۆشنکرایەوە.

[53]) Ebenda, S. 262.
[54]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 65, S. 328; vgl. auch S. 247 und S. 461.

## 3- مێتافیزیك. ئایا ئەمە چییە؟

بە دیدی هایدێگەر پرسیار لەبارەی مێتافیزیك مەسەلەی پێناسە نییە، بەڵکو پرسیارێکی نێوەندییە سەبارەت بە شیمانەی یان ناشیمانەی خۆتێگەیشتمان لە فەلسەفەدا، یان باشتر ببێژین: لە هزردا. ژمارەکی زۆر تێکستی هایدێگەر پیشانی دەدەن کە ئەم پرسیارە ماوەیەکی درێژخایەن کاریگەریی لەسەر هزری ئەو هەبووە. سەرەتای کاریگەریی ئەم پرسیارە لە نووسینێکی هایدێگەردا دەردەکەوێت کە لەبارەی برگەی شەشەمی فۆرمگەرایی (شێماتیزم) لە 'رەخنەی ئاوەزی پەتی'ی کانتدا ( A137 / B176 ff.) نووسیویێتی. ئەم نووسینە دەبوو بەگوێرەی پلانی هایدێگەر تەوەرێکی 'بوون و کات' پێکبهێنێت، بەڵام لە کۆتاییدا نەیخستە نێو نووسینەکەوە، بەڵکو درەنگتر لە شێوەی کتێبدا بەناونیشانی 'کانت و کێشەی مێتافیزیك' بڵاویکردەوە. بەدووی ئەمەدا ئەو موحازەرەیە دێت کە هایدێگەر 1929/7/24 پاش دامەزراندنی لە زانکۆی فرایبورگ بەناونیشانی 'مێتافیزیك چییە؟' پێشکەشی کرد، پاشان ساڵی 1949 'رێبەری'یەکی خستە پاڵ و تێیدا تێڕوانینی خۆی سەبارەت بە مێتافیزیك، بەمەش سەبارەت بە فەلسەفە، دەردەبڕێت: فەلسەفە هەر لە سەرەتاوە ئامانجی خۆی نەهەنگێوتووە و هەتا ئەمڕۆش بەمەی نەزانیوە. هایدێگەر بەم تێڕوانینە تێزێك دادەنێت کە ئەو دەمە بۆ فەلسەفەی ئەکادیمییانە فەزیحە بوو: "لەنێو بوونی بوونەوەردا هیچاندنی هیچ روودەدات". هایدێگەر سەرجەم ترادیسیۆنی فەلسەفەی بە شێوەیەکی

نێگەتیڤ دەنرخاند و هاوکات بەهایەکی کەمی بۆ لۆگیك دادەنا، ئەمەش پێکەوە لەتەك تووڕەبووندا لە رابوردووی نازیانەی ئەو وایکرد کە ماوەیەکی کورت پاش تێکشکانی رژێمی نازی داواکارییەك بەرزبکرێتەوە؛ گەرەکە هایدێگەر فڕێ بدرێتە دەرەوەی فەلسەفە.

هایدێگەر لە موحازەرەی 'رێبەرییەك بۆ مێتافیزیك'دا کە زەمێستەری هاوینەی 1935 خوێندییەوە و ساڵی 1953 بڵاوکرایەوە، پرسیارکردنی خۆی لەبارەی مێتافیزیك بەفراوانی روونەدەکاتەوە و بناغەدەڕێژێت. ئەو لەنێوان 1936 و 1946دا بە کێشەی "گەورەترین گەمژەیەتی"ی خۆیەوە (وەك خۆی دەیگۆت) خەریك بوو، ئەم گەمژەیەتییەش بریتی بوو لە چالاکبوونی بۆ ناسیۆنالسۆسیالیزم. ئەو لەم ماوەیەدا پابەند بە کێشەی ئەم چالاکبوونە و هاوکات لەگەڵ دانانی ستراتیژییەکدا بۆ ئەوەی مۆنۆپۆلی نازییەکان لە راڤەکردنی هوێلدەرلین و نیتچەدا لەق بکات، تێکستی جیاواز کۆدەکاتەوە کە بەناونیشانی 'کۆتاییهێنان بە مێتافیزیك' لە کتێبی (Vortäge und Aufsätze)دا بڵاوکراونەوە. هایدێگەر هاوکات خۆی لەتەك "بەسەر سنووردا"ی ئێرنست یونگەر خەریك دەکات و ساڵی 1958 ئەم نیشەی بەناونیشانی "سەبارەت بە پرسیاری بوون" بڵاودەکاتەوە. ئەو ساڵی 1962 سەرلەنوێ بە نووسینی 'تێزەکەی کانت لەبارەی بوون" روودەکاتەوە ئەم کێشەیە.

## کانت و کێشەی مێتافیزیک

یەکەم تەوەری بەشێکی دووەم لە 'بوون و کات'دا کە هایدێگەر پلانی بۆ دانابوو و بڵاونەکرایەوە، گەرەك بوو ئەم ناونیشانەی هەبێت؛ "تیۆریی فۆرمگەرایی و کات لای کانت وەك پلەی سەرەتایی کێشەی تێمپۆرالێتی' ([55]). هایدێگەر لە موحازەرەیەکی زەمێستەری زستانەی 1925/26 و لە کۆرسە زانکۆییەکانی داڤۆسدا (ساڵی 1929)، کاتێك ئەو لە لەتەك ئێرنس کاسیرەردا دانوستاندنی کرد، پرۆژەیەکی بۆ راڤەی کانت دانا. ئەم راڤەیە نەك تەنیا دەرفەت دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی بەرِوونی رەخنەکەی ئەو لە ئۆنتۆلۆژیی ترادیسیۆنی ببینین، بەڵکو هاوکات برِوای ئەو بە زەرووڕەی مێتافیزیك پیشان دەدات. ئەم تێکستە هەمان ساڵ وەك کتێب بەناونیشانی 'کانت و کێشەی مێتافیزیك' بڵاوکرایەوە.

بێگومان ناونیشانی ئەو تەوەرە کە دەبوو بەگوێرەی پلانی هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا بڵاوبکرێتەوە، خرایە نێو کتێبەکەوە، بەڵام ئەم کارە بەدەگمەن پرسیار دەخاتەوە. خودی تێکستەکە لە بنەرِەتدا راڤەیەکی تەوەری فۆرمگەراییە (شێماتیزمە) لە 'رەخنەی ئاوەزی پەتی'دا. بەڵام

---

[55]) تێمپۆرالێتی واتای کاتێتی دەگەیەنێت، بەڵام هایدێگەر لەبریی و هاوکات لەپاڵ کاتێتیدا (Zeitlichkeit) بەکاری دەهێنێت، بۆ ئەوەی جگە لە بوونی دازاین خودی بوون لە کاتەوە دیاری بکات، هەر بۆ پیشاندانی ئەم جیاوازییە لە نێوان کاتێتیی دازاین و کات ی بووندا وشەی تێمپۆرالێتی بەکاردەهێنێت. ئەو لەم روانگەیەوە دەبێژێت کە تێمپۆرالێتی کاتێتییە گەر هاتوو کاتێتی بکرێت بە بابەتی پێوەخەریکبوون، ئەمەش بۆ ئەوەی دەرفەت بۆ تێگەیشتن لە بوون و شیاندنی ئۆنتۆلۆژی برەخسێنرێت (بروانە، Grundprobleme, S. 324). (ك.ج.)

تێکستەکە وەک کتێب و بەناونیشانی 'کانت و کێشەی مێتافیزیک' زۆر لەوە تێپەڕدەکات و تەنیا لە ناونیشانەکەیەوە ریزێک پرسیار دەخاتەوە. ئایا مەبەستی هایدێگەر لە "کێشەی مێتافیزیک" چییە؟ ئایا مێتافیزیک کێشەی هەیە یان خۆی کێشەیە؟ ئەوجا، ئایا ئەم کێشەیە چییە و بۆ کێ کێشەیە؟

یەکەم کێشە کە هایدێگەر لەتەک مێتافیزیکدا هەیەتی، بەئاسانی دەردەبڕێت: مێتافیزیک لە سەرەتاوە، واتا لەکاتی هێراکلیتێس و پارمێنیدێسەوە، هەمیشە وای راگەیاندووە کە گوایە بوون دەمەزرێنێت، کەچی لەبریی ئەوە تەنیا لەبارەی بوونەوەر دەدوێت. کەواتە مێژووی مێتافیزیک مێژووی نەهەنگاوتنی پرسیاری بوون و راستییە. کێشەیەکی دی پرسیاری دوایەکێتیی بوونە کە هایدێگەر لە کۆتایی کتێبەکەدا وەک پرسیاری ئەنترۆپۆلۆژی پێوەی خەریک دەبێت. هایدێگەر سەرەتا هزری خۆی وەک بەشێکی فەلسەفە دەبینێت، فەلسەفەش تەنیا مێژووی فەلسەفە نییە، بەڵکو هەروەها فەلسەفەی مێژووە. ئەوجا، هزری هایدێگەر نەک تەنیا بەشێکی مێژووی فەلسەفەیە، بەڵکو هەروەها هەوڵێکە بۆ کۆتاییهێنان بەم مێژووە. بەڵام هایدێگەر لەم پەیوەندییەدا بەباشی دەزانێت کە ئەو ناتوانێت هەروا ئاسان لە فەلسەفەی ترادیسیۆنی بدات، چونکە تەنانەت ریشەییترین لێدانی ئازادیخوازانە هێشتا هەر بەو بابەتەوە پابەند دەمێنێتەوە کە لێدانەکە دەیەوێت خۆی لێ ئازادبکات.

لە نێوەندی نووسینی 'کانت و کێشەی مێتافیزیک'دا ئەم پرسیارە خۆی دەبینێتەوە: ئایا ئەوە چ واتایەک دەگەیەنێت کە کانت لە چاپی دووەمی

’رەخنەی ئاوەزی پەتی’دا (1786) هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە کۆتێزی لێڕوانین و هزر دەگۆڕێت، واتا چیدی ئەو کۆتێزە وەك توانستی ترانسسێندێنتالی وێناکردن نابینێت، بەڵکو وەك توانستی تێگەیشتن / زەین (ملکە الفهم /Verstand) دایدەنێت؟ هایدێگەر رەخنە لەم روانگە گۆڕینەی کانت دەگرێت، چونکە بە تێڕوانینی هایدێگەر توانستی وێناکردن ئەو توانستەی مرۆڤە کە تێیدا پەیوەندییەکی تایبەتی بە کاتەوە دەردەکەوێت. من لێرەدا نە دەتوانم روو بکەمە ئەو پرسیارە کە داخۆ ئەم رەخنەیەی هایدێگەر لە کانت شیاوی قبوولکردن بێت، نە دەتوانم روو بکەمە بەزەبریی راڤەکەی هایدێگەر کە چەندین رەخنەی لێگیراوە و هایدێگەر خۆیشی ئەوەی درکاندووە - جا گەرچی بە جۆر و شێوازێکی دوواتایی. من دەبێت لێرەدا خۆم تەرخان بکەم بۆ پیشاندانێکی درشتی هێڵە سەرەکییەکانی روونکردنەوەی مەئریفە لە لایەن کانت، هەروەها پیشاندانی پەیوەندیی نێوان ئۆنتێتی و ئۆنتۆلۆژێتی لەو شێوەیەدا کە لە دیاریکردنی توانستی ترانسسێندێنتالی وێناکردندا دەردەکەوێت.

سەرەتا پێویستە ئەوە بهێنمەوە یاد کە کانت، لە بڕگەی فۆرمگەراییدا، لێڕوانین (Anschauung) و هزرین وەك دوو توخمی مەئریفەی ئێمە دیاری دەکات. بەڵام بە دیدی کانت پێویستە لە هەردووکیان کۆتێزێك چێبکرێت. کانت ئەم کۆتێزە بە نموونەی دوو قەد پیشان دەدات کە یەك رەگی هاوبەشیان هەیە. ئەم رەگە بریتییە لە توانستی ترانسسێندێنتالی وێناکردن. رەگەکە ترانسسێندێنتالە، چونکە – بە زمانی هایدێگەر – پەرینەوەیەك لە بوونەوە رووەو بوونەوەر بەدیدەهێنێت. کەواتە

پێویسته ڕەچاوی حاڵەتێك بکەین، کاتێك هایدێگەر له ترانسسێندێنس دەهزرێت، ئەوا لێرەدا له بوونەوەرەوە "بەرەو ژوور" ڕووەو بوون ئاراسته وەرناگرێت، بەڵکو له بوونەوه "بەرەو ژێر" ڕووەو بوونەوەر لێیدەهزرێت. بەدیدی هایدێگەر "ڕاستیی ئۆنتی بەزەرووره بەنده به ڕاستیی ئۆنتۆلۆژیانەوه"، کەواته توانستی وێناکردن توانستێکی ئۆنتۆلۆژیانەیه.

لێڕوانین، وەك چالاکیی ئەمپیری یان سێنسی (مەحسوسی)، بەنده به بابەتی دراوەوه. چالاکییەکه وەرگره (موستەوعیبه / ڕێسەپتیڤه). پێدەچێت ئەمه وەك ڕۆشن دەربکەوێت. بەڵام ناشێت لەم چالاکییه و هزر یان لەم چالاکییه دوایەکییەوه کۆتێزێك چێبکرێت، به پێچەوانەوه بۆ ئەو کۆتێزه لێڕوانینێکی پەتی (که بێگومان ئەویش سێنسییه) پێویسته، بەڵام دەبێت بۆ خاتری هاتنەئارای مەتریفه له خودی ئەم لێڕوانینەش کۆتێزێك چێبکرێت، ئەمەش بێگومان لەلایەن توانستێکی پەتیی ترانسسێندێنتالی وێناکردنەوه. ئێستا ئەم لێڕوانینه پەتییه ڕووناکاته بوونەوەر، بەڵکو ڕوو لەوه دەکات که کانت ناوی دەنێت فۆرمەکانی لێڕوانین — ڕوو دەکاته کات و فەزا (ڕاوم). بەڵام کاتێك ڕێکخراوی فەزایی حاڵەتێکه بۆ سێنسی "دەرەکی"، ئەوا ڕێکخراوی کاتەکی تایبەته به سێنسی "ناخەکی". کانت ئەرکی سەرەکی بۆ چێکردنی مەتریفه دەدات بەم سێنسه "ناخەکییه". هایدێگەریش له فەزلی کاتدا بۆ مەتریفه لەتەك کانتدا یەکدەگرێتەوه و ئەمەش هیچ

مایەی سوڕمان نییە. هایدێگەر دەبێژێت: "لە بنەڕەتدا کات وەك فەزا لە ناخی سەبژێکتدایە" ([56]).

توانستی ترانسسێندێنتالی وێناکردن کە تێگەکان بەرجەستە دەکات، بۆ هایدێگەر ئەو توانستەیە کە نەك تەنیا مەتریفەی بوونەوەر، بەڵکو هەروەها دەرفەت بۆ مەتریفەی بوون دەڕەخسێنێت. بەڵام هایدێگەر لەو بڕوایەدایە بتوانێت پیشانی بدات کە کانت لە چاپی دووەمی 'ڕەخنەی ئاوەزی پەتی'دا لە ئەولەویەتی توانستی ترانسسێندێنتالی وێناکردن کە هیچی دیکە نییە جگە لە "کاتی سەرچاوەیی"، "پاشگەزبۆتەوە". بە گوتەی هایدێگەر، کانت "ڕۆڵی سەرچاوەیی بۆ کۆتێز" داوە بە زەین، بەمەش قوربانیی داوە بەو تێڕوانینە شۆڕشگێڕە کە دەڵێت: کات بوون و مەتریفەی بوون، واتا ئەو قەنائەتە ترادیسیۆنییە کە بوون لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە ئەولەویەتی هەیە، دیاری دەکات.

بەمە گەیشتین بە مەبەستە سەرەکییەکەی هایدێگەر لە ڕاڤەکردنی 'ڕەخنەی ئاوەزی پەتی'دا. ڕاڤەکە بەڵگەیەکە بۆ ئەوە کە هایدێگەر لەم کارەیدا هەوڵ دەدات "بناغەی مێتافیزیك بڕێژێت"، مێتافیزیکیش ئێستا ئەم واتایە دەگەیەنێت: "پرسیار سەبارەت بە بناغەی شیمانەی ناخەکیانەی سەرجەم کرۆکی مەتریفەی ئۆنتۆلۆژیانە". بەڵام ئەم هەوڵە شکست دەهێنێت گەر توانستی ترانسسێندێنتالی وێناکردن وەك "کاتی سەرچاوەیی" و "وەك توانستی خۆیی بناغەیی بسڕێتەوە". هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا هەڵوێست وەردەگرێت و لەدژی ئەم سڕینەوەیە هەوڵ بۆ

---

[56]) Heidegger, Martin: Kant und das Problem der Metaphysik. Frankfurt/Main 1929. S. 52.

بناغەڕشتنێکی راستەقینەی مێتافیزیك دەدات، لێرەشدا بناغەڕشتن واتای "بزووتنی فەلسەفاندن" دەگەیەنێت، بزووتنێك "کە داتەپینی بناغە (Grund) و بەمەش نابناغە (Abgrund)ی مێتافیزیك ئاشکرا دەکات". نابناغە دوایەکێتییە لەنێو مرۆڤدا، هەروەها بریتییە لە زەرووڕەی پرسیار سەبارەت بە دوایەکێتی. ئەم دوایەکێتییە ئەدگارێکی بەڕێکەوتی مرۆڤ نییە، بەڵکو ئەدگارێکی جەوهەرییە، ئەمەش بۆیە ئاوهایە، چونکە مرۆڤ بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت بەبێ تێگەیشتنێکی بوون ببێت، تێگەیشتنیش هیچی دیکە نییە جگە لە تێگەیشتنی دوایەکێتی. "سەرچاوەییتر لە مرۆڤ، دوایەکێتیی دازاینە لەنێو ئەو خۆیدا" ([57]). بەمەش گەیشتین بەو ئۆنتۆلۆژییە بناغەییە کە هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا گۆڕانی پێدا.

ئێستا ئەوەش روونبۆوە کە بۆچی هایدێگەر ناچار بوو واز لە تەواوکردنی 'بوون و کات' بهێنێت. ئەو لە 'بوون و کات'دا لە دازاینەوە پرسیار لەبارەی بوون دەکات، ئەمەش پرکێشەیە، چونکە ئێستا لێرەوە دەرفەت دەرەخسا بۆ ئەوەی لە سۆنگەی مێتافیزیکی ترادیسیۆنییەوە ناونیشانی 'ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی'وەك دروست دابنرێت، گەر ئەمەش رووبدات، ئەوسا ناونیشانەکە "مرۆڤی بەسەهوودا دەبرد"، چونکە، بە دیدی هایدێگەر، پێویستە "هزرین لە راستیی بوون" کایەی ئۆنتۆلۆژی جێبهێڵێت و لە دوایەکێتیی بوونەوە لە بوون بهزرێت. هایدێگەر هەوڵ دەدات روونی بکاتەوە کە لێرەدا مەسەلەکە روو دەکاتە بوونێکی "دیکە"،

---

[57]) Ebenda, S. 207.

بۆیە کاتێك لە نووسینی 'سەبارەت بە پرسیاری بوون'دا وشەی بوون دەنووسێت، هاوکات زەربی بەسەردا دەهێنێت.

## مێتافیزیك چییە؟

مێژووی بڵاوکردنەوەی موحازەرەی دامەزراندن پیشانی دەدات کە هایدێگەر بە درێژایی چەند دەیەیەك گرنگییەکی زۆری بە مێتافیزیك دابوو: نووسینەکە ساڵی 1929 وەك موحازەرە خوێنرایەوە، 1943 پاشگۆتنێك خرایە سەر چاپی چوارەمی، 1949 بە رێبەرییەك پەرەی پێدرا و 1960 پێکەوە لەتەك هەردووکیاندا (پاشگۆتن و رێبەری) وەك چاپی هەشتەم بڵاوکرایەوە. هایدێگەر بەم موحازەرەیە ئەو پەیوەندییەی گۆڕی و تایبەتێتیی پێدا، کە هزری ئەو لەکاتی وەرچەرخاندا، کەواتە سەرەتای سییەکان، بە مێتافیزیکەوە هەیبوو. هایدێگەر سەرەتا وایدەبینێت کە فەلسەفەکەی لەسەر شێوازێکی تایبەتی درێژە بە ترادیسیۆن دەدات. ئەو لە 'بوون و کات'دا رەخنە دەگرێت: لە مێتافیزیکی ترادیسیۆنیدا هەرگیز بەڕاستی پرسیار لەبارەی بوون نەکراوە، پاشان ساڵی 1949 هەمان رەخنە لە "رێبەری"دا دووبارە دەکاتەوە:

"لەبەر ئەوەی میتافیزیك هەمیشە پێشبینیی بوونەوەر وەك بوونەوەر دەکات، ئەوا لە خودی بوون ناهزرێت" ([58]).

هەر لەم رەخنەیەوە هایدێگەر لە 'ئۆنتۆلۆژییە بناغەییەکە'ی خۆی دەڕوانێت: وەك نوێکردنەوەیەکی شۆڕگێڕانە، بەڵام ئەو لە لایەکی دیکەوە هەوڵ دەدات پەیوەندیی خۆی بە میتافیزیکەوە مسۆگەر بکات. ئەمە بەوەدا دەردەکەوێت، کە هایدێگەر لە موحازەرەی دامەزراندندا دەبێژێت: ئەو ***لەبارەی*** میتافیزیك نادوێت، بەڵکو "پرسیارێکی تایبەتی لەبارەی میتافیزیك دەکات". لێرەدا یەکگرتنەوەیەکمان لەتەك میتافیزیکدا هەیە، بێگومان هێندە نەبێت کە هایدێگەر یەکسەر رێژەیەتیی پێدەدات، ئەویش بەوە کە یەکگرتنەوەکە وەك رواڵەتی دیاریدەکات. پاشان لە پاشگۆتن و رێبەریدا بە هایدێگەرێك دەگەین کە بڕیاری داوە ترادیسیۆن تێکبشکێنێت (destruieren)، بەڵام لێرەدا لەو هەقیقەتە بەئاگایە کە بەم داواکارییە شۆڕشگێڕییەی هێشتا هەر بە ترادیسیۆنەوە پابەند ماوەتەوە. سەرچاوەگرتنێکی نوێی ریشەیی نە لێرە و نە لە جێیەکی دی دەشێت. هێرش بۆ سەر ترادیسیۆن هێشتا هەر پەیوەند بە خودی ترادیسیۆنەوە روودەدات.

ئەوجا هایدێگەر لە پاشگۆتندا بۆ موحازەرەی دامەزراندن دەبێژێت، کە پرسیار لەبارەی میتافیزیك لە خودی میتافیزیك تێپەڕدەکات و پرسیارەکە لە هزرێکەوە هەڵدەقوڵێت کە "هەنگاوی ناوە بۆ نەهێشتنی میتافیزیك"، بەڵام ئەو هزرە سەرەڕای ئەمە "دەبێت تا رادەیەك هێشتا

---

[58]) Heidegger, Martin: Was ist Metaphysik? Frankfurt/Main 1929/1960. S. 8.

هەر بە زمانی ئەوە بدوێت کە پارمەتیی دەدات بەسەر خودی ئەودا زاڵببێت". ئاخر گەر وا نەبێت، ئەوسا بە هیچ شێوەیەك وەك زاڵبوونێکی بەو چەشنە دەرکپێناکرێت. تێکشکاندن (دێستروکسیۆن) و پێکهێنان (کۆنستروکسیۆن) مەرجی یەکترین.

سەرەتا رووەدەکەینە تێکستە سەرەکییەکەی موحازەرەی دامەزراندن بەناوی 'مێتافیزیك چییە؟'. موحازەرەیەکی دامەزراندن گەرەکە ئەو پرۆگرامە پێشکەش بکات کە پرۆفیسۆری نوێ بۆ توێژینەوە و رێبازی خۆی کردوویەتی بە پرۆژە. هایدێگەر بەتەواوی ئەم کارە دەکات. هێرشی ئەو بۆ سەر مێتافیزیکی ترادیسیۆنی، کە ئەو ناوی دەنێت نوێکردنەوەی مێتافیزیك لە ناخەوە، سەرەتا بە شێوەیەکی نیازباشانە ئەوە دیاری دەکات کە بریتییە لە رەفتار و هەڵوێستی ئێمە بەرانبەر بە جیهان و زانستەکان. لێرەدا هایدێگەر رێ بە هیچ جیاوازییەك نادات لەنێوان واتا (مەغزای لە هزردا دەربڕراو) و شتدا کە واتا رووی تێدەکات، ئەمەش گرنگییەکی سەنترالیی هەیە. "فێنۆمێنۆلۆژی" بۆ هایدێگەر ئەو واتایەی دەگەیاند و دەگەیەنێت کە بانگەوازی "خودی شتەکان" هیچ واتایەکی دیکەی نییە جگە لە دەرووی ئێمە رووەو شتەکان.

هایدێگەر، دەرچوو لە 'بوون و کات'ـەوە و هاوکات بە هەڵوێستێکی رەخنەیی بەرانبەر ئەم ئیشەی، لە واتای هیچ / نابوون (das Nichts) دەتوێژێتەوە. ئەو دەبێژێت: زانستەکان کە "بوون بە سۆزی ئێمە"، هێشتا هەر لە رووی دەربوونی پراکتیکیمانەوە رابەرن، بەڵام ئەوان "هیچ" رەتدەکەنەوە و لەبەر ئەم هۆیە کەم یان زۆر یەکلایەنین. ئەوان

دەرهەقەتی هەڵکەوتی دۆخی بوون نایەن – بوون کە بێگومان هاوکات هیچە. بۆ زانستەکان کە لە بوونەوەر دەتوێژنەوە، هەمیشە لەکاتی توێژینەوەیاندا لە بوونەوەر "شتێك" وەك پاشماوە دەمێنێتەوە. ئەم پاشماوەیە، بەگوێرەی ئاشنایەتیمان بە 'بوون و کات'ـەوە، بریتییە لە بوون، بەڵام ئێستا پاشماوەکە بوون نییە، بەڵکو بریتییە لە هیچ / نابوون. سەرلەنوێ دیاریکردنەکەی هایدێگەر بە رواڵەت وەك نیازباش دەستپێکردەوە: "زانستەکان پێویستە تەنیا لە بوونەوەر بتوێژنەوە و – هیچ –ی دی؛ تەنیا بوونەوەر و – هیچ – ی دی؛ بەتەنیا بوونەوەر و جگە لەوە – هیچ". لەم دەربڕینەوە کە بە رواڵەت وەك پووچ دەردەکەوێت، رەوتی هزرۆکەکان درێژدەبێتەوە، ئەویش بەوە کە ئێستا دید بۆ سەر جیهانێك لە پشت جیهانی بە ئێمە ئاشناوە ئاوەڵا دەبێت. هایدێگەر لە سەرەتای موحازەرەکەیدا، کاتێك لە هێگل دەدوا، گۆتی: "گەر لە زەینی سەلیمی مرۆڤەوە بڕوانین، ئەوا فەلسەفە 'جیهانی ئاوەژوو'ە". گنۆزیس کە هایدێگەر لە ماربورگ لای یۆناس ناسیی، گریمانە دەکات: ئەو جیهانە کە ئێمە تێیدا دەژین، جیهانێکی چەوتە. هەروەها هایدێگەریش لە موحازەرەی 'کێشە بناغەییەکانی فینۆمێنۆلۆژی'دا (زەمێستەری هاوینەی 1927) دەبێژێت:

"لەبەر ئەم هۆیە ئۆنتۆلۆژی یان فەلسەفە بەگشتی، بە پێچەوانەی زانستەکانی بوونەوەرەوە، زانستی رەخنەییە یان زانستی جیهانی ئاوەژووە" ([59]).

---

59) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 23, S. 24; siehe auch S. 27.

ئێستاش هایدێگەر پیشانی دەدات کە چ جیهانێکی راستەقینە خۆی لە پشت جیهانی ئاوەژووەوە حەشارداوە - ئەوە بێگومان جیهانی فەلسەفە نییە، بەڵکو جیهانی هزرە. گەر بمانەوێت ئەم جیهانە ببینین، ئەوا دەبێت ئاوەژووەکە سەرلەنوێ ئاوەژوو بکەینەوە، ئەوجا دەبینین کە "تەنیا نەرێنیکردن و نییە (das Nicht) هەن، ئەویش چونکە هیچ ( das Nichts) هەیە". هایدێگەر دەبێژێت: "هیچ لە نییە و نەرێنیکردن سەرچاوەییترە" ([60])، هەروەها لە پاشگۆتندا روونی دەکاتەوە کە "ئەم هیچە وەك بوون بەکرۆکدەبێت (ڤێزت / west)" ([61]).

ئێمە دەبینین کە هایدێگەر لە "هیچ"ی بە سمۆڵ نووسراو (واتا: nichts) هیچ / نابوون (das Nichts) تێدەگات، لێرەشەوە وەك "نەرێنیکردنی تەواوەتیی هەمەکێتیی بوونەوەر" دیاریدەکات، بەمەش خۆپەرچیویی (Selbstreflexivität) کە لە پەرچاندنی خۆیدا دراو (das Gegebene) بە نەرێنیکردنی دەخاتە ژێر پرسیارەوە، وەك هێزی بەردەوام کارا دیاریدەکات. ئەمە لە تێگەیشتنی هایدێگەرەوە بۆ بوون، کە هاوکات بریتییە لە "بەکرۆکبوون / ڤێزن / wesen" (بێگومان نەك وەك ئیدێی سرەوتووی پلاتۆنی، بەڵکو وەك کردار (Verb) و بەمەش وەك روودان)، سەرەنجامێکی لۆگیکییە. دێتەوە یادمان: ئێمە چەند بناغەیی و چەند زۆر لە بوونەوەر بتوێژینەوە، هێشتا هەر بوون نابینینەوە. هاوشێوەی ئەمە: ئێمە چەند زۆر "هیچ" (nichts) لە جیهانی ئەمپیریدا ئاشکرا بکەین، هەرگیز بە هیچ / نابوون (das Nichts) ناگەین. ئۆنتێتی و

---

[60]) Heidegger, Martin: Was ist Metaphysik? Frankfurt/Main 1929/1960. S. 28.
[61]) Ebenda, S. 45.

ئۆنتۆلۆژێتی لە بناغە و نابناغەوە جیاوازن لە یەکتری. بێگومان ئاشکرایە کە بوون "بوونمەزنترە" لە بوونەوەری بەرێکەوت و تایبەت بە لەناوچوون، بەڵام ئەمە هەروەها چواندنی بۆ هیچیش هەیە.

با بڕوانین کە چۆن هایدێگەر درێژە بە لێهزرینەکانی خۆی دەدات. سەرەتا هایدێگەر گرنگی بە جیاوازیکردنێك دەدات لە نێوان: رەچاوی تاکە بوونەوەر لە لایەن ئێمە کە هەمیشە وەك هەبوو لەنێو سەرجەمێکی گشتگیردا ئەزموونی دەکەین، هەروەها ناڕاستەوەرگرتنی ئێمە رووەو ئەو سەرجەمە کە شتێکە ئێمە ناتوانین بیکەین بە بابەتی پێوەخەریکبوون و دیاریی بکەین. بێگومان ئەمەی دوایی واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە گوایە ئێمە نەتوانین ئەزموونی ئەو سەرجەمە بکەین، بە پێچەوانەوە. هایدێگەر بۆ ئەم ئەزموونکردنە ئاماژە بۆ سێ نموونە دەدات کە بریتین لە وەڕسی و خۆشەویستی و سام. "وەڕسیی قووڵ کە لەنێو نابناغەکانی دازایندا وەك تەمێکی بێدەنگ بەملا و لادا دەتەنێتەوە، هەموو شتەکان و مرۆڤان و لەتەکیاندا هەروەها خودی کەسێك بۆ بێباکییەکی سەیر کۆدەکاتەوە". هایدێگەر لە نموونەی خۆشەویستیدا کەمتر وشەی هۆنەریانەی پێدەدۆزرێتەوە. ئەو لەم پەیوەندییەدا تەنیا ئاماژە بۆ ئەوە دەدات کە ئامادەیی مرۆڤێکی خۆشەویست بریتییە لە "شیمانەی دیکە بۆ دەرکەوتنێکی بەو چەشنە"ی سەرجەم.

هایدێگەر ئەو جۆر و شێوازە کە تێیدا سەرجەم شیاوی ئەزموونکردنە، ناودەنێت میزاج (Stimmung) یان میزاج-مەندی (Gestimmt-sein). میزاج فێنۆمێنێکی فیزیکی نییە، هەروەها هەستێکی خۆیی نییە. ئاخر

نەشیاوە سەرجەم لەنێو بڕیارێکدا دیاریبکرێت، بەڵکو تەنیا ئەزموونەکرێت. ئەو میزاجە کە تێیدا سەرجەم بە شێوازێکی تایبەتی (هایدێگەر ناوی دەنێت سەرچاوەییتر) و بەمەش باشتر وەك لە حاڵەتی وەرسیدا شیاوی ئەزموونکردنە، بریتییە لە سام (Angst). هایدێگەر بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە کە مەبەستی ئەو لێرەدا میزاجی رۆژانە نییە، جەخت دەکات کە سامی بنەڕەتی تەنیا ساتەکییە. دێتەوە یادمان کە ئەرپستۆتێلیس بالآترین فۆرمی مەئریفە، واتا تێگەیشتنی ئاوەزمەندانەی تێگەیشتن (نۆئێزیس نۆئێزووس)، هەروەها وەك ئەزموونێکی ساتەکی، یان دەتوانین ببێژین: وەك ئەزموونێکی ئەوپەڕی نزیك، دیاری دەکات. هایدێگەر دەبێژێت: دازاین لە سامدا ئەزموونی هیچ دەکات. "هیچ خۆی لەنێو سامدا ئاشکرا دەکات"، بەمەش واتای بوونەوەر وەك سەرجەم لە چواندن دەکەوێت. بەڵام ئێستا هایدێگەر هەنگاوێکی گرنگ دەنێت و دەبێژێت: لەچواندنکەوتنی بوونەوەر وەك سەرجەم بریتییە لە "کرۆکی هیچ. ئەوە خودی هیچە کە دەهیچێنێت (nichtet)" ([62]). رودۆلف کارناپ کە سەر بە ئەڵقەی پۆزەتیڤیستە لۆگیکییەکان بوو، ئەم ئیدێیەی وەك بێمەغزا دانا. بەڵام ئەم هەنگاوەی هایدێگەر لە بنەڕەتدا گرنگە، چونکە ئەو ئێستا نەك تەنیا ئاماژە بۆ کاریگەریی هیچ دەدات، بەڵکو ئەم کاریگەرییە وەك خۆپەرچیویی (Selbstreflexivität) دادەنێت. ئەو دەیەوێت بە ئیدێی خۆپەرچیویی روونی بکاتەوە کە ترانسسێندێنس

---

[62]) ئەم رستە بەناوبانگەی هایدێگەر واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە هیچ چالاکە، "پەچەی بوونە"، و ئێمە دەتوانین لە پشت ئەم پەچەیەوە و بەرێیەوە لە بوون بڕوانین. (ك.ج.)

چییه. ئێمه بەم شێوەیە گەیشتن بەو پرسیارە سەنتراڵییە کە هایدێگەر لە موحازەرەی زەمێستەری هاوینەی 1935دا دەیکات.

## رێبەرییەك بۆ مێتافیزیك

پرسیارە بناغەییەکەی مێتافیزیك و ئەم موحازەرەیە، راستەوخۆ پەیوەند بە لایبنیتسەوە، ئەمەیە: "بۆچی بەگشتی بوونەوەر هەیە نەك بە پێچەوانەوە هیچ؟" ([63]). ئێمە بە تێڕوانینی هایدێگەر ناتوانین راستەخۆ لەتەك ئەم پرسیارەدا خەریك ببین، بەڵکو پێش ئەوە پێویستە پرسیارێکی دیکە بکەین: "ئایا پرسی بوون چۆنە؟"، بەڵام ئەم پرسیارە لەبارەی بوون بە هیچ شێوەیەك ستراتیژییەکی ئامادەکەر نییە و پرسیارکەر بهێنێتە نێو کێشەکەوە، هەروەها پرسیارێکی مێتۆدۆلۆژیانەش نییە، بە پێچەوانەوە مەسەلەکە لێرەدا هیچی دیکە نییە جگە لە قەدەری ئەوروپا، جیهان، "لێرەشدا دەربوونی مێژووییمان وەك چەقی ئەوروپا دەردەکەوێت" ([64]). ئەم چەقە شوێنێکە کە لە مەترسیدایە. رووسیا و ئەمەریکا فشار بۆ ئەوروپا دەهێنن، هەردووکیان لە رووی مێتافیزیکییەوە وەك یەکن. چ لێرە و چ لەوێ "هەمان هەڵپەی ناکامیانەی تەکنیکی

---

[63]) Heidegger, Martin: Was ist Metaphysik, S. 23.
[64]) Heidegger, Martin: Einführung in die Metaphysik, Tübingen 1935, S. 32.

بەردراو و ڕێکخراوی بێزەمینەی مرۆڤانی ئاسایی سەروەرە" ([65]). کەواتە پرسیار لەبارەی بوون پرسیارێکی ئەبستراکتی فەلسەفەیی نییە، بەڵکو پرسیارێکی ئەوپەڕی سیاسی و دەربوونییە. ئەوجا هایدێگەر ئەم پرسیارە لەبارەی قەدەری ئەوروپا دەلکێنێت بە پرسیارەوە لەبارەی مرۆڤ. بەڵام دەبێت سەرەتا جەخت بکەین کە پرسیار لەبارەی بوون پرسیارێکی مێژووییە، واتا ئێمە پێویستە لە پرسیارکردنی ئەمڕۆمان پرسیارێك تێبگەین کە بە ئاڕاستەی ترادیسیۆن کراوە، کەواتە بە ئاڕاستەی پرسیارە ترادیسیۆنییەکە لەبارەی ڕاستی کراوە. هایدێگەر سەرەتای ئەم پرسیارکردنە لە فەلسەفەی پێشسۆکراتیدا دادەنێت. لە نێوەندی ئەم هزرەدا پرسیار سەبارەت بە ***فیزیس*** خۆی دەبینێتەوە. فیزیس بۆ هایدێگەر بریتییە لە "خودی بوون کە بەرێیەوە بوونەوەر شیاوی ڕەچاوکردنە و (وەك شیاوی ڕەچاوکردن – و) دەمێنێتەوە". بەڵام قەدەری ئێمە ئەوەیە کە لەتەك پلاتۆن و ئەریستۆتێلیسدا، پاشان بە وەرگێڕانی فیزیس (ی گریکی) بۆ سروشتی (ناتورای) لاتینی، نامۆبوونی کرۆکیانە و داوەشانی فەلسەفەی گریکی دەستیان پێکرد و هەتا نوێسەردەم بەردەوام دەبن ([66]).

ئەمە بەتایبەتی لەوەدا دەردەکەوێت کە بە وەرگۆڕینی واتای فیزیس چی لە لۆگۆسی گریکی دێت. واتای لۆگۆس بە تێڕوانینی هایدێگەر بریتییە لە خڕکردنەوە، پەیڤینی دروست، ڕوودانی نەشارراوە. کەواتە لۆگۆس لە بنەڕەتدا ڕاستییە (Wahrheit). بەڵام پاشان واتاکەی بە سەرەنجامێکی

---

[65]) Heidegger, Martin: Einführung in die Metaphysik, S. 28.
[66]) Ebenda, S. 10.

ستەمەوە وەردەگۆڕرێت، لۆگۆس دادەوەشێت، واتا دەبێت بە گۆتە، بڕیار (فچیە)، بەمەش دەبێت بە دروست (صحیح)ی پەتی، بە جیاکردنەوەی دروست و هەڵە. "دروست" ئەو واتایە دەگەیەنێت (ئێمە دەبێت بەم شێوەیە لە هایدێگەر تێبگەین) کە مەسەلەکە چیدی ڕووناکاتە راستی، بەڵکو تەنیا روودەکاتە زانیاری (ئینفۆرماسیۆن - و). زمان دەکرێت بە ئامراز. وەڵامی ئەو پرسیارە، کە داخۆ چۆن مرۆ بتوانێت بۆ وێستگەی شەمەندەفەر بڕوات، دەبێت بە دەسوێژ بۆ مەبەست.

هایدێگەر لەدژی ئەم زمانە کە بە دیدی ئەو زمانی ئاڵوگۆڕی زانیارییە، زمانی بوون، زمانی نەشارراوە، دادەنێت. زمان وەك ئاڵوگۆڕی زانیاری، جیابوونەوەی سەبژێکت و ئۆبژێکت لە خۆ دەگرێت: لە بڕیاردا شتێك لە لایەن کەسێکەوە لەبارەی شتێك دەگۆترێت. بەڵام زمانی نەشارراوە و راستی و پرسیارکردنی بنەڕەتی، زمانێکی خۆڕاگەیەنەرە (selbstreferentiell). لەنێو ئەم زمانەدا پرسیارکردن و پرسیارکراو و پرسیارلێکراو یەکێتییەکی نەشیاوی پەرتکردن پێکدەهێنن. گەر زمانی بەئامرازکراو زمانی "سەرچاوەیی" بچەپێنێت، ئەمەش نەك تەنیا لەو مەغزایەدا کە زمانی سەرچاوەیی دەخرێتە کەنارەوە، بەڵکو لەو مەغزایەشدا کە ئەو زمانە "لەیاددەچێتەوە"، ئەوسا ئیتر هیچ دەرفەتێك نامێنێتەوە بۆ ئەوەی بەگونجاوی موخاتەبەی بوون (راستی) بکرێت و بهزرێنرێت. هزری هایدێگەر، بەگوێرەی خۆتێگەیشتنی ئەو، هەوڵێکە بۆ ئەوەی بوون لەم لەیادچوونەوەیە رزگاربکرێت. لەبەر ئەوەی وەرگۆڕینی واتای راستی بۆ دروست (صحیح) یەکسەر لەتەك سەرەتای مێتافیزیکدا روویداوە، ئەوا سەرجەم مێژووی مێتافیزیك بریتییە لە مێژووی

نەهەنگاوتنی راستی. بێگومان هایدێگەریش لە هزری خۆی هزرێکی مێژوویی تێدەگات، واتا هزری ئەویش ناتوانێت خۆی بخاتە دەرەوەی مێژوو، کەواتە ئەو گۆڕانە چەوتە هەمیشە ئەمیش دەگرێتەوە، بەڵام هێندە نەبێت کە هایدێگەر هاوکات هەوڵ دەدات هزری خۆی لە دانانی راستی بە دروست، بوون بە بوونەوەر، رزگار بکات، لێرەشدا ئەو بەجەختی داوا دەکات، کە دەبێت هزری ئەو ناوبنرێت مێتافیزیك. هایدێگەر بەم داواکارییەی دەیەوێت پیشانی بدات کە ئەو بەردەوام بەئاگایە لە نەبوونی شیمانەی قوتاربوون لەم میراتە، بەڵام سەرباری ئەمە بڕیاری داوە خۆی لێ رزگار بکات.

کەواتە ئێستا واژەی "مێتافیزیك" بووە بە واژەیەکی دوواتایی. ئەم واژەیە نیشانەیەکە بۆ دارمانی هزر و هەروەها بۆ دووبارەکردنەوەی سەرەتای پێشسۆکراتییەکان، ئەم دووبارەکردنەوەیەش هەوڵێکە کە هایدێگەر دەیدات بۆ ئەوەی بەگونجاوی پرسیار لەبارەی بوون (بێگومان نەك تەنیا لەبارەی بوونی بوونەوەر) بکات. بەڵام ئێمە ناتوانین بە مێتۆدە باوەکانی فەلسەفە لە دوواتایی ئەم مێژووە دەرباز ببین، ئێمە بە مێژوویەکەوە پابەند دەمێنینەوە کە هایدێگەر وەك "تەزماندنی جیهان" ئەزموونی دەکات. ئێمە ئەزموونی "هەڵاتنی خوداکان، کاولکردنی زەمین، توانەوەی مرۆڤ لەنێو جەماوەردا و فەزڵی مامناوەندێتی دەکەین" ([67]).

بەڵام کاتێك ئێمە "بە یەکەم رستە هەوڵ دەدەین لەم کایەیە دووربکەوینەوە، بۆ ئەوەی پرسیارکەرانە کایەیەکی دی بهێنینە بەر

---

[67]) Heidegger, Martin: Einführung in die Metaphysik. Tübingen 1935. S. 15.

دیدمان"، ئەوا سەرەڕای ئەم هەوڵەمان هێشتا هەر بەم دۆخەوە پابەند دەمێنینەوە. کەواتە مەسەلەکە بریتییە لە هەڵوەشاندنەوە (دێکۆنستروکسیۆن / avant la lettre). ئێمە بە چەشنێك رووبەڕووی ترادیسیۆن، کە ئێمە هەڵە تێکدەشکێنین بۆ ئەوەی رێگەیەك بۆ راستی خۆش بکەین. بەڵام ئەمە بۆ هایدێگەر، وەك چۆن ئەو لە جێیەکی دیکەدا دەبێژێت، واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە گوایە دەبێت هەڵە تەنیا بە شێوەیەکی نێگەتیف بنرخێنرێت. ئاخر ئەوە هەڵەیە کە دەمانبزوێنێت بۆ ئەوەی پرسیار لەبارەی بوون بکەین.

بێگومان ئێمە ناتوانین لەنێو چێوەی پارادیگما کۆنەکاندا ترادیسیۆن لەکاربخەین. ئەمە روونیدەکاتەوە کە بۆچی هایدێگەر بەئاشکرا دەبێژێت، ئێمە ناتوانین خۆمان راستەوخۆ بە پرسیارە پێشیانییەکەوە لەبارەی بوون خەریك بکەین، ئێمە ناچارین پەیوەندیمان بە ترادیسیۆنەوە بپچڕێنین. با ئەمە بە مێتافۆر روونبکەینەوە: کاتێك ئێمە پرسیار دەکەین، ئەوا دەبێت بازێك بدەین – بازێك لە کاتەوە کە وەك کاتی بەردەوام رەوتبەستوو دیاریکراوە. پرسیارکردن وەك بازدان هاوکات لەنێو بازداندایە، بریتییە لە یەکەم بازدان (Ur-sprung) و وەك ئەمەش بازدانە بۆ نێو بناغە، کە وەك پێشتر بینیمان، هاوکات نا-بناغەیە (Ab-grund). جگە لەمە ئەو پرسیارکردنە کە هایدێگەر لێیدەڕوانێت، پرسیارکردنێکی خۆڕاگەیەنەرە (selbstreferentiell). پرسیارکردن تەنیا ئەکتی پرسیارکردن نییە، بەڵکو هاوکات پرسیارکراو و پرسیارلێکراوە. هایدێگەر ئەم خۆڕاگەیاندنە لە هەشتەم فراگمێنتی پارمێنیدێسدا دەبینێتەوە.

پارمێنیدێس لەم فراگمێنتەدا لەوە دەدوێت کە "تێگەیشتن (noein) و ئەوەش کە لێتێگەییوە (noema)"، وەك یەکن.

هایدێگەر لە چوار رووەوە پرسیار لەبارەی بوون رووندەکاتەوە: 1) بوون و ئارایی، 2) بوون و دیاردە، 3) بوون و هزر، 4) بوون و گەرەك ( das Sollen). هایدێگەر ئارایی و دیاردە، هزر و گەرەك، ناودەنێت ئاستەنگ، چونکە گەر ئێمە بمانەوێت بوون بهزرێنین، ئەوسا ناچارین هەمەلایەنێتیی بوون کورتبکەینەوە بۆ ئەم روانگە تایبەتییانە، بەڵام لێرەدا ئەم هزرە هێشتا هەر کورتهێن دەمێنێتەوە، چونکە ئێمە هێشتا هەر لە بوونەوەردوە دەهزرێین و بەمەش گونجاو بە ترانسسێندێنس ناهزرێین. کەواتە بوون "لە سەرچاوەدا" بەشنەبووە و دەستپێڕاگەیشتنێکی بەزەبر پێویستە بۆ ئەوەی ئەم هەمەلایەنێتییە بکاتەوە.

هایدێگەر لەبارەی ئاستەنگەکانی بوون دەبێژێت کە ئەوان نەك تەنیا فۆرم بە فەلسەفە دەدەن، بەڵکو هەروەها بە سەرجەم زانین و گۆتن و کردارمان. ئێمە لێرەدا بە پێویستی نازانین خۆمان بە هەریەکەی ئەو ئاستەنگانەوە خەیك بکەین، بۆ ئەم روونکردنەوەیەی مێتافیزیك (بێگومان مێتافیزیك لەو واتایەدا کە هایدێگەر لێیتێدەگات) کە لێرە ئەنجامی دەدەین، شرۆڤەی بوون و هزر گرنگترینە. هایدێگەر لەم شرۆڤەیەدا روودەکاتەوە پارمێنیدێس و هێراکلیتێس، لەم هەنگاوەشدا لێهزرینەکانیان دەناسێنێت، بەڵام ئەو لە شرۆڤەکەیدا بەتایبەتی پشت بە پێنجەم فراگمێنتی پارمێنیدێس دەبەستێت کە تێیدا دەگۆترێت، بوون و

هزر یەکن. هایدێگەر بە شێوازێکی سەرنجڕاکێش راڤەی ئەم گۆتەیە دەکات و پیشانی دەدات کە چۆن ئەو هزری سەرچاوەیی پێشسۆکراتییەکان و داوەشانی ئەو هزرە دەنرخێنێت.

ئێمەی مۆدێرن نزیکەی دەتوانین لە جیابوونەوەی بوون و هزر تێبگەین، لایەنی کەم ئەو کاتە کە ئێمە لە بوون داکەوت و لە هزر چالاکییەکی زەینمەندانە (ئینتەلەکتوێلی - و) تێدەگەین. هایدێگەر وای دەبینێت کە تێزەکەی پارمێنیدێس لەمەڕ یەکایەتیی بوون و هزر بەڵگەیەکە بۆ "پێکەوەبوونی ناخەکی"یان، ئەمەش واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە یەکایەتییەکی سەرچاوەیی هەبووە و هزری سەردەمانی درەنگتر چیدی نەیتوانیوە بیهزرێنێت، هزر یەکایەتییە سەرچاوەییەکەی لە یەك جیاکردۆتەوە، واتا کردوویەتی بە هزری ئامرازی و داکەوت، بەمەش رێی لە خۆی گرتووە بۆ ئەوەی بەڕوونی یەکەم بازدانی (Ur-sprung) هزر یان سەرەتای هزر، واتا نەشارراوەیی کە بەرێی لۆگیکی نوێسەردەمەوە بزربووە، پێشبینی بکات.

هایدێگەر ئەم تێزە بەوە روون دەکاتەوە کە هزر لای پلاتۆن و ئەرِیستۆتێلیس پێشبینیی بوون دەکات ("vor-stellt" / لە بەردەم خۆی دادەنێت - و). هزر لای ئەوان هاوتا دادەنرێت بە فۆرمی بڕیار، ئەمەش بە ئێمە ئاشنایە. لە بڕیاردا بابەتێك یان رەوشێك بەرجەستەدەکرێت، پێش-بینی و دیار و پێناسە دەکرێت، بەمەش سەبژێکتێك کە دەهزرێت و ئۆبژێکتێك کە هزرین لەبارەی ئەنجام دەدرێت یان بڕیار بەسەریدا دەدرێت، لە یەکتری جیادەکرێنەوە. بەڵام ئەوە کە بۆ تێگەیشتن لە

بوونەوەر و بڕیاردان بەسەریدا کێشە نییە، بۆ هزری بوون کێشەیە، چونکە بوون بوونەوەر نییە، لەپێشخۆدانراو (Gegen-stand = بابەت) نییە. لۆگیك کە پلاتۆن و دوای ئەو ئەرِیستۆتێلیس گۆڕانیان پێدا، بە تێڕوانینی هایدێگەر بەرپرسیارە لەم گۆڕانە. ئایا چۆن لە سەردەمانی درەنگتردا دەسەڵاتی لۆگیك چەسپی؟ هایدێگەر تا رادەیەك کتوپڕ وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە؛ ئەم دەسەڵاتە هاتە ئاراوە، چونکە چیدی نەدەشیا راستیی سەرچاوەیی رستە راگیربکرێت. کەواتە تەنیا ئەوە دەتوانێت بە دەسەڵات بگات، کە چیدی (لە مەغزای سەرچاوەییدا) راست نییە. راستی تەنیا بۆ ئەو "بەهێز"انە هەیە کە دەتوانن بەرهەڵستیی چواندنی بەگشتی ناسێنراوی بڕیارە سەروەرەکان بکەن. ئەوان دەتوانن لە جووتبەهایی و دژبێژییەکان وەك نیشانەی راستییەکی سەرچاوەیی تێبگەن و لە بەردەم زەبرە سەروەرەکەی یاساغی دژبێژیی لۆگیکیدا چۆك دانەدەن. ئەم بەرهەڵستییە پێویستە، ئەویش تەنیا بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت لەنێو "یەك‌ێتیی سەرچاوەییدا" بەرگەی "زەبری گرژییەکەی دژەتەقەلا" بگرێت. بەڵام ئێستا پێویستە بپرسین، داخۆ پێکهاتەی "بەهێزەکان" چۆن بێت تاکو بتوانن بەرگەی ئەم دژبێژییانە بگرن.

هایدێگەر لە یەکەم گۆرانیی کۆری 'ئەنتیگۆنە'ی سۆفۆکلێسدا (دێڕی 334-333) روانین لە کرۆکی مرۆڤ دەبینێتەوە. لەوێدا دەگوترێت: "زەبەلاح زۆرە، بەڵام هیچ شتێك لە مرۆڤ زەبەلاحتر نییە". بەڵام وەرگێڕانەکەی هایدێگەر بەم چەشنەیە؛ "ترسناکی هەمەلایەنییە، بەڵام هیچ ترسناکترێك لە سەرووی مرۆڤەوە ناجمێت". بەم پێیە مرۆڤ نەك تەنیا خاوەنی زەبرە، بەڵکو ئەو لە جەوهەرەوە بە-زەبرە، چونکە، بە

-یدی هایدێگەر، مرۆڤ بۆ خۆزاڵکەریی بوونەوەر و بەمەش بۆ بوون فرێدراوە. دازاین ناتوانێت خۆی لە بوون ئازاد بکات، چونکە هەردووکیان مەرجی یەکترین. دازاین بۆ ئەوەی بتوانێت خودی خۆی بێت، دەبێت خۆی بۆ شەڕی (یان زۆرانی، وەك هایدێگەر خۆڵکاندوو بە هێراکلیتێسەوە دەبێژێت) شاردنەوە و ئاشکراکردن، کەواتە: راستی، بەربدات. مەسەلەکە لە کۆتاییدا شەڕی بوون و هیچە/نابوونە. بەتایبەتی لەم شەڕەدا، لەم دژمتەقەلایەدا، بوون و دازاین بەیەکدەگەن و لە یەکتری جیادەبنەوە. هایدێگەر ئەم بەزەبرییە (deinon) وەك نەشارراوەیی (-das Un heimliche) یان تەنانەت وەك نەشارراوەییترین نەشارراوەیی وەردەگێڕێت، ئەمەش بێگومان نەك لەبەر ئەوەی مەسەلەکە بۆ ئەو نرخاندنێکی هەستمەندانەیە، نەخێر، ئەو ئەم کارە دەکات بۆ ئەوەی رایبگەیەنێت کە پچڕانێکی ریشەیی لە ئاشنایەتی (لە ئەوە کە بە ئێمە ئاشنایە)، لە خۆماڵێتی و لەمەترسیدانەبوون، هەیە. سرەوتن و وشکهەڵهاتن و مسۆگەری هەمیشە نیشانەی ناڕاستی و ناکرۆکێتین. ئێمە گەرەکە لە بوون و دازاین، هەروەها لە پەیوەندییان، تەنیا بە شێوەیەکی مێژوویی، ئەوجا وەك خەبات، بهزرێین. کەواتە ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە لە هیچکوێ لەماڵی خۆماندا نەبین (خۆماڵی نەبین – و) و بەمەش بەردەوام تێپەڕکردوو لە سنوورەکان بهزرێین و کردار بنوێنین. بەڵام بڕینی سنوورەکان ئەو واتایە دەگەیەنێت کە ئێمە بەزەبر بین.

ئێمە دەبێت لەم جێیەدا بەئاگابین لەوە کە هایدێگەر تێگەیشتنێکی تایبەتیی بۆ "زەبر" هەیە: ئەو هەموو شێوەیەکی زەبری مرۆڤ لەدژی مرۆڤ و سروشت رەتدەکاتەوە. زەبرێکی بەم چەشنەی کۆنترۆڵکەر و

چەوسێنەرەوە کە هەموو شتێك دەکات بە بابەت و هەوڵ دەدات بیرووتێنێتەوە، چاو و هزرمان لە بەردەم ئەوەدا دادەخات کە ئێمە زەبری بەسەردا دەنوێنین – هەروەها لە بەردەم خۆماندا. زەبری مرۆڤیی سەرجەم پەیوەندییەکان کورتدەکاتەوە بۆ سەر ئاستی مەبەست-دەسوێژ. ماکس هۆرکهایمەر لە کۆنتێکستێکی ئەوپەڕی هاوشێوەدا لە هزرێك لەوبەر هزری ئامرازییەوە دەدوا، بەڵام دەتوانین کۆنسێپتی کردار لای هایدێگەر وەك کۆنسێپتێك لەوبەر سەرجەم زەبری مەبەست-دەسوێژەوە دیاریبکەین:

"زەبری پەیڤینی هۆنەری، پرۆژەی هزرمەندانە، پێگەیاندنی دروستکەرانە، کرداری ئەنجامدەری دەوڵەتی، ئەمانە چالاککردنی ئەو توانستانە نین کە مرۆڤ هەیەتی، بەڵکو جڵەوگرتن و رێکخستنی زەبرن و بەرێیانەوە بوونەوەر خۆی بەتەواوی ئاوەڵا دەکات، ئەویش بەوە کە مرۆڤ دەچێتە نێویەوە (نێو بوونەوەرەوە – و)" ([68]).

ئافراندن کردارێکی بەزەبرە، چونکە دەبێت فۆرمێنەرانە لەتەك ئەستووی بێفۆرمدا، جا رەنگ بێت، یان دەنگ و بەرد و زمان بێت، مامەڵە بکات. بە دیدی هایدێگەر مرۆڤی ئافرێنەر بە شێوەیەکی زەبرمەندانە دەچێتە نێو لێنەڕوانراو و لێنەهزرراو و نەگۆتراوەوە و بەسەر ئەوەدا زاڵ دەبێت کە شیاوی بینین و هزرین و گۆتنە (...). پێنجەم فراگمێنتی پارمێنیدێسمان دێتەوە یاد کە تێیدا دەگۆترێت بوون و هزر یەکن، هەروەها بینیمان کە ئێمە دەبێت بە شێوەیەکی بزۆك نەك

---

[68]) Heidegger, Martin: Einführung in die Metaphysik, S. 120.

سرەوتوو لەم یەکایەتییە بهزرێین وەك پەیوەندییەکی نێویەکی لەنێوان شاردنەوە و ئاشکراکردندا. ئەم پەیوەندییە نێوەکییە دیاریکردنێکی ئەمسەر و ئەوسەریانەی ناسك نییە لە تەوەرەیەکەوە بۆ تەوەرەیەکی دی، بەڵکو دیاریکردنێکی ئەمسەر و ئەوسەریانەی بەزەبرە. بوون تەواو ژێرخەرە. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم ژێرخەرە بە نەشارراوە بگات، پێویستیی بە هزر و هونەر هەیە. نەشیاوە هەردوو تەوەرەی بوون و هزر بەبێ یەکتری هەبن.

بۆ هایدێگەر ئامادەهێشتنەوەی نەشارراوەی رووکردووە شاردنەوە بریتییە لە مرۆڤبوون. کەواتە ئەمیش راگیرکردنی ئەوە نییە کە جارێك بەدیهێنراوە، بەڵکو پرۆسەیەکە کە بۆ دازاین تەنیا بە مەرگ کۆتایی پێدێت. با ئەمە بە شێوەیەکی دی دەربڕین؛ مەرگ دوایەمین هەڵمەتە لە زۆرانی دازاین لەتەك بووندا. "لێرە-نەبوون باڵاترین سەرکەوتنە بەسەر بووندا" ([69]). بەڵام ئەم سەرکەوتنەش خۆراگەیەنەرە (selbstreferentiell)، چونکە لە باڵاترین کرداری بەزەبری دازایندا دژی خۆی بەدەستدەهێنرێت. بێگومان لە روانگەی هایدێگەر ئەم باڵاترین کردارە بەزەبرە شیمانەیەکی پەتی نییە کە دازاین هەیبێت یان بۆی بەردرابێت، بەڵکو، وەك هایدێگەر دەبێژێت، دازاین بریتییە (ist) لە خودی ئەم شیمانەیە – ئەمەش بەردەوام.

## هایدێگەر – نیتچە – مێتافیزیك

[69]) Ebenda, S. 136.

ئەوە مایەی سوورمان نییە کە هایدێگەر نزیکییەك لەنێوان خۆی و نیتچەدا دەبینێت. هەردووکیان لە هزریاندا ریشەیی بوون، دەیانویست شۆڕشگێڕێتی بە فەلسەفە و کولتوور بدەن، هەردووکیان لەو بڕوایەدا یەکیاندەگرتەوە کە چیدی ناشێت فەلسەفە وەك سیستەم بینابکرێت و هەروەها مێژووی خۆرئاوا بە کارەساتێك تەواو دەبێت، بۆیە هەردووکیان، وەك سەرەنجامی ئەم تێڕوانینە، ئەو بۆچوونەیان هەبوو کە تێکشکاندنی ترادیسیۆنی فەلسەفەیی و کولتووری مەرجێکە بۆ خۆقوتارکردن لەو کارەساتە. نیتچە رەوتی مێژوویی ناودەنا نیهیلیزم، ئەم تێڕوانینەی ئەو پێکەوە لەتەك داواکارییەکەیدا بۆ "لەبەهاخستنی سەرجەم بەهاکان"، بۆ هایدێگەر تەریب بوو بە تێڕوانینەکەی خۆی لەمەڕ "مێژووی لەیادچوونەوەی بوون" و "کشانەوەی بوون" (Seinsverlassenheit). گۆتەی "خودا مردووە"ی نیتچە هایدێگەری هۆشسام کرد و لە راڤەکردنی نیتچەدا ("گۆتاردانی رێکتۆرات") بەئاشکرا هۆشسامی خۆی بە ئەو پیشان دەدات، لێرەشدا نیتچە وەك کەسێك دادەنێت "کە سۆزمەندانە بۆ خودا" گەڕاوە. ئایا ئەو راڤەیەی نیتچە لەلایەن هایدێگەر چواندنی بۆ ئەو خۆی نەبوو کە بۆ بوون (Seyn) دەگەڕا؟

هایدێگەر لە "سالانی بزوێنەر"دا (1910 هەتا 1914) 'ویست بۆ دەسەلات'ی نیتچەی خوێندبۆوە، بەلام ئەو دەمە نەیبینی کە سەرجەم ئیشەکەی نیتچە لە ئایندەدا چ واتایەکی راستەقینە بۆ ئەو وەردەگرێت. دەربڕینی ئەم هەقیقەتە لە 'گۆتاردانی رێکتۆرات'دا یەکەم ئاماژەیە بۆ

ـزیکیی دەروونیانەی هەردووکیان، بەڵام ئێمە هەروەها دەتوانین ئەم ئاماژەدانە وەك تاکتیك بنرخێنین. بە هەر حاڵ، نیتچە بۆ هایدێگەر بریتی بوو لە دوایەمین مێتافیزیکییەك و دەبوو - وەك چون لەدژی سەرجەم مێتافیزیك - لەدژی ئەویش شەڕ بکرێت.

هیچ فەلسەفەیەك هێندەی فەلسەفەی نیتچە سەرچاوەی ئیلهام نەبوو بۆ رەخنەی هایدێگەر لە مێژوو و کولتوور، بەڵام ئەو فەلسەفەیە هاوکات بۆ ئەو تەحەدا بوو. مەسەلەکە لێرەدا راڤەکردن نەبوو، بەڵکو لەیەککردنەوەیەکی (Aus-einander-setzung) خەباتگێڕانە بوو، هەروەها هایدێگەر دەیگۆت کە نیتچە "ئەوی تێکشکاندووە". بەڵام ئەو لێرەش، هاوشێوەی رەخنەکەی لە کانت، درکاندی کە خەریکبوونە هۆشەکییەکەی بە نیتچەوە بەزەبرە. جگە لەمە هایدێگەر لێرەدا خۆی بەتایبەتی بەو کۆمەڵە تێکستەوە خەریکدەکات کە خوشکی نیتچە لەژێر ناونیشانی 'ویست بۆ دەسەڵات'دا بڵاوی کردنەوە و بەو رێیەوە براکەی گەیاند بە ناوبانگێکی جیهانی. بەڵام تەنانەت ئەو کاتە کە پلان بۆ بڵاوکردنەوەیەکی نوێی سەرجەم ئیشەکەی نیتچە دانرا و بۆ ئەو مەبەستە دەستەیەك پێکهێنرا تاوەکو ئیشەکانی نیتچە سابکاتەوە، ئەوجا هایدێگەر وەك ئەندامێکی ئەم دەستەیە بۆی دەرکەوت کە کۆمەڵە تێکستی 'ویست بۆ دەسەڵات' ئیشێکی تەزویرکراوە، هێشتا هەر لە رەوتی خەریکبوونیدا بە نیتچەوە دەستبەرداری نەبوو.

واتای مەزنی سەرجەم ئیشەکانی نیتچە بۆ هزری هایدێگەر بەتایبەتی دوای شکستی ئەو وەك سەرۆکی زانکۆ فرایبورگ دەرکەوت. هەڵوێستی

هایدێگەر دوای "شکست" (Verunglückung)ی 'بوون و کات' کاریگەر بوو لەسەر ئەم واتایەی نیتچە بۆ ئەو. یەکەم بڵاوکردنەوە (1935) کە هایدێگەر تێیدا خەریکبوونی خۆی بە نیتچەوە پیشان دا، بریتی بوو لە نووسینی 'خودا مردووەی نیتچە' لە نووسینی 'Holzwege'دا (1959). ئەوجا 1954 لە 'Vorträge und Aufsätze'دا نووسینێکی بەم ناونیشانە بڵاوکردەوە: 'ئایا زەردەشتەکەی نیتچە کێیە؟'. بەڵام بۆ وەرگرتنی هۆشەکییانەی (رێسەپسیۆنی) نیتچە لە لایەن هایدێگەر پێویستە بەتایبەتی رەچاوی ئەو موحازەرانە بکەین کە ئەو لە نێوان ساڵانی 1936 هەتا 1940 خوێندنیەوە و ساڵی 1961 پێکەوە لەتەك کۆمەڵە تێکستی 'Abhandlungen aus den Jahren 1940/1946' بڵاوکرانەوە. ئەم موحازەرە بڵاوکراوانە، بێگومان بە گۆڕانکارییەوە لە داڕشتنەکەی کاتی خوێندنەوەیاندا، ئەمڕۆ لەنێو سەرجەم ئیشی هایدێگەردا لە بەردەستدان.

هایدێگەر کاتی خۆی نەیتوانیبوو لە 'بوون و کات'دا جێی هونەر بکاتەوە، بەڵام ئێستا لەم پەیوەندییەی ئێرەدا نیازی وابوو لەنێو هزری خۆیدا شوێنێکی گونجاو بۆ هونەریش تەرخان بکات. موحازەرە و گۆتارەکانی ئەو سەبارەت بە سروودەکانی هوێلدەرلین کە لە زەمێستەری زستانی 1934/35 بەدوواوە هەتا 1942 خوێندنیەوە، کەواتە هاوکات لەتەك موحازەرەکانیدا لەسەر نیتچە، بەڵگەن بۆ ئەم تێڕوانینە.

## پۆلیتیك و ئێتیك

"هەڵەیەکی گەورەیە بگۆترێت گوایە لە زانکۆی ئەڵمانیدا رێنەکسیۆن (پاشڤەرۆیی – و) هەیە. هیچ پاشڤەرۆییەك نییە، چونکە هیچ وەرچەرخانێك (شۆڕشێك) لەگۆڕێدا نییە، ئەمیش بۆیە لەگۆڕێدا نییە، چونکە مرۆ هێشتا نەیزانیوە لەکوێوە دەستپێبکات" ([70]).

هایدێگەر و پۆلیتیك – ئەمە بەتایبەتی واتای هایدێگەر و ناسیۆنالسۆسیالیزم (نازیزم) دەگەیەنێت. ئایا هەرگیز کۆتایی بەم بابەتە دەهێنرێت؟ زۆر کەم، چونکە مرۆ دەتوانێت رووداوە مێژووییەکانی سالآنی 1933/34، هەروەها ئەو هەقیقەتانە کە هایدێگەر لە نووسینە رەوایەتیدەرکەیدا بە خۆی ('Tatsachen und Gedanken') دایاندەرێژێت، هەمیشە لەنوێوە و جیاواز بنرخێنێت. بۆیە جێی سوورمان نییە، دوای لێشاوی ئەو گۆتار و کتێبانە کە کەم یان زۆر هێرشبەر بوون، لە سالآنی رابوردوودا دوو کتێب بلاوکراونەتەوە کە تەواو پێچەوانەی یەکترین.

سەرەتا ئێمانوێل فایێ سالّی 2005 نووسینی ( .*Heidegger* *L'introduction du Nazisme dans la Philosophie*)ی بلاوکردەوە. ئەو بەم کتێبە لە چەند کتێبێکی باوکی، ژۆ پیپا فایێ، تێپەڕدەکات، ئەویش بەوە کە دەنووسێت: لە سەرجەم ئیشەکەی هایدێگەردا یەك تاکە رستە نییە کە تێیدا ئەو رەوایەتی بە ناسیۆنالسۆسیالیزم نەدات، بۆیە

---

[70]) Heidegger, Martin:Logik als die Frage nach dem Wesen der Sprache (1934), Gesamtausgabe 38. S. 76.

گەرمەکە ئیشەکانی هایدێگەر لە وانەی فێرگەییدا یاساغ بکرێن و لە کتێبخانەکان (بیبلیۆتێکەکان - و) دووربخرێنەوە. ئەم تێڕوانینەی فایێ بەفراوانی دژبێژی کرا. پاش دوو ساڵ کتێبێکی پێنجسەد لاپەڕەیی بەناونیشانی (*Heidegger à plus forte raison*) بڵاوبۆوە کە تێیدا پازدە پسپۆر هەڵە و چەوتەراڤەکانی فایێ، بێگومان زۆر جار ڕەوایانە، دەسەلمێنن. بێگومان مرۆ بەبێ شارەزاییەکی گشتگیری هایدێگەریش دەتوانێت ببینێت کە تێزەکەی فایێ چەند بێواتایە. بەڵام ئەو هەقیقەتە کە فایێ بە هیچ شێوەیەك نیشان ناپێکێت، هێشتا هەر ڕێژەیەتی بە زەرووەرەیەك بۆ یادهێنانەوەی ئەو هەقیقەتە نادات کە هایدێگەر بە چ شێوەیەکی ئابڕووبەر خۆی لەکاتی سەرۆکێتیی زانکۆ (و درەنگتریشدا) دەربڕیوە.

"بانگەواز بۆ فێرخوازانی زانکۆیی ئەڵمانی" (3ی نۆڤەمبەری 1933)، "کۆبوونەوەی هەڵبژاردنی زانست" لە لایپتسیگ (1ی نۆڤەمبەری 1933)، گۆتاردانێك لە تیوبینگن (30ی نۆڤەمبەری 1933) بەناونیشانی "زانکۆ لە دەوڵەتی ناسیۆنالسۆسیالیستیدا"، هەروەها "بانگەواز بۆ ڕۆشنبیرانی جیهان" (13ی دیسەمبەری 1933) بەڵگەن بۆ ئەوە کە هایدێگەر خۆی سووك و ئاسان خستبووە ژێر ڕکێفی هیتلەر و پارتەوە. نموونەیەك بۆ ئەمە گۆتاردانەکەیەتی بەناونیشانی "بڕواهێنان بە هیتلەر و دەوڵەتی ناسیۆنالسۆسیالیستی" کە 1933 لە درێزدن پێشکەشی کرد.

هایدێگەر درەنگتر هەوڵی دا لە بایەخی رۆڵی خۆی وەك سەرۆکی زانکۆی فرایبورگ و سروودهەڵدانەکانی بەسەر "شۆڕش"ی ناسیۆنالسۆسیالیستی و هیتلەردا کەمبکاتەوە. بەڵام وەك نموونە بۆ بیروباوەڕی هایدێگەر ئاماژە بۆ ئەو گۆتاردانە دەدەین کە ئەو لە بۆنەی یادی ئالبێرت لیۆ شلاگەرتەردا پێشکەشی کرد. شلاگەرتەر ساڵی 1913 لە لایەن سوپای فەرەنسییەوە بە تۆمەتی پیلانگێڕی حوکم دراو و ئێعدام کرا، پاشان نازییەکان بەرزیان کردەوە بۆ سەر ئاستی پاڵەوان. هایدێگەر لە گۆتارەکەیدا مەرگی شلاگەرتەر بە سۆزی ناسیۆنالسۆسیالیستی و مەزنکردنی مێتافیزیکیانەی شفارتسڤالد دەدرەوشێنێتەوە. ئەو بۆ نموونە لە "سەختترین و مەزنترین مەرگ" دەدوێت، یان لە "ویستی پۆڵایین" و "خۆری پاییزەی شفارتسڤالد" کە "دەمێکە خۆراك بە روونیی دڵ دەدات".

هایدێگەر هەروەها بۆ گۆتاردانەکەی بە بۆنەی دامەزراندنیەوە وەك سەرۆکی زانکۆ (ئەپریلی 1933) رایگەیاند کە دەبێت گۆرانیی هۆرست-ڤێسل ببێژرێت و میوانەکان لەکاتی بێژتنی بەیتی چوارەمدا دەستی راستیان بەرزبکەنەوە، جگە لەمە فەرمانی دەرکرد کە دەبێت فێرخوازان و وانەبێژان سەرەتای هەموو موحازەرەیەك دەستی راستیان بۆ سڵاوی هیتلەر بەرزبکەنەوە. ئێمە پێویستە بۆ مەسەلەی یەکگرتنەوەی هایدێگەر لەتەك ناسیۆنالسۆسیالیزمدا رەچاوی ئەو نموونەیە و نموونەگەلی دیکە بکەین، گەر بەڕاستی بمانەوێت وێنەیەك سەبارەت بە هەڵوێستی ئەو لەکاتی دیکتاتۆریی هیتلەردا چێبکەین، ئێمە دەبێت لێرەدا رەچاوی ئەوەش بکەین کە گەرچی کرداری بەزەبر لەدژی جولەکە

بەگەڕخرابوو، بەڵام جارێ ئەگەری زۆر گۆڕانی دی کراوەبوو. زۆر کەس، تەنانەت ئەو هاوچەرخانە کە بەتایبەتی هەستیان بە دۆخی سیاسیی ئەو دەمە دەکرد و کێشەکان راستەوخۆ ئەوانیان دەگرتەوە، لەوانە ماکس هۆرکهایمەر، تیۆدۆر ڤ. ئادۆرنۆ و ڤیکتۆر کلێمپەرەر، بە هیچ شێوەیەك باوەڕیان نەدەکرد ئەو ئامانجانە بەدیبهێنرێن کە هیتلەر پرۆپاگەندەی بۆ دەکردن، جا ئەخوازە بیتوانیایە ماوەیەکی درێژخایەن وەك کانسلەر بمێنێتەوە.

ئێمە پێش هەموو شتێك هەوڵ دەدەین لەم جێیەدا روونی بکەینەوە کە داخۆ یەکگرتنەوەیەکی سیستەماتیکی لەنێوان هزری هایدێگەر و گرنگترین ئامانجە ئیدیۆلۆژییەکانی ناسیۆنالسۆسیالیزمدا هەبووبێت، کەواتە داخۆ پەیوەندییەکی تایبەتی لەنێوان هەردووکیاندا هەبووبێت. پاشان پێویستە پرسیار بکرێت، کە هەتا چەند هەڵوێستی سیاسیی هایدێگەر کاریگەریی لەسەر ئێتیکەکەی ئەو (گەر ئەو ئێتیکی هەبووبێت) نواندووە. من لەم جێیەدا تەنیا دەتوانم بەگشتی رووبکەمە پرسیارگەلی زۆر ئاڵۆز کە لێرەدا سەرهەڵدەدەن، بەڵام سەرەتا رووەدەکەمە فاکتەکان.

هایدێگەر 21ی ئەپریلی 1933 هەڵبژێررا بە سەرۆکی زانکۆی ئالبێرت-لودڤیگ لە فرایبورگ/برایسگاو. ئەو خۆی وای بڵاوکردەوە (بێگومان درەنگتر پێچەوانەکەی سەلمێنرا) کە گوایە سەرەتا نەیویستووە بە سەرۆکی زانکۆ هەڵبژێررێت، بەڵام پاشان لەژێر پەستانی زەمیلەکانیدا و هەروەها "بۆ ئەوەی رێ لە سەرەنجامی ئالەبارتر بگرێت"، ناچار بووە

ئەو پۆستە وەربگرێت. ماوەیەکە سەرەنجامی توێژینەوەکانی هوگۆ ئۆتس سەلماندوویانە، کە ئەم پاساوەی هایدێگەر ناتەواوە. ئەو 23ی ئەپریلی 1934 لە پۆستەکەی کشایەوە.

هایدێگەر ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە وەك سەرۆکی زانکۆ هەڵببژێرێت، زۆر نزیك بوو لەو هەڵوێست و بزووتنەوە و رێکخراوانە کە لە سەردەمی ناسیۆنالسۆسیالیزمیشدا رۆڵێکی گەورەیان گێڕا. ئەو لە 1930 بەدواوە پەیوەندیی بە "یەکێتیی فێرخوازانی ناسیۆنالسۆسیالیستیی ئەلمانییەوە (NSDStB)" هەبوو. هەروەها هایدێگەر دژبەرێکی سەرسەختی کۆمونیزم و لیبەرالیزم و "سیستەم"ی کاتۆلیسیزم بوو. ئەو بۆ نموونە 6ی فێبریوەری 1934 نامەیەکی بۆ رابەری فێرخوازانی ئەڵمانیی رایش نووسی: "مرۆ هێشتا هەر تاکتیکی کاتۆلیکی ناناسێت. مرۆ دەبێت رۆژێك بە سەختی هەقی ئەمە بدات"([71]). هایدێگەر مەیلێکی زۆری بۆ بزووتنەوەی لاوانی ئەڵمانی هەبوو کە دەیویست — هاوشێوەی ڤاندەرفۆگل 'Wandervogel'- فێرخوازان (ی فێرگەیی و زانکۆیی — و) لە پێشبینییە بەهاییە وشکهەڵهاتوو و تۆزلێنیشتووە بۆرژوازییەکان ئازاد بکات. هەروەها هەر ئەم رێکخراوانە بوون هەوڵیان دەدا ریفۆرمی زانکۆ کە هایدێگەر وەك زەروویی دەیبینی، پێش هایدێگەر و سەربەخۆ لە ئەو ئەنجام بدەن. ئامانجی ریفۆرمی زانکۆ بەتایبەتی ئەوە بوو کە فێرخوازان و وانەبێژان مافیان هەبێت بۆ ئەوەی لە بڕیارداندا سەبارەت بە خۆبەڕێوەبردنی زانکۆ بەشداری بکەن، هایدێگەریش تەواو لەگەڵ ئەم داواکارییەدا بوو، بەڵام ئەم هەڵوێستە لە

[71]) Schneeberger, G.: Nachlese zu Heidegger, Bern 1962, S. 206.

زانکۆی پرۆفیسۆراندا سەرەنجامێکی ئەوتۆی خستەوە کە زۆر زەمیلی دژی وەستانەوە، چونکە هەستیان دەکرد نیمتیازاتەکانیان لە مەترسیدایە. هایدێگەر بە بێزێزی لە زانکۆی ئاستگەرای ترادیسیۆنیی دەڕوانی، چونکە بە تێڕوانینی ئەو زانکۆ دازنابوو بۆ سەر ئاستی بوون بە دوکانی خزمەتکردنی وانەبێژان. هۆیەکی دیکەی ئەو بێزێزییەی ئەو بەرانبەر زانکۆی ترادیسیۆنی لەوەدا بوو کە وانەبێژانی گەنجی وەکو ئەو هەلی لەباریان بۆ تەرقیە نەبوو. هایدێگەری زاهید ڤێزی لە ئازادیی ئەکادیمیانە دەبۆوە و وەك دەرفەتی رەخسێنراو بۆ بێسەروبەری و هێدۆنیزم دەیبینی. ئەو کینی لە کۆماری ڤایمار دەبۆوە کە دێموکراتییەکی پەرلەمانی بوو بە کارابیەکی کەمەوە. ئەمە واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە هایدێگەر گوایە لایەنگری پەرلەمانتاریزمێکی باشتر بوویێت، نەخێر، ئەو هاوشێوەی زۆر هاوچەرخی هیوای بۆ سەرەتایەکی نوێی نەتەوەیی و رابەرێکی بەهێز دەخواست، رابەرێك کە گەر هاتوو داواکارییەك بۆ یەکانگیربوون لەتەك گەلدا بەرزبکاتەوە، ئەوسا بە تێڕوانینی ئەو دەسەڵاتی راستەقینەی گەل، دێموکراتیی راستەقینە، ریالیزە دەکات. هایدێگەر تەنانەت لە دیمانەیەکدا لەتەك گۆڤاری دێر شپیگلدا (1966) کە لەسەر داواکاریی خۆی پاش مردنی لە 31ی مای 1976 بلاوکرایەوە، بێمتمانەیی خۆی بە دێموکراتی دەربڕی.

ئەوجا لە کۆتاییدا: هایدێگەر لەو بڕوایەدا بوو کە فەلسەفەی ترادیسیۆنی هەر لە سەرەتاوە پرسیاری هەڵەی کردووە و بۆ ماوەی 2000 ساڵە خزاوەتە نێو خۆفریودانەوە. بەڵام بە تێڕوانینی ئەو هیچ رێفۆرمێك ئەم دۆخە رزگار ناکات. سەرجەم تێڕوانینەکانمان بۆگەنیان کردووە —

کەواتە: شۆڕشێك پێویستە! ناسیۆنالسۆسیالیزمی سەرهەڵداو کە بە هەمان شێوە داوای شۆڕشی دەکرد، بۆ هایدێگەر بریتی بوو لە چالاکییەکی تەریب یان تەنانەت چالاکییەکی یەکگرتۆوە لەتەك تێڕوانینەکانی خۆیدا. ئێمە بێگومان دەتوانین لە مەسەلەیەکدا لەتەك ئەودا کۆك بین: ئەو لەکاتی بڕیاردانیدا بۆ پۆستی سەرۆکی زانکۆ مرۆڤێکی سیاسی نەبوو، بەڵام، سەرباری ئەمە، هایدێگەر لەو لایەنەدا زۆر ساویلکە بوو کە وایدانا، گوایە ئەو کۆنسێپتەی ئەو بۆ شۆڕشی فەلسەفە هەیبوو و بریتی بوو لە دووپاتکردنەوەی سەرەتاکەی فەلسەفەی گریکی، لەتەك "شۆڕش"ی ناسۆنالسۆسیالیستیدا یەکدەگرێتەوە. بێگومان نە هایدێگەر و نە نازییەکان مەبەستیان بوو پرۆگرامێکی سیاسی بە یاریدەی دامەزراوەکان ریالیزەبکەن. کێشەی هایدێگەر پرۆگرامی سیاسی نەبوو، بەڵکو شۆڕشی کولتووری بوو و لەوبەر هەر شێوەیەکی کرداری رۆژانەوە دایانابوو. ئەو چ لە 'بوون و کات' و چ لە سەردەمی درەنگتردا هیچ پێشبینییەکی سەبارەت بە پەیوەندییەکی پراکتیکی لەنێوان دازاین و جیهانە کۆمەڵایەتی-سیاسییەکەی دەوریدا نەبوو. کاتێك ئەو خۆی بۆ ناسیۆنالسۆسیالیزم تەرخان کرد، ئەوا لێرەدا شۆڕشە فەلسەفەییەکەی خۆی خستە خزمەتی سیاسەتێکی پراکتیکی و جیهانبینییەکەوە کە وایدادەنێت گوایە ماف تەنیا لە لایەن یاسادانانەوە دەسەپێنرێت (Dezisionismus). ئەوە لە بنەڕەتدا بەریەککەوتنێکی فەلسەفە و پراکسیس بوو، بەمەش هایدێگەر رۆڵی فەلسەفەی گەیاند بەو نێوەندە، رۆڵێك کە هەتا ئەو کاتە لەگۆڕێدا نەبوو.

پلانی نازییەکان ئەوە بوو کە زانکۆ دابەزێنن بۆ سەر ئاستی "زانکۆی تەکنیکی"ی رووکردووە پراکسیس، بەلام هایدێگەر بە پێچەوانەوە دەیویست زانکۆ لەو دابەزاندنەی ئاستەکەی بپارێزێت و هاوکات فەلسەفە بەسەر زانستە تایبەتییەکاندا سەروەر بکاتەوە. هایدێگەر تەنانەت ئەو دەمەش لەو بڕوایەدا بوو، کە تێگەیشتنی ئامرازی لە زانست دەبێت بە هۆیەك بۆ رووتاندنەوەیەکی کارەساتاویی مرۆڤ و سروشت، رووتاندنەوەیەك کە تەنیا لە لایەن بەرژەوەندیی ئابوورییەوە دیاریکراوە. بەلام مرۆ دەتوانێت بە شۆڕشی بەردەوام بەرهەڵستیی ئەو جۆرە تێگەیشتنە بکات. لە بنەڕەتدا هەر ئەم شۆڕشە بەردەوامە بوو کە هایدێگەر دەیویست لە هزری خۆیدا ریالیزەی بکات. بەلام بە پێچەوانەوە چالاکوانانی بالای نازیەکان تا ئەو کاتە شۆڕشیان وەك ئەگەرێك دەبینی، کە هێشتا بە دەسەلات نەگەیشتبوون، دوای سەندنی دەسەلات هەڵوێستیان گۆڕرا. ئەوان لە مەبەستەکەی هایدێگەر تێگەیشتن و بەوە سەرزەنشتیان کرد کە گوایە ناسیۆنالسۆسیالیزمی تایبەتی (پریڤات - و) پیادە دەکات.

با بگەڕێینەوە بۆ فاکتە مێژووییەکان. ئایا چۆن هایدێگەر بە سەرۆکی زانکۆ هەڵبژێررا؟ ئەو خۆی دەبێژێت: سەرۆکی پێشووی زانکۆ، ڤیلهێلم فۆن موێلندۆرف، پاش ماوەیەکی کورت لەو پۆستەدا لەسەر بڕیارێکی وەزیر کشاوەتەوە، پاشان پێکەوە لەتەك جێگری سەرۆکی زانکۆدا، یۆزێف زاوەر، داوایان لێکردووە ئەو پۆستە وەربگرێت، بەلام ئەو گومانی هەبووە، چونکە دەیزانی گەر ئەو پۆستە وەربگرێت، ئەوسا رووبەڕووی دوو دژبەری خاوەن نفوز دەبێتەوە: نوێنەرانی "کۆن" و "نوێ". لێرەدا "کۆن" واتای زانستیترادیسیۆنی و زانکۆ دەگەیەنێت، وەك هایدێگەر

خۆی دەبێژێت، بەرگریکەرانی کۆن داکۆکییان لە پێشکەوتنی مەئریفەی زانستە تایبەتییەکان و بەگەڕخستنی پراکتیکییانەی ئەو زانستانە کردووە، هاوکات لەو بڕوایەدا بوون کە مەسەلە سەرچاوەییەکە، واتا "تێگەیشتن لە بناغە کرۆکییەکان"، تێگەیشتنێکی "ئەبستراکتی فەلسەفەیی"یە و لەبەر ئەو هۆیە ڕەتیان کردۆتەوە، نەك ئەنجامی بدەن و "لەنێو ئەم ئەنجامدانەدا" (Vollzug) بهزرێن. کەواتە ئەوە کە لە دیدی زانستی ئاساییەوە ئەبستراکتە، واتا پرسیار لەبارەی بوون (بێگومان لەو شێوەیەدا کە هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا کردی)، بۆ هایدێگەر بریتییە لە کۆنکرێت و پراکتیکێتی وەك سەرجەم.

لەم جێیەدا کە هایدێگەر هەڵوێستی سیاسیی خۆی ڕووندەکاتەوە، دەگەین بە ستراتیژییەکەی ئەو لە هەڵگێڕانەوەی پێشبینییە باوەکاندا، ستراتیژییەك کە ماوەیەکە پێی ئاشنا بووین. تەنیا دەرئەنجامی ئاوەژوو (دژەدەرئەنجام - و) دەرفەت بۆ ناسینی ڕاستی دەڕەخسێنێت، لەمەشەوە سەرەنجامێك دەکەوێتەوە: ئەوە کە سەرەتا بە ڕاستی دادەنرێت، ناڕاستییە و هەروەها بە پێچەوانەوە. هەر لێرەدایە ڕەگی بڕوای هایدێگەر بەوە کە بەگەڕخستنی پراکتیکیانەی مەئریفە دەبێت بە لەمپەر لە بەردەم دیدێکی ڕاستەقینەدا بە ناڕاستەی جیهان و خۆمان. بەڵام هەروەها "نوێ" کە وەك "زانستی سیاسی" (هایدێگەر لە ئاوڕدانەوەیدا وای ناو دەنێت) دەردەکەوێت، بە هەمان شێوە ڕاستی ناهەنگێوێت، چونکە ئەمیش مەئریفە دەکات بە شتێکی شیاوی بەگەڕخستن. کەواتە ڕۆشنە: مەبەستی هایدێگەر لە واژەی "ئەنجامدان" (Vollzug) ئەوە نییە کە ئێمە بەگشتی لێیتێدەگەین، واتا ئەنجامدان لای

ئەو چالاكییەكە كە رووی نەكردۆتە گەیشتن بە ئامانجێك، بەڵكو رووی كردۆتە "چالاكبوون" (و چالاكمانەوە)، كەواتە رووی كردۆتە مانەوەلە-بزووتندا بە بەردەوامی، هەر ئەم هەڵوێستەشە كە پیشانی دەدات وشكهەڵهاتنی باو ناڕاستییە.

هایدێگەر ساڵی 1945 بە سێ ئەرگومێنت رەوایەتیی دا بە خۆكاندیدكردنی بۆ پۆستی سەرۆكی زانكۆ؛ ئەو وایبینیوە "كە بزووتنەوەی بە دەسەڵات گەیشتوو شیمانەیەكە بۆ كۆكردنەوەی ناخەكیانەی گەل و نوێكردنەوەی، هەروەها رێگەیەكە بۆ قەدەری مێژوویی-خۆرئاوایی"، جگە لەمە ئەو لە سەرۆكایەتیی زانكۆدا شیمانەیەكی بۆ ئەوە بینیوە كە "سەرجەم هێزە بەتواناكان، سەربەخۆ لە پابەندبوون بە پارت و بیروباوەڕی پارتەوە، بگەیەنرێن بە لێهزرین و نوێبوونەوە"، هەروەها (سێیەم) شیمانەیەكی بۆ ئەوە بینیوە "كە دەرفەت بڕەخسێت بۆ ئەوەی مرۆ رێبگیرێت لە هاتنەپێشەوەی كەسانی ناشایستە و لە مەترسیی باڵادەستبوونی دەزگای پارت و بیروباوەڕەكەی".

لە ئەرگومێنتی یەكەمدا دەردەكەوێت كە هایدێگەر لە "بزووتنەوە"ی بەدەسەڵات گەیشتوو دەدوێت نەك لە پارت. بەڕاستی هایدێگەر جیاوازی لە نێوان بزووتنەوە و پارتدا دەكات. ئەو لەم ئەرگومێنتە و دەربڕینی درەنگتریدا وایدادەنێت كە بزووتنەوەكە پاڵهێزێكی شۆڕشگێڕانەی هەیە و بەمەش لە پارت جیای دەكاتەوە. بە هەمان شێوە كاتێك ئەو ساڵی 1953 بۆ یەكەم جار موحازەرەكەی زەمێستەری هاوینەی 1935 ('رێبەرییەك بۆ مێتافیزیك')ی بڵاوكردەوە، رستەیەكی هێنایە نێویەوە كە بەگشتی

تەنیا تووڕەبوونی خستەوە. ئەو لەم رستەیەدا لە "مەزنیی ناخەکی و راستیی بزووتنەوەکە" دەدوێت. راینەر مارتن ساڵی 1987 گێڕایەوە کە ئەم رستەیە لە دارشتنی سەرەتایی موحازەرەکەدا نەبووە و هایدێگەر لە کاتی بلاوکردنەوەیدا هێناویەتە نێویەوە.

لە ئەرگومێنتی دووەمدا دەردەکەوێت کە هایدێگەر پارتی وەك شێوەی وشکهەڵهاتووی بزووتنەوەکە بینیوە. هایدێگەر لێهزرین و نوێبوونەوە (کە بۆ ئەو واتای "شۆڕش" دەگەیەنێت) بەرەنگاری پارت دەکاتەوە – پارت وەك فۆرمی دامەزراوەیی هزر (دۆکترین). بەلام ئەمە دوو کۆنسێپتن کە بەزەحمەت دەخرێنە فۆرمی دامەزراوەییەوە. ئەوجا هایدێگەر لە کۆتاییدا بە ئەرگومێنتی سێیەم لە "کەسانی ناشایستە" دەدوێت، لێرەشدا پێدەچێت مەبەستی لە ئێرنست کریك و ئالفرێد بۆیملەر بێت کە هەردووکیان زەمیلی خۆی بوون و بۆ سەندنی نفووز لە پارتدا رکابەریی ئەویان دەکرد. جگە لەمە هێندە مەزەنەیی نابێت گەر گریمانە بکەین کە هایدێگەر لە شۆڕشی سیاسیدا هەلێکی بینیوە بۆ ئەوەی پایەگایەکی مۆنۆپۆلی بە فەلسەفەکەی خۆی بدات. وەك پشتگیرییەك بۆ ئەم گریمانەیە دەتوانین ئەو پلانەی ئەکادیمییەك بە نموونە وەربگرین کە هایدێگەر دایدەنێت بۆ ئەوەی لەو ئەکادیمییەدا بەگوێرەی رێسا راهێنانی هزری (واتا هایدێگەری) بە سەرجەم مامۆستایانی زانکۆ بکرێت. بەلام ئەم پرۆژەیە، هاوشێوەی پۆستی سەرۆکی زانکۆ، شکستی هێنا.

سەرەنجامی توێژینەوەکانی ئۆت جیاوازن لەوە کە هایدێگەر سەبارەت بە کاتی پێش هەڵبژاردنەکە دەیگێڕێتەوە  بەم پێیە هیچ راست نییە کە

ڤیلهێلم فۆن موێلندۆرف، که پێش هایدێگەر سەرۆکی زانکۆ بوو، لەسەر داوای وەزیر وازی له پۆستەکەی هێنابێت، بە پێچەوانەوە، ئەو مەیلی بۆ سۆسیالدێمۆکراتی هەبوو، ئەو له پۆستەکەی کشایەوە، چونکە بە تێڕوانینە دێمۆکراتییەکانییەوە کەوتە ناکۆکییەوە لەتەك نازیەکاندا. نە فۆن موێلندۆرف و نە یۆزێف زاوەر کە پێش ئەو سەرۆکی زانکۆ بوو، داوایان له هایدێگەر کردووە ببێت بە سەرۆکی زانکۆ. پەیوەند بەم کێشەیەوە زاوەر و ڤۆلفگانگ شادەڤالد کە نازییەکی بەبڕوا بوو، گفتوگۆیەك دەکەن و زاوەر لەو گفتوگۆیەدا گومانی خۆی له گونجاویی هایدێگەر بۆ ئەو پۆستە دەردەبڕێت، چونکە، وەك زاوەر دەبێژێت، هایدێگەر جارێ هیچ ئەزموونێکی له کاروبارەکانی بەڕێوەبەرایەتیدا نییە، بەڵام بۆ شادەڤالد بەزۆریی ئەوە گرنگ بوو کە سەرۆکی نوێی زانکۆ خێرایی بدات بە دوو پلانی دانراو: یەکەم، پلانی گۆڕانکاری لە زانکۆدا، بەڵام ناوەرۆکی ئەم پلانە بچووکدەکرایەوە و ناو دەنرا "یەکخستنی" زانکۆ، دووەم پلان بریتی بوو لە دەرکردنی زەمیلە "نائارییەکان". هەروەها چەند زەمیلێکی هایدێگەر کە بیروباوەڕی ناسیۆنالسۆسیالیستییان هەبوو، بە ئەوپەڕی تواناوە پشتگیریی خۆکاندیکردنەکەی ئەویان دەکرد. جگە لەمە گومان لەوە ناکرێت کە هایدێگەر چ بۆ فەلسەفەکەی و چ بۆ خودی خۆی هەوڵی دەدا بە نفووز بگات. لێرەدا هاوکات دەشێت تەماحی ئەلفریدەی هاوسەری (1893-1992) کە هەتا سەرەمەرگ نازییەکی بەبڕوا مایەوە، ڕۆڵێکی گەورەی گێڕابێت.

ئەوە بوو ئیتر هایدێگەر بەگوێرەی پلان، نزیکەی بە کۆی دەنگ، هەڵبژێررا بە سەرۆکی زانکۆ. بەڵام دەبێت لێرەدا تێبینییەك بدەین: پێش هەڵبژاردنەکە لە کۆی ئەوەدوسێ پرۆفیسۆر سیازدەیان پۆستەکانیان بەگوێرەی یاسا ناسیۆنالسۆسیالیستییەکانی رەگەز لێسەنرابۆوە. جگە لەمە زۆرینەی سێناتۆرەکان ئەیاندەزانی کە هایدێگەر مەیلی بۆ نازییەکان هەیە. ئەوان بەئاشکرا هیوادار بوون کە ئەم فەیلەسوفە لە ئیجرای ریشەییتر بیپارێزێت. بەم شێوەیە هایدێگەر بە ئامانجی خۆی گەیشت: ئێستا ناوی خۆی نا "رابەر رێکتۆر" و وەك ئەم رابەرە هەنگاوی نا بۆ ئەوەی زانکۆ لەسەر پاژنەی فەلسەفەکەی پینەبکات. یەکەم پرۆبەی ئەم هەنگاوەی بریتی بوو لە گۆتاردانی دامەزراندنی بە سەرۆکی زانکۆ کە ناسراوە بە "گۆتاردانی رێکتۆرات" و 27ی مای 1933 پێشکەشی کرد — دوای ئەوە کە لە 1ی مای هەمان ساڵدا بوو بە ئەندامی NSDAP (پارتی کرێکارانی ناسیۆنالسۆسیالیستیی ئەڵمانی).

## گۆتاردانی رێکتۆرات

دوای ئەوە کە هایدێگەر بە سەرۆکی زانکۆی فرایبورگ هەڵبژێررا، گۆتارێکی بەناونیشانی "خۆڕاگەیاندنی زانکۆی ئەڵمانی" پێشکەش کرد. لەم گۆتارەدا بەڕوونی دەردەکەوێت، کە ئامانجە فەلسەفەیی و سیاسیەکانی ئەو لەتەك ئەمانجەکانی شۆڕشی ناسیۆنالسۆسیالیستیدا، کە ئەو خۆی گریمانەی کردبوون، یەک[illegible]نەوە. لەم گۆتارەدا ئەو سۆزە خەباتگێڕییە دەردەکەوێت کە ڤینفرید فرانتس دروست وەك "تاسە بۆ

دەستی پۆڵایین و بەرپرسیاری" دیاریی کرد. گۆتارەکە پڕە لە ئاخافتن سەبارەت بە خەبات، پاڵەوانێتی، قەدەر، ویستی کرۆك، سەختیی راسپاردە هۆشەکییەکەمان، هەروەها شێوەی مێژوو. ئێمە لێرەدا تێکەڵێك دەبینین کە پێکهاتووە لە بانگەوازی چالاکیگەرایی و خۆخستنە ژێر قەدەر، ئەمەش لەو شێوەیەدا کە لە 'بوون و کات'ـەوە وەك هاوکاتێتیی "میزاج" و "فڕێدراوی" دەیناسین.

وەك لوێڤیت ئاگامەندانە گۆتی، ئەم بریسکانەوە تایبەتییە لە نێوان دروشمی خەباتگێڕی و راڤەی پێشسۆکراتیانەدا سەرەنجامێکی ئەوتۆی خستەوە کە ئیتر دوای ئەوەی مرۆ گوێی لە گۆتارەکە گرتبوو، نەیدەزانی داخۆ بۆ ماڵەوە بڕواتەوە بۆ ئەوەی پێشسۆکراتییەکان بخوێنێتەوە، یان بچێتە ریزی مارشی ئێس-ئا-وە (SA).

گۆتاردانی رێکتۆرات تا رادەیەك ئیلهام لە "پۆلیتێیا/کۆمار"ی پلاتۆن هەڵدەهێنجێت. هایدێگەر هاوشێوەی پلاتۆن سێ گرووپ لەنێو دەوڵەتدا جیادەکاتەوە. لە دەوڵەتدا ئەو کەسانە هەن کە "خزمەتی سەربازی"، هەروەها کەسانی دیکە هەن کە "خزمەتی کار" و کەسانی دیکەش هەن کە "خزمەتی زانین" بەجێدەگەیەنن. ئەم سێ گرووپە گەرەکە "لە بنەڕەتدا ***یەك*** هێزی فۆرمێنەر" پێکبهێنن. بەڵام هیچ گومانی تێدا نییە، ئەو کەسانە کە "خزمەتی زانین" بەجێدەگەیەنن، لە لوتکەدان. بێگومان ئەم تێڕوانینە واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە گوایە هایدێگەر داوای حوکمداریی فەیلەسوفەکان بکات، بە پێچەوانەوە رابەرییەکەی ئەوان ناڕاستەوخۆیە، رابەرییەکی هۆشەکییە، "هۆشەکێتیـ"ش بۆ هایدێگەر

شتێکی سرەوتوو نییە، ئەبستراکت نییە، یان لە هەقیقەت دابڕێنراو نییە، بە پێچەوانەوە زەبرمەندە. ئاشکرایە کە هایدێگەر لە گۆتاردانی ڕێکتۆراتدا بەزۆریی لە کولتوور دەدوێت نەك لە کاری ڕۆژانەی سیاسی، ئێمە دەبێت هەر لەم مەغزایەشدا لە پێشبینیی ساویلکانەی ئەو تێبگەین کە گوایە بتوانێت "ڕابەریی ڕابەر (هیتلەر – و) بکات". هایدێگەر ڕاڤەیەکی 'لێچواندنی ئەشکەوت'ی پلاتۆنی کرد و تێیدا جەخت دەکات کە بەرزکردنەوەی داواکاری بۆ ڕابەرایەتییەکی بەو چەشنە واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت "کە گوایە گەرەك بێت پرۆفیسۆرەکانی فەلسەفە ببن بە کانسلەر، ئاخر ئەمە هەر لە سەرەتاوە نەکبەتی دەهێنێت، بە پێچەوانەوە ئەو واتایە دەگەیەنێت کە دەبێت مرۆڤانی هەڵگری دەسەڵاتی دەوڵەت فەلسەفێنەر بن"([72]).

گەڕانەوە بۆ پلاتۆن و مێژووی فەلسەفە پیشانی دەدات کە هایدێگەر چ واتایەکی بە "مێژوویێتی" دەدا. "مێژوویێتی" دەرفەتی بۆ دەرەخساند کە لە بەردەم جمهورێکی فراواندا تێزەکەی خۆی لەمەڕ "سەرەتا"ی لەدەستچوو ڕابگەیەنێت. بەهۆی سەرەتای لەدەستچووەوە بوو کە دەرفەت بۆ "خوێندنەوەی کریستیانی-کاتۆلیکیانەی جیهان" و "هزری ماتماتیکی-تەکنیکی" ڕەخسا سەرکەوتن بەدەستبهێنن. کەواتە ئێمە دەبێت سەرلەنوێ هەوڵ بۆ ئەم سەرەتا نەهەنگێوتووە بدەینەوە، دەبێت "خۆمان بخەینە ژێر دەسەڵاتی 'سەرەتا' ی هۆشەکی-مێژووییمانەوە". بێگومان سەرەتا لە پشتمانەوە نییە، بەڵکو لە پێشمانەوەیە. هایدێگەر بۆ ئەم جۆرە هەوڵدانە ڕەوانبێژییەکی بەهێز و تا ڕادەیەك دوواتایی بەگەڕ

---

[72]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 36/37, S. 194.

دەخات، ڕەوانبێژیی ویستن، خەبات، زەروورە، قەدەر و گوێڕایەڵی: "تەنیا گەر ئێمە بە بڕواوە گوێڕایەڵی ئەو قەدەرە دوورە ببین، ئەویش بۆ ئەوەی سەرلەنوێ مەزنیی سەرەتا دەستگیربکەینەوە، ئەوسا زانست بۆ ئێمە دەبێت بە ناخەکیترین زەروورەی دازاین" ([73]). کۆتایی ئەم گۆتاردانە بریتییە لە وەرگێڕانی بڕگەیەکی 'پۆلیتێیا'ی پلاتۆن کە ماوەیەکە بە ناوبانگ گەیشتووە: "سەرجەم مەزنی لە هەڵمەتدایە" ( 497 d 9). ئەم وەرگێڕانە جێی گومانە، بەڵام گەر هایدێگەر ئەم بڕگەیەی دروست وەربگێڕایە، ئەوسا بەدڵی نازیەکان نەدەبوو، بە پێچەوانەوە وشەی هەڵمەت زۆر چاك بەو کەشە پاڵەوانییە دەگونجا کە ئەو دەیویست هۆشسامی خۆی بۆ دەرببڕێت.

هایدێگەر ویستی بە گەڕانەوە بۆ گریکەکان و جەختکردن لە واتای مێژوویێتی و سەرەتا پیشانی نازیەکانی بدات کە هزری ئەو پێیدەکرێت پشتیوانی و رابەرایەتیی مەبەستە شۆڕشگێڕییەکانی ئەوان بکات، بەڵام پێدەچێت ئەم هەوڵەی بۆ ئەوان سووڕهێنەر بووبێت. بە پێچەوانەی ئەم هەوڵەوە، زۆر دەربڕینی هایدێگەر لەکاتی سەرۆکایەتییەکەیدا (ئەپریلی 1933 هەتا ئەپریلی 1934) بەڕوونی لەنێو کۆنتێکستی سیاسەتی رۆژانەدا بوون. ئەو بۆ نموونە لە گۆتاردانێکی سەرەتای زەمێستەری زستانی 1933/34دا دەبێژێت: "ڕێنومای هزری و 'ئیدێ' ڕێسای بوونی ئێوە نین، تەنیا خودی رابەر (هیتلەر — و) بریتییە (*ist*) لە هەقیقەتی ئەمڕۆ و ئایندەی ئەڵمانی و یاسای (ئەو هەقیقەتە —و)" ([74]). هایدێگەر

---

[73]) Heidegger, Martin: Die Selbstbehauptung der deutschen Universität, Frankfurt/Main 1933/1983, S. 13.

[74]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 16, S. 184.

تەنانەت دوای شکستهێنانی وەك سەرۆکی زانکۆ و هیوابڕکردنی لە لایەن رژێمی نازییەوە، هێشتا هەر سوور بوو لەسەر داواکارییە شۆرشگێڕییەکەی. لە موحازەرەی 'لۆگیك و پرسیار سەبارەت بە کرۆکی زمان'دا کە زەمێستەری هاوینی 1934 خوێندییەوە (هایدێگەر بۆ ئەو زەمێستەرە پلانی بۆ خوێندنەوەی موحازەیەکی دیکە لەبارەی 'دەوڵەت و زانست' دانابوو، بەڵام وازی لەم مەبەستە هێنا و ئەم موحازەرەیەی لەبریی ئەو دانا) دەبێژێت:

"هەڵەیە گەر بگوترێت لە زانکۆی ئەڵمانیدا رێئەکسیۆن (هەڵوێستی پاشڤەرو - و) هەیە. هیچ رێئەکسیۆنێك نییە، چونکە هیچ وەرچەرخانێك (شۆڕشێك) لێرە نییە، ئەمیش بۆیە لێرە نییە، چونکە مرۆ هێشتا تێنەگەیشتووە لەکوێوە دەستپێبکات. جگە لەمە هەندێك کەس بە هیچ شێوەیەك شۆڕشیان ناوێت؛ ئاخر پێدەچێت دەربکەوێت کە ئەوان لەو حاڵەتەدا ئەوپەڕی زیادەن" ([75]).

مەبەستی هایدێگەر لە "هەندێك کەس" کادرەکانی پارت و ئەو زەمیلانەیە کە پلانە ریشەییەکانی ئەویان بۆ یەکخستنی زانکۆ رەتدەکردەوە. پێدەچێت ئەوان وەك "زیادە" دەربکەون، گەر هاتوو سەرەڕای هەموو شتێك شۆڕشی راستەقینەی ناسیۆنالسۆسیالیستی رووبیدایە، کە ئاشکرایە ئەو، بەگوێرەی بۆچوونی ئەگۆڕی، خۆی لە لوتکەی ئەو شۆڕشەدا دەبینی. هەروەها کاتێك هایدێگەر لە "دەستپێکردن" دەدوێت، ئەوا لێرەدا پێکەوەلکاندنی شۆڕشی سیاسی و

[75]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 38, S. 76.

فەلسەفەیی پیشان دەدات. لە فراگمێنتی 53ی هێراکلیتێسدا دەگوترێت، کە شەڕ باوکی سەرجەم شتەکانە، بەڵام هایدێگەر پابەند بە راڤەی ئەم فراگمێنتەوە دەبێژێت:

"گەر ئێمە گوێمان بۆ ئەم سەرەتا گریکییە هەڵبخەینەوە، ئەوا ئەمە هەوەس یان نەریتێکی زانایانە نییە، بەڵکو 'قووڵترین زەرووره'ی دازاینی ئەڵمانیمانە، واتا: فێرببین تێبگەین کە ئەو سەرەتا مەزنەی دازاینمان بەسەر ئێمەدا بۆ پێش خۆمان فڕێدراوە وەك ئەوەیەك کە گەرەکە پێیبگەینەوە، بێگومان نەك بۆ ئەوەی تەکمیلەی گریکایەتی بکەین، نەخێر، بەڵکو بۆ ئەوەی شیمانە بناغەییەکانی رەچەڵەکی هەرە جەرمانێتیمان هەڵبهێنجین و بە دەسەڵاتی بگەیەنین" ([76]).

"سەرەتا" نەك تەنیا لێرە، بەڵکو بەگشتی وشەی کلیلییە بۆ تێگەیشتن لە هزری هایدێگەر. هیچ پێویست نییە هەوڵ بدەین بەرەو پێش بڕۆین (ئەمە بریتی دەبێت لە پێشکەوتن، لە مۆدێرنە)، بەڵکو گەرەکە بەرەو سەرەتا بگەڕێینەوە: بەرەو ئەو سەرەتایە کە گریکەکان لە ئەزموونکردنی بووندا ئەنجامیان دا - جا گەرچی بێگومان لە هزردا نەیانکرد. بەڵام راسپاردەکە بۆ بەدیهێنانی ئەم سەرەتایە، لە رووی فەلسەفەییەوە کەمێك ئاڵۆزکاوترە، چونکە هایدێگەر دەیەوێت بەردەوامی بەم هزرینەی سەرەتا بدات، واتا دەبێت ئەم سەرەتایە هەموو ساتێك بهزرێنرێت. سەرەتا کە (وەك لەدەستچوو) لەپشتمانەوەیە، هەروەها ئەو سەرەتایە کە (وەك ئەرك) لە بەردەمماندایە، لەنێو هەموو "ئێستا"یەکدا لێرەیە. ئێمە

[76]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 36/37, S. 89.

لایەنی کەم ئەو کاتە کە "خۆیی"ن، ئیتر "سەرەتایین". هەموو فەیلەسوفەکان، بێگومان گەر رەسەن بن، سەرەتاگرن و هەر ئاوها دەمێننەوە. گەرچی هایدێگەر دوای کشانەوەی لە پۆستی سەرۆکی زانکۆ بەناکامی روو لە پارت وەردەگێرێت، بەڵام ئەو هێشتا هەر رەخنە لە پارت دەگرێت کە گوایە دەستپێکردنێکی هێناوەتە گۆڕێ نەك سەرەتایەك.

هایدێگەر دوای شکستهێنانی لە پۆستی سەرۆکی زانکۆ، بەتوندی رەخنەی لە ئیدێکانی ناسیۆنالسۆسیالیزم دەگرت و رەخنەکانی دەمەوەرییان پێوە دیاربوو. ئەو لە موحازەرەکانیدا لەبارەی هوێلدەرلین و نیتچە، کە نازیەکان کردبوویانن بە داشی تاشراوی ئیدیۆلۆژیانەی خۆیان، پیشانی دەدات کە ئەم ئاوەژووکردنەوە ئیدیۆلۆژییانە چەند بێبنجن. بە هەر حاڵ، هایدێگەر لە مەسەلەی هوێلدەرلیندا خۆیشی فریو دەدات، ئەویش بەوە کە پەیوەندییەکی تایبەتی لەنێوان خۆی و هوێلدەرلیندا دیاری دەکات: ئاماژە بۆ ئەوە دەدات کە باپیری لەکاتی سەرهەڵدانی 'سروودی ئیستەر' (ئیستەر ناوە گریکییەکەی رووباری دۆناوە) و 'یادەوەری'ی هوێلدەرلیندا، لە دۆناوتال هاتۆتە جیهانەوە. ئەوجا هایدێگەر بە ئاوڕدانەوەی لە پۆستی سەرۆکی زانکۆ دەگات بەم تێڕوانینە تاڵە:

"بۆ من دوو تیر، خەریکبوون لەتەك بڕوابووندا بە رەچەڵەك و شکستی پۆستی سەرۆکی زانکۆ، ئەوەندە قووڵن کە دەبێت برینەکانیان بەڕاستی سارێژبکرێن" ([77]).

[77]) Brief an Jaspers vom 1. Juli 1935.

هیچ گومانی تێدا نییە کە ڕەوانبێژییەکەی هایدێگەر لە 1933 بۆ 1934 بەبێ کەلێن گونجابوو بە زمانی تایبەتیی نازییەکان، ئەو تەنانەت دەرەنگتریش بەسووکی لە جوولەکە دەدوا. بەڵام سەرباری ئەمە دەبێت جەخت لە هەقیقەتێك بکەین، ئەو لە پرسیاری شیمانەی وەرگێڕانی فەلسەفەکەیدا بۆ سیاسەتی پارت بوو بە قوربانیی بەهەڵەتێگەیشتنێك کە خۆی لێی بەرپرس بوو. هایدێگەر باوەڕی دەکرد، گەر لە ئەرێنییەکەی بۆ شۆڕشی ناسیۆنالسۆسیالیستی پاشگەز ببێتەوە، ئەوسا خیانەتی لە داواکارییە شۆڕشگێڕییەکەی هزری خۆی کردووە، بەڵام لێرەدا ئەو هەقیقەتەی نەبینی کە پارت تەقەلای بۆ بەئامرازکردنی بێجڵەوی مەتریفەکانمان دەدا، ئەمەش لە بنەڕەتدا بەتەواوی ئەوە بوو کە هایدێگەر وەك لەیادچوونەوەی بوون کردبووی بە بابەتی ڕەخنەکەی لە پێشسۆکراتییەکان. کەواتە لەو ساتەدا کە هایدێگەر وایبۆچوو، ئەو دەتوانێت و دەبێت هزری خۆی بخاتە خزمەتی پارتەوە، فرەتوێژییەکەی هزری خۆی لەبیرچۆوە: ئەو هزرە کە تاکە ئەرکی ڕێگرتن بوو لە کورتکردنەوەی هزر بۆ سەر ئاستی دووبەشاندنی دروست/ هەڵە، پارت/دژەپارت. گەر ئەو لە ئەنگاژمۆ نازییەکەی پاشگەز ببوایەتەوە، ئەوا بەو کارە (ئەمە بەڕاستی مایەی تەوسە) تێڕوانینە بنەڕەتییەکەی خۆی بەتەواوی ڕزگار دەکرد، بەڵام ئەو کاتێك دەیتوانی خۆی لە قەرەی ئەم داواکارییە بدات، گەر بەرانبەر بە هەڵوێستە سیاسییەکانیشی هەمان ئەو هەڵوێستە ڕەخنەییەی هەبووایە کە بەرانبەر بە ڕوانگە فەلسەفەییەکانی خۆی وەریگرتبوو.

## بۆچی هایدێگەر وەك سەرۆكی زانكۆ شكستی هێنا؟

شكستهێنانی هایدێگەر وەك سەرۆكی زانكۆ چەند هۆیەكی هەیە، بەلام ئەو خۆی گرنگترین هۆیە. ئەو بە چالاكییە بێئەندازەكەی بۆ یەكخستنی زانكۆی فرایبورگ، ئەمەش تەنانەت پێش دەرچوونی یاسای یەكخستن ([78])، زۆر پرۆفیسۆری كۆنسەرڤاتیف و لیبەرالی تووڕەكرد. جگە لەمە هایدێگەر تەنانەت وێرای بەرواری كۆنفرانسێكی رێكتۆران بەو ئامانجە ناوبراوەی سەرەوە تەزویر بكات. هەر چۆنێك بێت، زۆرینەی پرۆفیسۆرەكان هەڵوێستێكی گوماناویان بەرانبەر بە ناسیۆنالسۆسیالیزم و بەمەش بەرانبەر بە یەكگرتنەوەی هایدێگەر لەتەك ئەودا وەرگرتبوو — جا گەرچی هیچ بەرهەڵستییەكیان دژی لەكارخستنی زەمیلی جوولەكە و زۆر كرداری شەرمەزارانەی دیكەی وەك سووتاندنی كتێب نەنواند. هایدێگەر بەبێ قبوولكردنی هیچ رێگەچارەیەكی نێوانی هەوڵی دەدا فێرخوازان لە سەمینار و موحازەرەكان بهێنێتە دەرەوە و ئەركی راهێنانی سەربازی و خزمەتی كاریان بەسەردا بسەپێنێت، بەلام ئەم هەوڵەی لە لایەن زۆر زەمیلییەوە نزم دەنرخێنرا. بەتایبەتی وانەبێژانی كۆلێژی

---

[78] ) واژەی یەكخستن (Vereinheitlichung)، یان بە زمانی نازییەكان (Gleichschaltung) بریتی بوو لە هەوڵێكی ئەوان بۆ ئەوەی سەرجەم بوارەكانی كۆمەڵگە و سیاسەت، ژیانی تایبەتیی تاك ـیزانیش، لەنێو رێكخراوی نازیانەی جیاوازدا یەكبخەن. (ك.ج.)

پزیشکی کارێکی ڕێکخراوی نێو لابۆریان هەبوو و بۆیە هەستیان دەکرد کە پێگەیاندنی فێرخوازەکانیان بەڕاستی لە مەترسیدایە.

هەر چۆنێك بێت، شکستهێنانی هایدێگەر وەك سەرۆکی زانکۆ ناگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیانە کە ئەو لە 'Tatsachen und Gedanken'دا دیارییان دەکات. ئەو گۆتی، کە گوایە وەزیر داوای کردووە هەردوو راگر موێلندۆرف و فۆلف لە پۆستەکانیان لابدات، بەڵام ئەو گوێرایەڵیی وەزیری نەکردووە و لەبەر ئەم هۆیە لە پۆستەکەی کشاوەتەوە. ئەمە راست نییە. لە حاڵەتی ئێریك فۆلفدا بەڕاستی بەگوێی هایدێگەردا درا لە پۆستەکەی لایبدات، بەڵام ئەمە نەك لەبەر هۆی سیاسی. فۆلف ئەو دەمە، جیاواز لە سەردەمی درەنگتر، نازییەکی بەباوەڕ و لایەنگرێکی دڵسۆزی هیتلەر بوو، بۆیە بۆ وەزارەت هیچ هۆیەك لەگۆڕێدا نەبوو تاکو لەدژی ئەو هەنگاو بنێت، بە پێچەوانەوە: فۆلف تەقەلایەکی زۆری دا بۆ ئەوەی کۆلێژی یاسا بەگوێرەی پرنسیپی رابەر (هیتلەر —و) رێکبخات، بەڵام ئەمە کارێك بوو کە زۆر زەمیلی وەك تێپەڕین لە سنوور دەیانـنرخاند، بۆیە فۆلف متمانەی ئەوانی لەدەست دا و چیدی لە زانکۆ شیاوی هێشتنەوە نەبوو.

## ئایا فەلسەفەی هایدێگەر ناسیۆنالسۆسیالیستییە؟

وەك بیستمان، ئێمانوێل فایێ دەبێژێت: "بەڵێ". بە تێڕوانینی ئەو یەك تاکە تێکستی هایدێگەر نییە کە ناسیۆنالسۆسیالیستی نەبێت. پێش فایێ توێژەرانی وەك فاریاس، شنێبێرگەر و ئێبەلینگ هەمان تێڕوانینیان هەبوو. بەڵام نووسەرانی کتێبی *'Heidegger à plus forte raison'* دەبێژن: "نەخێر". زۆر نووسەری دیکەی فەڕەنسی هەمان تێڕوانینیان هەیە، بەڵام هەموویان، لەوانە ژۆ بوفرێت، ناتوانن بەسەرکەوتوویی بەرگری لە خۆیان بکەن دژی ئەو ڕەخنەیە کە گوایە ئەوان ڕێڤیزیۆنیستی راستڕەوی ریشەیین. هەروەها نووسەرانی ئەڵمانیی وەك ڤییت و پوێگەلەر هەمان تێڕوانینیان هەیە.

گەر ئێمە بمانەوێت "ئەرێ"یەك یان "ئەرێ"یەك روونبکەینەوە، ئەوا دەبێت لە خۆمان بپرسین کە داخۆ یەکگرتنەوەیەك لەنێوان فەلسەفەی هایدێگەر و ئیدیۆلۆژیی ناسیۆنالسۆسیالیزمدا هەبێت و گەر وا بێت، ئەوا داخۆ ئەو یەکگرتنەوەیە کامە بێت. ئەمیان بەتایبەتی بۆ کاتی نێوان پۆستی سەرۆکی زانکۆ گرنگە و هێندە ئاسان دیاری ناکرێت، چونکە لە سەرەتای دەسەڵاتی نازییەکاندا زۆر جەرەیانی جیاواز و ناکۆکیی سەخت سەبارەت بە ڕێبازی راستەقینەی پارت لەگۆڕێدا بوون. با پەیوەند بەمەوە تەنیا بیر لە فراکسیۆنی ناسیۆنال-شۆڕشگێڕ بکەینەوە کە هەردوو برا ئۆتۆ شتراسەر و گرێگۆر شتراسەر ، ابەرایەتییان دەکرد و ساڵی 1934 بەهۆی کوشتنی ئێرنست بوێم و رابەرانی دیکەی ئێس-ئا-وە تێکشکێنرا.

ئێمە دەتوانین بەئاسانی دوو پایە دیاری بکەین کە ناسیۆنالسۆسیالیزم لەسەریان وەستابوو و گرنگن بۆ ئەوەی یەکگرتنەوە و جیاوازیی نێوان هایدێگەر و ناسیۆنالسۆسیالیزم ساغبکرێنەوە: پرنسیپی رابەر و رەگەزگەرایی. بنەمایەکی سێیەم بریتییە لە پەیوەندی بە زانستەوە، بنەمایەکی چوارەم کە گەرەکە رووی تێبکرێت، پرسیارە لەبارەی تێگەی شۆڕش لای هایدێگەر و لە ئیدیۆلۆژیی نازییەکاندا.

1. پرنسیپی رابەر: ئێمە لەم بنەمایەدا یەکسەر دەگەین بە جیاوازی لە نێوان ئەگەرە فەلسەفەیی و کەسی-سیاسییەکانی هایدێگەردا. ئەو لە "پرۆژەی سەرۆکایەتیی زانکۆ"دا بەڕوونی داوای رابەرایەتیی کرد، ئەو تەواو سەرسام بوو بە هیتلەر، ئەمە تەنانەت ماوەیەکی زۆر پاش شکستهێنانەکەی. بەڵام ئەم ئەرێنییە سیاسییەی "پیاوی بەهێز" بە فەلسەفەی هایدێگەر ناگونجێت. دازاین لە 'بوون و کات'دا، بێگومان گەر ئەو خۆیی / رەسەن (authentisch) بێت، نەك تەنیا "پرۆژە"یە، بەڵکو هەروەها "فرێدراوی"یە، کەواتە بە هیچ شێوەیەك سەربەخۆ نییە. ئەوجا: "دازاین" لە 'بوون و کات'دا وەك تاکەکەسی "مۆدێرن"، ئۆتۆنۆم، شیاوی لێتێگەیشتن نییە، بەڵکو دەبێت تەنیا وەك پرسیارکردن لەبارەی مەغزای بوون لێی تێبگەین، جگە لەمە 'بوون و کات' هیچ دەسوێژێك بۆ شرۆڤەی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناخاتە بەردەم. سەبارەت بەم کێشەیە نابێت ئەو تێکستانە لەخشتەمان بەرن کە لە زۆرگە و لەتەکبوون دەدوێن، بە پێچەوانەوە ئەو تێکستانە بەتایبەتی پیشانی دەدەن، کە کێشەی هایدێگەر پرسیارکردنی سۆسیال و سیاسی نییە، بەڵکو ئامانجی ئەو روونکردنەوەی کایەی سەرئەزموونییە (ترانسسێندێنسە). هایدێگەر

لەگەڵ "وەرچەرخان"دا، هەروەها بەدووی ئەودا، بوون و هیچ، راستی و ناڕاستی، هاوتا دادەنێت. سەرجەمی دژبەرییەکان بەردەوام بە یەکتری دەبن. شۆڕش بەردەوامیی پێدەدرێت. نە (rock bottom)ێك لە رووی تیۆری و نە باڵاترین دامەزراوەیەك لە رووی پراکتیکییەوە هەیە. کەواتە لەوێدا نە جێی رابەر و نە جێی ئێتیکێك دەبێتەوە، بەڵێ بە هیچ شێوەیەك ناشێت لەژێر ئەم مەرجەدا گۆڕان بە ئێتیك بدرێت.

2) رەگەزگەرایی، ئێمە دەتوانین لە مەسەلەی رەگەزگەراییدا هاوڕابین لەتەك مارتندا (1987) و ببێژین، کە هیچ یەکگرتنەوەیەك لەنێوان رەگەزگەرایی بیۆلۆژیانەی ناسیۆنالسۆسیالیزم و ئەنتیسامێتیی کولتووریانەی هایدێگەردا نییە. ئەو رووبەرە کە هایدێگەر لەسەری دەبزوا، رووبەری کولتوور بوو. کێشەی ئەو بریتی نەبوو لە "سروشت" یان لە هەر جۆرێکی ماتەریالیزم، بەڵکو بریتی بوو لە "Wesen / ڤێزن"ی (کرۆکی) مرۆڤ. ئێمە دەبێت ئەم کرۆکە وەك ڤێرب (Verb)، وەك کراوەیی بۆ بوون، وەربگرین. هایدێگەر هەمیشە لەنوێوە جەخت دەکات، کە کۆئەندامی ئاژەڵ شتێکی تەواو جیاوازە لە لەشی مرۆڤ. ئەو دەبێژێت، کە تێڕوانینی ترادیسیۆنی سەبارەت بە مرۆڤ وەك ئاژەڵی ئاوەزمەند نزمنرخاندنێکی پڕمەترسیی مرۆڤە. هایدێگەر ئەو دەمە و درەنگتریش زۆر دوور بوو لەوە کە مرۆڤ بۆ سەر ئاستی "سروشت" کورتبکاتەوە، ئەو هەروەها هەرگیز بیۆلۆژیانە لە "گەل" نەدەهزرا، بەڵکو کولتووریانە. ئەڵمانەکان / دۆیچەکان (بەڵام لە راستیدا تەنیا ئەلەمانەکان) میراتگری راستەقینەی گریکەکانن.

بێگومان نکۆڵی لەوە ناکرێت کە هایدێگەر هەڵوێستی ئەنتیسامیانەی هەبوو، بەڵام پێویستە لەم کۆنتێکستەدا ئاماژە بۆ هەقیقەتێك بدەین: ئەو لەو ماوەیەدا کە سەرۆکی زانکۆ بوو، لە لایەك پشتی فێرخوازان و زەمیلی جوولەکەی گرت، لەوانە ڤێنەر برۆك کە هاوکاری زانستیی خۆی بوو، بەڵام ئەو لە لایەکی دی بەبێ هۆ خیانەتی لە زەمیلی دیکەی خۆی کرد، بۆ نموونە لە باومگارتن و شتاودیگەر. هەروەها (یان سەرلەنوێ) ئەو ساڵی 1950 سکاڵای کرد لە دەست ژمارەی زۆری پرۆفیسۆری جوولەکە، کە سەرلەنوێ لە زانکۆکاندا کاری وانەبێژییان دەکرد. کەواتە لەمەوە وێنەیەکی سەرجەمییانە دەکەوێتەوە، بەڵام هیچ شیمانەیەك نییە بۆ ئەوە کە ئەم ئەنتیسامێتییە کولتوورییەی هایدێگەر بخزێنرێتە نێو فەلسەفەکەیەوە.

3) زانست، تەکنیك، سیاسەتی زانکۆیی: ئێمە دەتوانین بڵێین کە هایدێگەر لە 'بوون کات'دا، لەپاڵ هەندێك داواکاریدا، ئەم داواکارییەی بەرزکردەوە: پێویستە فەلسەفە سەرلەنوێ رێنوماکانی توێژینەوە و فێرکاری دیاری بکات. بە دیدی ئەو، فەلسەفە ئەم سەروەرییەی لەدەستداوە، چونکە زانستەکان، بەتایبەتی زانستە تەکنیکییەکان، سەرکەوتنی یەکجار مەزنیان لە چارەسەری کێشە پراکتیکییەکاندا بەدیهێناوە و دەتوانن ئەو سەرکەوتنانەیان پیشان بدەن، بەم رێیەشەوە فەلسەفە و زانستە کولتوورییەکان خراونەتە پشتەوە. سەرەنجامی ئەم پاشەکشەیەی فەلسەفە ئەوەیە کە هەموو شتێك دەخرێتە ژێر فەرمانی بەگەڕخستن و ئەنجامخوازی و بەکارهێنانەوە. ئەمەش بەواتای: ئەوە کە بەڕاستی لە ژیاندا گرنگە و بریتییە لە پەیوەندیی مرۆڤ بە خۆی و

بوونەوە، لە بەردید بزر دەبێت. بێگومان ئەم گۆڕانە نوێ نییە، تەنانەت پارمێنیدێس و هێراکلیتێس ڕێیان دا لە تاکە پرسیاری ڕاستەقینەی فەلسەفە کە پرسیارە لەبارەی بوون، دووربخرێنەوە، ئەوانیش ڕێیان دا لە بەردەم بەگەڕخستنی مەتریفەکاندا لەخشتەببرێن و بەمەش، بەبێ ئەوەی لێی بەئاگابن، پرسیاریان لەبارەی بوون نەکرد، بەڵکو لەبارەی بوونەوەر کردیان. ئەم بەهەڵەداچوونە بە شێوەیەکی کارەساتاوی شەقڵی دا بە مێژووی خۆرئاوا.

بەدیدی هایدێگەر نەشیاوە ئەو مەتریفانە کە بەگەڕدەخرێن، وەك ڕاستی بناسێنرێن، بەڵکو لە هەموو حاڵەتێکدا وەك دروست (صحیح) شیاوی ناساندنن، ئەوان بوون بە دەسوێژ بۆ مەبەست. مەسەلەکە تەنیا کاراییە. تەکنیك و تەکنۆلۆژیای مۆدێرن بریتین لە لوتکەی ئەم گۆڕانە و نەك تەنیا بەهەڵەماندا دەبەن، بەڵکو تەنانەت ئەم بەهەڵەدابردنە دەشارنەوە. هایدێگەر لە سییەکانیشدا ئەم ڕەخنە جووتەنییەی لە تەکنیك کرد بە پرۆژە و لە پەنجاکاندا ئاگامەندانە لە کایەی تەکنۆلۆژیای جینەکاندا بەگەڕیخست.

ئێمە تێناگەین چۆن هایدێگەر توانیی وای دابنێت (هانا ئارنت ئاماژەی بۆ ئەمە داوە) کە ناسیۆنالسۆسیالیزم هاوخەباتێتی لەدژی تەکنیك و تەکنۆلۆژیا، بەمەش بزووتنەوەیەکە لەدژی سەروەریی مسیبەتییانەی هزری کەڵکخوازی. ئایا چۆن ئەم چەوتنرخاندنە پڕمەترسییە، ئەم هاوهەڵوێستییە وەهمییە هاتە ئاراوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە، هاوشێوەی توێژینەوە لە هۆکارەکانی وێنەدانەو ـ پرۆێکسیۆن)، مەزەنەییە. هەڵە

نییە گەر ئەم گریمانەیە بکەین، نازییەکان ڕەوانبێژییەکی تایبەتییان بەگەڕخست، لەو ڕەوانبێژییەدا بە خوو و نەریتی گەرمانییەکان و ترادیسیۆنی میللیی ناوچەکانیاندا هەڵدەدا، ئەوەش بۆ هایدێگەر ڕاستاندنی هەڵوێستەکەی خۆی بوو، بەرزنرخاندنی ئەلەمانێتی. ئەو لە گۆتاردانێکدا بەناونیشانی 'گەفکردنی گەلی ئەلەمانی'، لە "ئەلەمانێتیی گەنج" دەدوێت کە ئەسازە بە "مەدەنێتیی پیربوو و بە بێباکیی نیازباش بەرانبەر بە دەوڵەت". دانانی ئەلەمانێتی بە سەرچاوەیی و ڕەسەن و ڕاست کە دانانێکی حەشاردەرە، تەریبە بە ڕەتکردنەوەی مۆدێرنە وەك نوێنەری گشتیدان.

بەگشتیکردن کە تەکنیك گرنگترین مۆرکێتی، جیهانی ڕۆژانەمانی داگیرکردووە، بەڵام پێویستە لەدژی ئەم داگیرکردنە جەخت لە خۆ و خۆیەتی بکرێت، ئەمەش تەنیا کاتێك دەشێت، گەر فەلسەفە (بێگومان فەلسەفەی هایدێگەری) سەرلەنوێ بخەینەوە سەر لوتکەی تاکە زانستەکان، چونکە تەنیا فەلسەفە دەتوانێت ئەو کوێرکردنە کە تەکنیك و بەگەڕخستنی تەکنیك هێناویانەتە ئاراوە، هەروەها شاردنەوەی ئەم کوێربوونە، ئاشکرا بکات. ئێمە دەتوانین بەسەهووداچوونی هایدێگەر لە نرخاندنی نازییەکاندا وەك هەڵەیەکی ڕاچڵەکێنەر دیاریبکەین، چونکە ئەو سەرسامیی نازیەکانی بۆ تەکنیك نەدەبینی. بێگومان ئەم تێڕوانینە واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە ئەو بەرپرسیار نەبێت لەم هەڵوێستەی. جگە لەمە ڕستەکەی نێو 'ڕێبەری بۆ مێتافیزیك' پیشانی دەدات کە هایدێگەر لەم ڕووەوە تەنانەت دوای 1945 زۆر بێئاگا بوو؛ ئەوجا ڕستەیەکی دیکە دێتە پاڵ ئەو ڕستەیە: "ئێستا کشتیاری تەنیا

ئیندوستریی تێرکردنە، لە کرۆکدا هەمان شتە وەك بەرهەمهێنانی لاشە لە گازخانەکان و ئۆردوگاکانی قەلاچۆکردندا، هەمان شتە وەك دابڕاندن و برسیکردنی وڵاتان، هەمان شتە وەك بەرهەمهێنانی بۆمبی هایدرۆجینی"([79]).

4) شۆڕش: هایدێگەر تا رادەیەك لە سیاسەتی زانکۆییدا دەروازەیەکی بۆ پێشبینییەکانی خۆی لەمەڕ شۆڕش بینییەوە، چونکە (NSDAP) هێشتا لە بواری سیاسەتی زانکۆییدا ستراتیژییەکی سیاسیی نەبوو. هیتلەر بەرانبەر بە زانکۆ، بەگشتی بەرانبەر بە هزرمەندان (ئینتەلەکتوێلەکان – و)، هەڵوێستێکی ئەوپەڕی گوماناویی هەبوو. هایدێگەر لەم پنتەدا لە هیتلەر جیاواز بوو، بەڵام ئەم جیاوازییەی شاردەوە. ئەو دەیویست زانکۆکان وەك خۆیان بهێڵێتەوە، بەڵام هاوکات شۆڕشگێڕێتییان پێبدات. زانستەکان دەبوو بخرێنە ژێر رابەرایەتیی فەلسەفەی هایدێگەرەوە، هەروەها دەبوو هەرەمی ترادیسیۆنیی زانکۆ، واتا زانکۆی پرۆفیسۆرەکان، نەهێڵرێت. مەبەستی ئاشکرای هایدێگەر ئەوە بوو کە لە خۆبەڕێوەبردنی زانکۆدا مافی بەشداریکردن بدات بە وانەبێژان و فێرخوازان، ئەمەش شۆڕشێك بوو کە پرۆفیسۆرەکان بەتوندی دژایەتییان کرد، بەڵام هایدێگەر بە پشتیوانیی یەکێتی فێرخوازانی ناسیۆنالسۆسیالیستی و وەزارەتی فێرکاری بۆی لوا، یاسای زانکۆ بەگوێرەی تێڕوانینی خۆی بگۆڕێت. هایدێگەر هاوکات هەڵپەی کرد بۆ ئەوەی لە سیاسەتی زانکۆیی رایشدا دەسەڵات بەدەست بهێنێت، بەڵام کریك و بۆیملەر و رۆزنبێرگ

---

[79]) Heidegger, Martin: Bremer und Freiburger Vorträge, GA 79, 1949/1994, S. 27.

بەرهەڵستیی ئەم نیازەی ئەویان کرد و بۆیە بەبێ خستنەوەی بەرهەمێك شکستی هێنا. هایدێگەر هەرگیز نەیتوانی ئەم شکستهێنانەی بەتەواوی بڕەوێنێتەوە. ئەوجا ئەو لە کۆتاییدا بە جرپنیی دیکە ئەوەندە زەمیلی دیکەی تووڕە کرد، کە مانەوەی لەو پۆستەدا نەشیاو بوو، بۆیە فێبریوەری 1934 بڕیاری دا لە پۆستەکەی بکشێتەوە. بەلام ئەمە هیچ شتێك لە پەیوەندیی فەلسەفەی ئەو بە بزووتنەوەی ناسیۆنالسۆسیالیستییەوە ناگۆڕێت. ئەو هێشتا هەر تەریبێکی پڕواتای لەنێوان شۆڕشە فەلسەفەییەکەی خۆی و شۆڕشی سیاسیدا دەبینی، شۆڕشێك کە ئەو باوەڕی دەکرد لە بزووتنەوەکەدا بینیبێتییەوە. ئەو بۆ نموونە 3ی نۆڤەمبەری 1933 رایگەیاند: "شۆڕشی ناسیۆنالسۆسیالیستی، وەرچەرخانی تەواوەتیی دازاینی ئەڵمانیمان دەهێنێت"([80]).

هایدێگەر یەکسەر دوای شکستیهێنانی وەك سەرۆکی زانکۆ ئەو موحازەرەیەی لابرد کە نیازی بوو لەبارەی دەوڵەت بیخوێنێتەوە و لەبریی ئەو موحازەرەیەکی دیکەی لەبارەی لۆگیك خوێندەوە، بێگومان نەك لەبارەی ئەو لۆگیکە کە ئێمە ئەمڕۆ پێشبینیی دەکەین، بەڵکو موحازەرەکە بریتی بوو لە راڤەیەکی تایبەتیی لۆگۆسی گریکی. لەم موحازەرەیەدا دەردەکەوێت کە هایدێگەر پشت دەکاتە لۆگیکی دووبەهایی، ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێت کە ئەو گاڵتە بە یاساغی روونکردنەوەی خولگەیی دەکات و دەبێژێت، بەتایبەتی ئەوە گرنگە کە ئێمە بچینە نێو خولگەکەوە. لەم داواکارییەوە، وەك پێشتر بینیمان، سەرەنجامێکی ئەوتۆ دەکەوێتەوە کە هایدێگەر ببێژێت: بوون هیچە و راستی ناڕاستییە، واتا

[80]) Schneeberger, G., a.a.O., S. 135.

ئێمە لەسەر ئاستی ئیستیدلالی تەنیا دروست (صحیح) دەدۆزینەوە و هەرگیز راستی نادۆزینەوە. راستی هەرگیز شتێکی چەسپیو، شیاوی پێناسەکردن، تەواوکراو، نییە، بەڵکو هەمیشە ئەوەیە کە پێویستە "بهزرێنرێت". یەکایەتیی "فوول"ی یان یەکایەتیی سەرئەزموونیی (ترانسسێندێنتی) ئەسازییە تەوەرەییەکان (بوون/هیچ، راستی/نا-راستی) بریتییە لە یەکایەتیی بزێوی ئەسازییەکان، کە لێوەی دەشێت فێنۆمێنە لۆگیکی و رۆژانەییەکان دیاربدەن، بێگومان دیاردان تەنیا وەك کورتکراوەیەکی دەسنگیرکراو لەو یەکایەتییەوە. هەر بڕیارێك لەسەر ئەم ئاستە بدرێت، تەنیا دروستە، بەڵام هەرگیز راست نییە. بێگومان دەشێت ئەو بڕیارە کارایی هەبێت، سەرەڕای ئەمە هەرگیز کرۆك ناهەنگێوێت. بەڵام گەر مەسەلەکە بریتی بێت لە بوون/هیچ، ئەوسا چیدی گرنگ نییە کە داخۆ دروست یان نادروست بڕیار بدرێت، بەڵکو ئەوە گرنگە کە بڕیاردەدرێت.

هەروەها کێشەکە لەسەر ئەم ئاستەی کە' کردارێك نییە لە مەغزای باودا و مرۆڤ بتوانێت وەك هەڵبژاردنێك لەنێوان ئەلتەرناتیڤی جیاوازدا یان وەك چێکردنی شیمانەی کردار دایبنێت. کردارەکە لەسەر ئەم ئاستە هزرێکە و هزرەکە کردارێکە، ئەوجا بەدووی ئەمەدا دەردەکەوێت کە داخۆ کردارەکە خۆی لەنێو راستی یان نا-ڕاستیدا ببینێتەوە، واتا: داخۆ بوون بۆ ئێمە دەربکەوێت یان خۆی لێمان بەدووربگرێت. هایدێگەر دەبێژێت: "کێ مەزن بهزرێت، دەبێت مەزن بەهەڵەدابچێت".

"وره" (Entschlossenheit) و "کردار" بریتین له جۆرێکی "ئەنجامدان" (Vollzug). لەم ئەنجامدانەدا کراوەیی دەبینێت، کە خۆ-ئاشکراکردنی راستی خۆی دەشارێتەوە و خۆ-شاردنەوەی راستی خۆی تەواو پیشان دەدات. گەر سیستەماتیکیانە بڕوانین، دەبینین کە هایدێگەر هیچ پەیوەندییەکی نەبوو بە سیاسەتی ناسیۆنالسۆسیالیزم و تێگەیشتنی ئەوەوە بۆ سیاسەت. دەوڵەتی نازی بەگوێرەی پرۆگرام کاری دەکرد، ئامانجی دادەنا و لۆگیستیکی رێکدەخست. بەڵام هایدێگەر بە پێچەوانەوە لەسەر ئاستی سەرئەزموونی هەوڵی بۆ نزیکبوونەوە و ناسینێك دەدا کە نەشیاو بوو بتوانێت لەسەر ئەو ئاستە بەدەستی بهێنێت. ئەو وای بۆ دەچوو کە هزری خۆی و سیاسەتی نازیانە یەکبگرنەوە، بەڵام ئەم بۆچوونەی هیچ بنەمایەکی نەبوو. نازییەکان نەیاندەتوانی هیچ شتێك بە هزری هایدێگەر ئەنجام بدەن. ئەوان بۆ ماوەیەك باوەڕیان دەکرد کە رەنگە ناوبانگی هایدێگەر بۆیان سوودمەند بێت. گەر لە رووی ناوەرۆکەوە بڕوانین، ئەوا دەبینین کە نەشیاو بوو جیاوازیی نێوان هایدێگەر و نازییەکان یەکلابکرێتەوە. ئاخر هایدێگەر جەختی لە ئاستێکی خۆپەرچیوی رەوشگەلی فرەواتا دەکرد، لێرەشدا بەناگا بوو لە خودی تەوەرەکان کە بناغەی یەکتری دەڕێژن و لە پەیوەندیی بەردەوامی نێویەکیدا بە یەکتری دەبن، بەڵام ئەمە بۆ دەسەڵاتداران زۆر ئاسك بوو، جگە لەمە چ لە رووی تیۆری و چ لە رووی پراکتیکییەوە هیچ سوودێکی بۆ ئەوان نەبوو. گەر مرۆ بیتوانییایە هزری هایدێگەر بۆ مەبەستی سوودلێوەرگرتن کارا بکات، ئەوسا ئەو هزرە بەڕاستی دژبێژی خۆی دەکرد و خۆی لەکاردەخست.

کەچی ئەم کێشەیە لە روانگەی هایدێگەردوە جیاواز بوو. ئەو لایەنی کەم هەتا ساڵی 1936 هەمیشە لەنوێوە جەختی دەکرد کە پەیوەندییەکی ناخەکی لەنێوان فەلسەفەکەی و ناسیۆنالسۆسیالیزمدا (دەرەنگتر "بزووتنەوەکە"دا) هەیە. ئەو ساڵی 1936 گفتوگۆیەکی لە رۆما لەتەك کارل لوێڤیتدا ئەنجام دا و لەم گفتوگۆیەدا دەیدرکێنێت کە لایەنگریی ئەو بۆ ناسیۆنالسۆسیالیزم لەنێو کرۆکی فەلسەفەکەیدایە. بەڵام ئێمە دەتوانین پیشانی بدەین کە ئەمە بەهەڵەتێگەیشتنێکی یەکجار درشت بوو.

هایدێگەر ویستی داواکارییە شۆڕشگێڕییەکانی پارت لەتەك داواکارییەکانی خۆیدا بگونجێنێت. ئەو لە نووسینی 'بڕیاردان بۆ ئادۆلف هیتلەر و دەوڵەتی ناسیۆنالسۆسیالیستی'دا دەبێژێت: "شۆڕشی ناسیۆنالسۆسیالیستی تەنیا وەرگرتنی دەسەلاتێکی هەبووی نێو دەوڵەت نییە لەلایەن پارتێکی پێگەییوەوە بۆ ئەو مەبەستە، بەڵکو ئەم شۆڕشە وەرچەرخانی تەواوەتیی دازاینی ئەڵمانیمان دەهێنێت"([81]). هایدێگەر 15/16 ی ئۆگوستی 1934 لە گۆتاردانی 'زانکۆی ئەڵمانی'دا وایدادەنێت کە شۆڕش و مێژوو و گەل پێکەوە گرێدراون: "بەڵام هەنووکەی ئەڵمانیمان بە وەرچەرخانێکی مەزن پڕبۆتەوە و (ئەم وەرچەرخانە) بەنێو سەرجەم دازاینی مێژوویی گەلاندا دەتەنێتەوە. ئێمە سەرەتای ئەم وەرچەرخانە لە شۆڕشی ناسیۆنالسۆسیالیستیدا دەبینین"([82]).

---

[81]) Schneeberger, G., a.a.O., S. 150.

[82]) Heidegger, Martin: Gesamtausgabe 16, S. 285-286.

## ئایا شۆڕشەکەی هایدێگەر بە چ شێوەیەك دەبوو؟

گەر پێشبینی بکەین کە شۆڕشەکەی هایدێگەر لە چی جیاوازە، ئەوا دەتوانین بەپوختی ببێژین: ئەو شۆڕشە دژی جیهانگەراییە، بەتایبەتی دیاریکردنێکی نێگەتیفی پێدراوە، ئەنتیپەرلەمانییە، واتا دژی هاوڕاییەکە کە بەڕێی ئەرگومێنتەوە چێکراوە (یان لایەنی کەم دژی بڕیاری زۆرینەیە)، کەواتە دژی ئەو دامەزراوانەیە کە ڕەوایەتی بەو بڕیارانە دەدەن کە لە ڕەوتی پرۆسەدا هاتوونەتە ئاراوە. ئەو شۆڕشە ئەنتیمۆدێرنە، واتا دژی بنەمای تاکەکەسی نۆتۆنۆم و کۆمەڵگەی پڕجیاوازییە، بەڵام بەتایبەتی دژی تەکنیکە، چونکە تەکنیك بۆ هایدێگەر بریتییە لە ڕەوایەتیدانی مرۆڤ بە خودی خۆی، واتا تەقەلادانە بۆ دەسەڵات بەسەر مرۆڤ و سروشتدا و بەمەش تەکنیك خۆمەزنکردنی سەبژێکتە – بریتییە لە دانانی خۆیەتی بە "تاجی خولقاندن". هایدێگەر ئەم کێشەیە بەم چەشنە دەردەبڕێت: مرۆڤ سەروەری بوونەوەر نییە، بەڵکو "شوانی بوون"ە. گەر مرۆڤ خۆی بەسەر بوونەوەردا سەوەر بکات – یان تەناتەت بەسەر بووندا -، ئەوسا جیاوازیی سەبژێکت و ئۆبژێکت دەچەسپێنێت و بەمەش ڕێ لە خۆی دەگرێت لە بوونەوە پرسیار لەبارەی بوون بکات.

بەڵام گەر بمانەوێت شۆڕشەکەی هایدێگەر تەنیا بەو ڕێیەوە دیاری نەکەین کە ئەو چی ڕەتدەکاتەوە، بەڵکو بەو ڕێیەشەوە کە ئەو چیی دەوێت، ئەوسا دەتوانین ببێژین: ئەو شۆڕشە نوێنەرایەتیی ڕوانگەی

ناوچەگەرایی دەکات، لێرەشدا بەروونی دەبینین کە هایدێگەر مۆرکی پاڵەوانێتی بە گەلی ئەڵمانی / دۆیچ دەدات و وەك تاکە گەلێکی سەر ئەم زەمینە دایدەنێت کە شایستەی ئەوەیە ناوی پاڵەوانی لێبنرێت، چونکە، تەنیا چونکە، گەلی ئەڵمانی میراتگری راستەقینەی کولتووری گریکییە. ئەم تێڕوانینە بۆ هایدێگەر بناغەیەکی فەلسەفەیی هەیە: گریکەکان، بەتایبەتی پێشسۆکراتییەکان، بناغەی کولتووری ئەوروپییان رشتووە، لێرەشدا تەنیا ئەڵمانەکان کولتووریان هەیە، بەڵام، وەك ئاشکرایە، فەرەنسییەکان تەنیا ژیارییەکی دێکادێنتیان هەیە. بێگومان بۆ هایدێگەر زۆر خوازراوتر دەبوو کە ئەم ناونیشانی شەرەفەی تەنیا بە "گەل"ی ئەلەمانەکان بدایە، بەڵام گەر ئەم کارەی بکردایە، ئەوسا پێدەچوو لەلای دانیشتوانی دیکەی رایش هێندە سەرسامیی نەخستایەتەوە. هەروەها ئەوەش ئاشکرایە کە هایدێگەر بە پێچەوانەی شاری مۆدێرنەوە واتایەکی پۆزەتیڤ بە "گوند" دەدات.

هایدێگەر بەدرێژایی ژیانی سوور دەبێت لەسەر مەبەستە شۆڕشگێڕییەکانی، واتا لەسەر "راسپاردەی هۆشەکی" و "رابەرایەتیی هۆشەکی" کە لە گۆتاردانی رێکتۆراتدا جەختی لێکردبوون. ئەو 30 نۆڤەمبەری 1933 تەنانەت دژی هیتلەر ئەم مەبەستەی خۆی بە شێوەیەکی رەخنەیی پیشان دا. ئەو 30 نۆڤەمبەر لە تیوبینگن گۆتارێکی بەناوی 'زانکۆ لە دەوڵەتی ناسیۆنالسۆسیالیستی'دا پێشکەش کرد، لەوێدا دەبڕینێکی هیتلەر وەك سیتات دەهێنێتەوە، کە گۆتبووی شۆڕش کۆتایی هاتووە و ئێستاش گەرەکە پەرەسەند، (ئێڤۆلوسیۆن) جێی بگرێتەوە، بەڵام هایدێگەر بە پێچەوانەوە دەبێژێت، کە شۆڕش لە زانکۆی ئەڵمانیدا

به هیچ شێوەیەك كۆتایی نەهاتووە – بەڵێ تەنانەت جارێ دەستیپێنەكردووە.

سەرچاوە:

Willem van Reijen
Heidegger im Profil
Paderborn 2009

## فەرهەنگۆك

تێبینی: ئەم فەرهەنگۆکە بەگوێرەی ئەلفبای کوردی-لاتینی ڕێکخراوە.

**ئاپریۆری:** پێشئەزموونی، سەرئەزموونی، واتا هەبوونی دراوێك (بۆ نموونە مەئریفەیەك) پێش هەر ئەزموونکردنێکی ئەمپیری.

**ئاتێیزم:** (ئیلحاد)

**ئاگایی:** بە ئەڵمانی: Bewusstsein

**ئانۆنیومێتی:** نەناسراویی یان دیارینەکراویی شوناسی کەس، وەك بۆ نموونە لە حاڵەتی غەریبێتیدا.

**باڕۆك:** جەرەیانێکی هونەری و تەلارسازی بوو لە نێوان 1600 بۆ 1720 لە ئەوروپا کە بەدووی ڕێنیسانسدا هات.

**بەشتکردن:** نامۆبوونی هزر.

**بێدوایەکی:** (اللامتناهی)، ناکۆتا یان بێکۆتایی.

**جیاوازیی ئۆنتۆلۆژییانە:** جیاوازیکردن لەنێوان بوون و بوونەوەردا. بوون بۆ هایدێگەر بریتییە لە ئاسۆی تێگەیشتن کە مرۆڤ دەتوانێت لەسەر بناغەکەی بە شتەکان یان بە بوونەوەر بگات.

**دەرکێشانی دەرئەنجام:** لە زانستی پێوەردا (سیلۆگیزمدا) ئەنجام دەدرێت، بۆ نموونە لەم دوو بڕیارەوە: سۆکرات مرۆڤە، مرۆڤ بمرە، دەرئەنجامێك دەدەكێشرێت: سۆکرات بمرە.

**دەرەنجامی ئاوەژوو:** یان دژە دەرەنجام (بە لاتینی: argumentum e contrario) لە بنەڕەتدا تێگەیەکی یاساییە. بۆ نموونە: "کچی لەچك بەسەر بۆی نییە لە زانکۆ بخوێنێت"، دەرەنجامە ئاوەژووەکەی: "کچی بێلەچك دەتوانێت لە زانکۆ بخوێنێت".

**دەرەنجامی خولگەیی:** هەڵەیەکە لە سەلماندندا. لەم هەڵەیەدا دەربڕینە سەرلێنەرەکان ئەوە لە خۆ دەگرن کە گەرەکە بسەلێنرێت، کەواتە تێزێك بە ئەرگومێنتگەل وەك دەرئەنجام دەبرێتەوە و ئەم ئەرگومێنتانەش لە هەمان تێزەوە وەك دەرئەنجام دەبرێنەوە.

**دێکادێنت:** تێکچوو بەرێی گەیینی کولتوورییەوە، کە نیشانەی داوەشانە. دێکادێنس، تێکچوون، دەبێت لە بۆگەنبوونی کۆمەڵایەتی لە واتای دازناندا جیا بکرێتەوە، چونکە مەرج نییە لە گەییوی کولتووریدا بۆگەنی کردبێت. بۆ نموونە ئەمڕۆ وڵاتانی ئیسلامی بەگشتی لە رووی کۆمەڵایەتی و مۆرالییەوە بۆگەنیان کردووە، بەڵام ئەمە واتای دێکادێنس ناگەیەنێت.

**دیسکورزیڤ:** ئیستیدلالی، واتا هزرینێك کە بە زەروورەی لۆگیکی لە پێشبینییەکەوە بۆ پێشبینییەکی دی بەرەو پێش دەچێت.

**دۆکترین:** رێڕەو

**دراماتورگی:** هونەر و رێسای بیناکردنی شانۆنامە.

**دوایەکی:** (المتناهی) کۆتا

**فابل**: چیرۆکی پەخشانی یان هۆنراوە کە تێیدا ئاژەڵ و رووەك یان زیندەوەری ئەفسانەیی ئەدگاری مرۆڤ وەردەگرن.

**فۆرمال**: شێوەکی

**فراگمێنت**: لەم پەیوەندییەی نێرەدا بەواتای: نیشێکی یان لێکۆڵینەوەیەکی تەواونەکراو.

**گێشتالت**: وشەیەکی ئەڵمانییە و یەکێکە لە رێبازەکانی پسیکۆلۆژی (بە ئەرەبی "جیشتالت") کە سەرجەم وەك گەورەتر لە کۆی کەرتەکان دادەنێ. بۆ نموونە خانوویەك کە فۆرمێکی تایبەتیی هەیە، وەك سەرجەم و بە حوکمی فۆرمەکەی گەورەترە لە کۆی کەرتەکانی (بەرد، چیمەنتۆ، دەرگا و پەنجەوە و هتد).

**گنۆزیس**: رێبازێکی هزرییە کە هەوڵ دەدات بەرێی روانینەوە لە خودا ئەزموونی جیهانی سەرسروشتی بکات.

**گۆتیك**: بریتییە لە هونەر و تەلارسازیی ئەوروپی لە چەرخی ناڤیندا.

**هابیلیتاسیۆن**: پلەیەك لە دکتۆرا بەرزترە، لێکۆڵینەوەیەکە کە پاشان بە زانا پلەی پرۆفیسۆر دەدرێت. **هۆرست-ڤێسل**: ئەم گۆرانییە بەناوی دانەرەکەیەوە، هۆرست-ڤێسل، ناونراوە، کە لە نێوان 1927 و 1928دا داینا. سەرەتا گۆرانیی خەباتگێرانەی ئێس-ئا (SA) بوو، پاشان بوو بە سروودی (NSDAP).

**هیچاندن**: (نێگاسیۆن، ئەفیکردن).

**هێدۆنیزم**: هەڵوێستێکی فەلسەفەییە کە باڵاترین بنەمای ئێتیك لە تەقەلادانداا بۆ چێژ دەبینێت.

**هێرمینیۆتیك**: فەلسەفەی تێگەیشتن.

**ئەبستراکت**: (بە ئەرەبی: مجرد).

**ئەلەمان**: هۆزێکی ئەڵمانین، گێرمانین، کە ئەوانیش ئەمڕۆ دۆیچن و شوێنی نیشتەجێبوونیان دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای ئەڵمانیاوە.

**ئەنتیسامی**: هەڵوێستی دژبەر یان دوژمنانە بەرانبەر بە جوولەکە.

**ئەزموونی سنووری**: ئەزموونێکە لەسەر سنووری دوو شیمانەیە و بۆیە بە زەحمەت بڕیاری بۆ دەدرێت. ئەم جۆرەی ئەزموون جیاوازە لە ئەزموون لە واتایەکی ئەمپیریدا.

**ئێکزیستێنسیال**: هایدیگەر تێگەکانی ناو دەنێت ئەکزیستێنسیال، بە پێچەوانەی کاتیگۆرییەوە.

**ئێرکەر**: دروستکراوی داخراو و دەرپەڕیو (ی دیکۆرناسا) بە پێش دیواری خانوویەکەوە، کە لە زەمینەوە هەڵناستێت، بەڵو بە کۆڵەکەیەك یان هەڵگری دەرچوو لە دیوارەکەوە رادەگیرێت.

**ئێس-ئا** (Sturmabteilung = SA): لەکاتی کۆماری ڤایماردا رێکخراوێکی نیمچە سەربازیی (NSDAP = پارتی کرێکارانی ناسیۆناسۆسیالیستیی ئەڵمانی) بوو و رۆڵکێکی گەورەی گێڕا لە دەسەڵاتسەندنی (NSDAP)دا.

**ئێتیمۆلۆژی**: زانستی سەرچاوە و واتای سەرچاوەیی وشە.

**ئیدێنتیتێ**: هاوشێوەیی، شوناس.

**ئیندیڤید**: تاك، تاکەکەس.

**ئیندوستری**: کۆی ڤابریکە دروستکەرەکانی / بەرهەمهێنەرەکانی شمەك یان پیشەسازی.

**ئینتوئیتیڤ**: (ئینتوئیسیۆن واتا حەدەس)، روانینێکی روون و ئاشکرای کرۆکێك یان رەوشێك.

**ژینجیهان:** (Lebenswelt) تێگەیەکی تایبەتمەندی فێنۆمێنۆلۆژیی هوسەرلە و بەرێی ئەویشەوە هاتۆتە نێو فەلسەفەوە. ژینجیهان ئەو جیهانەیە کە هەر تاکێك پێش هزرین یان کاری زانستی تێیدا دەژی.

**کاتیگۆری:** تێگەی بناغەیی

**کانسلەر:** سەرۆکوەزیرانی ئەڵمانیا

## کۆنتێکست: (سیاق).

**کۆنسێپت:** پلانی یان خشتەی یان ئەسکەلای تیۆریی.

**کۆتێز:** (پێکهێنان) مرۆڤ بۆ نموونە دەربڕینێکی وەك تێز هەیە، پاشان ئەنتیتێزێك یان دژە دەربڕینێکی دیکە ئاڕاستەی دەربڕینەکەی ئەو دەبێتەوە یان ئەو خۆی بەرەنگاری دەکاتەوە. مرۆڤ ئێستا دەتوانێت لەو تێز و ئەنتیتێزە کۆتێزێك چێبکات.

**کۆنفێکت:** خۆیی یان نیشتەجێگەی فێرخوازانی تیۆلۆژیی کاتۆلیکی.

**کریتێر:** مۆرك، سەنگی مەحەك.

**لۆگیکی دووبەهایی:** لە لۆگیکی کلاسیکیدا هەموو گۆتەیەك تەنیا دوو بەهای ڕاستیی هەیە: دروستە یان هەڵەیە. بنەمای لۆگیکی دووبەهایی بریتییە لە 'ڕێسای سێیەم بەدەرکەر'، واتا لەنێوان دروست و هەڵەی گۆتەیەکدا ناشێت سێیەمێك هەبێت. گۆتەکە یان دروستە یان هەڵەیە.

**مێتافۆر:** (مەجاز)

**ناسیۆنالسۆسیالیزم:** کورتکراوەتەوە بۆ نازیزم کە ئیدیۆلۆژییەکی فاشیستی بوو بە مۆرکە تایبەتمەندە ئەڵمانییەکەیەوە.

**نیهیلیزم:** جیهانبینیی بێهودەیی سەرجەم بوونەوەر؛ نەرێنیکردنی یان هیچاندنی نۆرم و بەهاکان.

**نۆرم:** پێوەر (معیار)

**ئۆبژێکت:** بابەتی یان حاڵەتی یان کێشەی دانراو لە لایەن سەبژێکتی ئاگامەندەوە. بە کوردی بابەت بەکاردەهێنرێ کە راست نییە، ئەویش چونکە مەرج نییە بابەتێك دانراوی (مەوزوعی) سەبژێکتێك بێ.

**ئۆبژێکتی:** دیدی یان تێڕوانینی یان روانگەی فەزلدەر بە دانراوەکەی (واتا بە مەوزوعەکەی) سەبژێکت.

**ئۆنتۆلۆژی:** بووناسی.

**ئۆتۆریتی:** دەسەڵاتدارییەکی وەرگیراو بەڕێی سومنەیەوە، هەروەها لێترسراوییەوە.

**پارادیگما:** نموونە (نموژج).

**پەرەگراف:** بڕگە لە تێکستی یاسایی یان لێکۆڵینەوەی زانستیدا.

**پێشبڕیار:** لە لۆگیکدا بڕیار ( Das Urteil/ قچیە) هەیە کە هەنگێوەری بابەتەکە یان حاڵەتەکەیە و لە زەینەوە دەدرێت. بەڵام پێشبڕیار لە بۆچوونەوە بەبێ بناغە، کەواتە بەبێ ناسینی بابەتەکە یان حاڵەتەکە، دەردەبڕرێت.

**پۆلیتێیا:** ناوی دیالۆگە بەناوبانگەکەی پلاتۆنە کە وەرگێڕراوە بۆ "کۆمار" یان "دەوڵەت". بەڵام هەروەها دەشێت وەربگێڕرێت بۆ "دەستوور".

**پراکسیس:** کردار

**پسیکۆلۆژیزم:** رێبازێکی فەلسەفەیی بوو کە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم لە ئێنگلاندەوە تەشەنەی کرد بۆ سەر کیشوەری ئەوروپا. ئەم رێبازە فەلسەفەییە وای دادەنا کە سەرجەم تێگە و رستەکانی لۆگیك پێوەرن بۆ

هزرینی دروست و هاوکات به شێوەیەکی پسیکۆلۆژییانه شیاوی لێتێگەیشتنن.

**راسیۆنالێتی:** راسیۆ واتای ئاوەز دەگەیەنێت، بەڵام راسیۆنالێتی هزرینی ئاوەزمەندی پابەندە بە کاراییەوە، بە ئەنجامخوازییەوە، ئەمەش مۆرکێکی هزری نوێسەردەم و مۆدێرنی ئەوروپییە. هەر لەم روانگەیەوە ناشێت راسیۆنالیزمی نوێ وەربگێڕرێت بۆ ئاوەزگەرایی یان ئەقڵگەرایی.

**رایش:** دەوڵەت.

**رەگەز / جۆر:** لە لۆگیکدا یەکەم توخمی هۆش بریتییە لە "تێگە"، بۆ نموونە "ئەسپ". لە تێگەکانەوە جۆر و رەگەز دەکەونەوە. ئەسپ جۆرێکە کە سەر بە رەگەزی زیندەوەرە.

**رەگەزی باڵاتر و جیاوازیی تایبەتی/جۆری** ( genus proximum per differentiam specificam): ئەم جیاوازیکردنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەریستۆتێلیس. لێرەدا دوو تێگەی رەگەز و جۆرمان هەیە، بۆ نموونە "مرۆڤ" پێناسە دەکرێت وەك "زیندەوەری ئاوەزمەند"، زیندەوەر رەگەزی باڵاترە و مرۆڤ سەر بە زیندەوەرانە، بەڵام تایبەتێتی مرۆڤ لەنێو زیندەوەراندا ئەوەیە کە ئاوەزمەندە.

**رەگەزگەرایی:** دانانی رەگەزێکی مرۆڤی، بۆ نموونە رەگەزی سپیپێست، یان رەگەزی گەلێك، لە سەرووی رەگەزی دیکەی مرۆڤ و گەلانی دیکەوە.

**رێکتۆر:** سەرۆکی زانکۆ.

**رێکتۆرات:** سەرۆکایەتیی زانکۆ.

**رێفیزیۆنیست:** هەوڵدان بۆ گۆڕینی دۆخێك، بۆ نموونە لەم کۆتێکستەی ئێرەدا بۆ گۆڕینی راستڕەوانەی کۆمەڵگە.

**سەبژێکت:** بکەری ئاگامەند کە مێتۆدیانە زانست بینادەکات.

**سەبژێکتی:** کارێکی هزری کە تەواو لە خۆیەکی بکەرییانەوە ئەنجام بدرێت.

**سەرمەدی:** سەرکاتی، نەگۆڕ.

**سێنس:** واتای هەست (بۆ نموونە شەش هەستەکە) ناگەیەنێت. هەست دیاردەیەکی پسیکۆییە، بەڵام سێنس ئۆرگانییە و بریتییە لە تۆمارگریی فیزیۆلۆژیانە لەنێو مرۆڤ و ئاژەڵە پێشکەوتووەکاندا. سێنسەکان بریتین لە سێنسی بینین، بیستن، چێژتن، بۆنکردن، گرتن. جگە لەمە سێنس فروانترە ترە لە هەست، چونکە پەلدەهاوێتە ناو ئاڕاستەوەرگرتن و واتاوە.

**سیمپاتی:** سۆزێکی پۆزەتیف

**سیتات:** (اقتباس)

**سکۆلایستیک:** شێوازی هزرینی کریستیانی بوو لە کۆتایی چەرخی نێڤیندا، واتای هزرینی فێرگەیی (سکۆلایی) دەگەیەنێ کە هەمیشە پابەند بە سێ دەسەڵاتە گومانلێنەکراوەکەی بیبل، باوکانی کلێسە و ئەریستۆتێلیسەوە دەهزرا. **سکۆلایست:** زانایەك کە پەڕوەری شێوازی هزرینی سکۆلایستیکی بکات.

**تێیزم:** جیهانبینییەك کە خودایەکی خولقێنەر لە دەرەوەی جیهان گریمانە دەکات.

**تیۆلۆژی:** زانستی خوداناسی، کە لە هەبوون و مۆرکەکانی خودا دەکۆڵێتەوە.

**تیۆریی زانین**: لەپاڵ ئێتیك و لۆگیك و ئۆنتۆلۆژیدا یەکێکە لە لکەکانی فەلسەفە و لەتەك بونیادە بناغەییەکانی ناسینی / زانینی داکەوت لە لایەن ئێمەوە خەریك دەبێت. پرسیارەکە ئەوەیە کە داخۆ چۆن بشێت زانینەکان وەك راست و متمانەپێکراو دابنرێن.

**تۆپۆگرافی**: تۆمارکردن و وەسفکردنی ناوچەی جیۆگرافی.

**ترادیسیۆن**: دابی شێوازێکی کارکردن (بە ئەرەبی "تقالید")، ئەوەیە کە لە رابوردووەوە گەیەنراوە و سەروەریی هەیە. ترادیسیۆنی فەلسەفە بەواتای دابی کارکردنی فەلسەفەیی.

**ترانسسێندێنیس**: سەرئەزموون، لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەزموون (متعالی).

**ئوربانی**: رەفتاری شاری، کراوە بۆ جیهان

**ڤاندەرفۆگل**: بزووتنەوەیەکی فێرخوازانی فێرگەیی و زانکۆیی رەچەڵەك بۆرژوا بوو کە ساڵی 1896 لە شتێگلیتس ی نزیك بەرلین هاتە ئاراوە. ئەندامانی ئەم بزووتنەویە خۆیان لە رێنوما فێرکاری و کۆمەڵایەتییەکان جیاکردەوە و هەوڵیان دەدا لەنێو سروشتدا گۆڕان بە شێوازێکی خۆیی ژیان بدەن.

**ڤێزن**: وەك ناو واتای کرۆك، جەوهەر، ئێسێنس (ماهیەت)، یان ئیدێی پلاتۆنی دەگەیەنێت، بەڵام هایدێگەر (وەك کردار / ڤێرب) بەکاریدەهێنێت، واتا وەك بەکرۆکبوون.

**وەرچەرخان** (Die Kehre): گۆڕینی روانگەی هایدێگەر لە ئۆنتۆلۆژیی بناغەییەوە بۆ پرسیاری بوون، واتا کێشەی ئەو چیدی پرسیار نییە لەبارەی مەغزای بوون یان کات وەك ـۆی ترانسێندێنتالی بوون، وەك

چۆن لە 'بوون و کات'دا دەیکات، بەڵکو ئێستا هزرینی ئەو لە بوون بەند دەبێت بەو پرسیارەوە کە چۆن بوون لەنێو خۆیەوە خۆی چ ئاشکرا دەکات و چ دەشارێتەوە.

**زەمێستەر:** سیستەمی فێربوونی زانکۆیی لە ئەڵمانیا ساڵانە نییە، بەڵکو زەمێستەرییە، کەواتە کۆرسییە.

# فەرهەنگی هایدێگەر

تێبینی: ئەم فەرهەنگۆکە بەگوێرەی ئەلفبای کوردی-لاتینی ڕێکخراوە.

**ئامادە** (Gegenwart): هەبوویی لە ئایندەوە سەرهەڵدەدات. ئایندەی بەکرۆکبوو لەنێو خۆیەوە ئامادە بەرەڵادەکات (326 .S ,65 §). ئێکستازەکانی کاتێتی بریتین لە ئایندە و هەبوویی و ئامادە ( .S ,65 § 329). ئامادە بەربوونەوە دەشێنێت (346 .S ,68 §).

**ئاپریۆری** (Apriori): فەلسەفە بریتییە لە ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی، ڕوودەکاتە مەرجی ئاپریۆریانەی/ سەرئەزموونیانەی شیاندنی ئەو ئۆنتۆلۆژیانە کە بناغە بە زانست دەدەن (3 §). فەلسەفە بریتییە لە لێتوێژینەوەی ئاپریۆریانەی بوون (38 .S ,7 §).

**ئاشکراکردن** (Freilegung): ئاشکراکردنی مەغزا ئەو واتایە دەگەیەنێت کە شیانراو بەرێی پرۆژەوە ئاوەڵابکرێت. ئەم ئاشکراکردنە بریتییە لە ئاوەڵاکردنی ئاراستەی (das Woraufhin) بەپرۆژەکراوەکە. ئاراستە ئەوەیە کە بەپرۆژەکراو دەشێنێت (324 .S ,65 §).

**ئاوەڵایی** (Erschlossenheit): ئاوەڵایی بوون خۆی لە بەپرۆژەکراویی بووندا دەبینێتەوە رووەو 1) بۆ-خاتری-ویست پێکەوە لەتەك 2) واتامەندیدا (148 .S ,31 §). ئاوەڵایی لە-جیهان-بوون ئێکزیستێنسیالانە حاڵی هەستەکی و تێگەیشتن ی پابەند بە حاڵی هەستەکییەوە پیشان دەدات. شیمانەکان کە بەرێی میزاجمەـییەوە "بینراون"، بە شێوەیەکی

بەپرۆژەکەرانە ئاوەڵادەکرێن (§ 31, S. 148). "ئاوەڵایی بریتییە لە جۆرە بناغەییەکەی دازاین و بەگوێرەی ئەم جۆرەش بریتییە (*ist*) لە بوون لێرە. ئاوەڵایی بەرێی حاڵی هەستەکی و تێگەیشتن و قسەوە چێدەکرێت و یەکسەر لە سەرچاوەوە جیهان و لەنێو-بوون و خود (das Selbst) دەگرێتەوە. ئاوەڵایی داکەوتییە (§ 44, S. 221). ئاوەڵایی دەرفەت بۆ دازاین دەرەخسێنێت کە لێرە ی خۆی بێت (§ 55, S. 270). ئاوەڵایی بریتییە لە راستی ی سەرچاوەیی (§ 60, S. 297). ئاوەڵایی جیهان بریتییە لە بناغەی ئاشکراکراویی حازردەست (das Zuhandene) و پێشدەست ( das Vorhandene).

**ئازادی** (Freiheit): "دازاین شیمانەبوون ی دراوە بە خودی خۆی، ئەو تەواو شیمانەی فرێدراوە. دازاین شیمانەی ئازادبوونی هەیە بۆ خۆییترین توانین-ی-بوون" (§ 31, S. 144). سام دازاین وەك شیمانە ئاوەڵادەکات تاکو دازاین ئەوە بێت کە ئەو دەشێت پێی ببێت، ئەمەش بێگومان "تەنیا لە خودی خۆیەوە وەك تەنیاکەوتووی نێو تەنیاکەوتن"، واتا: "ئازادبوون بۆ ئازادی ی خۆ-هەڵبژاردن و خۆ-دەستپێکردن"، ئازادبوون بۆ خۆیەتی ( § 41, S. 193). ئازادی تەنیا لە هەڵبژاردندایە، ئەمە هەروەها ئازادی ی نا-هەڵبژاردن ... دەگرێتەوە (§ 58, S. 285). دازاین چەند خۆییتر بەورە بێت / قەرار بدات، ئەوەندەش شیمانەی دەربوون رۆشن و بێرێکەوت دەبێت. "تەنیا ئازادبوون بۆ مەرگ، ئامانج بە دازاین دەدات و دەربوون دەخاتە دوایەکێتییەکەیەوە" (§ 74, S. 384).

**بایەخمەندی** (Bewandtnis): بایەخی چەکوش لە داکوتیندایە، بایەخی چەتر پاراستە لە کەشی نالەبار (§ 18, S. 84). بایەخ بریتییە لە بوونی

حازردەست (§ 18, S. 87). کاتێك دەگۆترێت: "شتێك لەلای شتێك بایەخی هەیە"، ئەوا ئەم گۆتنە دەربڕینێکی ئۆنتی/ئەمپیری نییە، بەڵکو ئۆنتۆلۆژیانەیە کە (ناڕاستەوخۆ) کارەکتەری پەیوەندی ی بایەخ ("لەتەك ... لەلا ...") دەردەبڕێت (§ 69, S. 353).

**بانگی ویژدان** (Gewissensruf): ویژدان بانگێکە. بانگکردن جۆرێکی ئاخافتنە/قسەیە. بانگ ئەدگاری بانگلێکردن-ی هەیە: بانگ دەکات بۆ خۆییترین تاوان-ی-خود-بوون. بانگلێکردن شێوازێکی بانگەوازە بۆ خۆییترین گوناهباربوون (§ 54, S. 269). تەریب بە بانگی ویژدان بیستنێکی شیاو هەیە، واتا: تێگەیشتن لە بانگلێکردنەکە (§ 54, S. 270). بانگکردن جۆرێکی قسەیە/ئاخافتنە و ساتێکی ڕاچەنین لەخۆدەگرێت، جگە لەوە وشەی بانگکردن ئاماژە بۆ ئەوە دەدات کە دەبێت کەسێك 'بگەڕێنرێتەوە' (§ 55, S. 271). لە بانگی ویژداندا (کە قسەیە) قسەبۆکراو (بانگلێکراو) بریتییە لە دازاین، واتا خود-ی-مرۆ ی لەتەکبوون وەك بەتەنگەوەهاتوو لەتەك ئەوانیدیدا (§ 56, S. 272). خود-ی-مرۆ ڕووەو خود ی خۆی (وەك لە-جیهان-بوون) بانگدەکرێت و لێرەشدا باز بەسەر مرۆ و بەیانکراوی ی گشتیدا دەدرێت (سەرباری ئەوە ئەوانیش دەهەنگێورێن). بانگەواز ڕوودەکاتە خود ی بانگکراو بۆ (قبووڵکردنی —و) خۆییترین توانین-ی-بوونی خۆی: بانگەکە بەرەو-پێش-بانگکردنی دازاینە بۆ نێو شیمانەکانی. "قسەلێکراو "تەواو بەپوختی بیگرین – (هیچ) نییە"ـە. ئاخر ویژدان بە جۆری بێدەنگبوون دەدوێت (§ 56, S. 273). بانگی ویژدان ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام خود-ی-مرۆ بە هەڵە ڕاڤەی دەکات (§ 56, S. 274)). هەڵەیە گەر ئەو دەنگە بە دەنگی خودا یان کاراییەکی

بیۆلۆژیانە دابـڕێت. بانگەکە "لە منەوە بەسەر مندا رووکردووە من" دێت (§ 57, S. 274). بانگکەر دازاینە لەنێو مەترسیی خۆیدا (...). ئەم دەنگە بە مرۆی گومبووی نێو "جیهان" تەواو نامۆیە. بانگی ویژدان جەخت دەکات: مەترسی هەرەشە لە بزربوویی خۆلەیادکردووی دازاین دەکات (§ 57, S. 276-277). لە بانگی ویژداندا مەترسی دازاین دەخاتە بەردەم نەبوونی خۆی. دازاین خودی خۆی لە مەترسییەوە بۆ توانین-ی-بوون بانگ دەکات. بانگلێکردنەکە (...) لە دازاین دەگەیەنێت کە (...) ئەو گوناهبارە (§ 58, S. 287). بانگ لەگۆڕێدا نییە، "بانگ جۆری بوون ی زۆرگەی هەیە و تێیدا دازاین هەر هەیە، بە چەشنێك کە ئەو هاوکات رووەدەکاتەوە فڕێدراوییەکەی" (§ 59, S. 291).

**بەئامادەکردن** (Gegenwärtigen): دازاین کە هەنگاونەرانە وەری وەرگرتبێت، دۆخی ئێرە ئاوەڵادەکات. بوون لەلا ی بوونەوەری نێوجیهانی تەنیا لە بەئامادەکردنی ئەم بوونەوەرەدا دەشێت. وەرە کە دەرفەتدانی تێکنەدراوی گەیشتنە بە دەستپێکردن (des Ergriffenen)، تەنیا وەك ئامادە (لە مەغزای بەئامادەکردندا) دەشێت (§ 65, S. 326). بناغەی بەربوونەوە لە بەئامادەکردندایە. بەئامادەکردنی سەرچاوەیی لە ئایندە و هەبووییدا "بەندکراو"وە: دازاینی بەورە خۆی لە بەربوونەوەوە دەگرێتەوە و لە "چاوتروکاندنێکدا / ساتێکدا" خۆییانە "ئێرە"یە (§ 65, S. 328). بەئامادەکردن ئامادەی ناخۆییە. لە رووی شێوەکییەوە بڕوانین، هەموو ئامادەیەك بەئامادەکەرە (gegenwärtigend)، بەڵام هەموو ئامادەیەك "ساتەکی" نییە (§ 68, S. 338).

بەربوونەوە: (فێرفالن / Verfallen). واتای وشەی فێرفالن بەگوێرەی فەرهەنگ بریتییە لە: داڕزین، داوەشان، کەوتن، هەروەها دەشێت تیۆلۆژییانە دیاریبکرێت وەك ژێرپەڕینی مرۆڤ بەهۆی گوناهە رەچەڵەکییەکەیەوە کە لە بەهەشتی خودایەتی ئەنجامی داوە. بەڵام ئەم وشەیە لەلای هایدێگەر بریتییە لە ئێکزیستێنسیالێك: "بەربوونەوە بریتییە لە جۆرێکی ئێکزیستێنسیالی لە-جیهان-بوون" (§ 38, S. 176). بەربوونەوە بریتییە لە ناخۆیەتیی دازاین (§ 38, S. 176). بەربۆوەیی دازاین 'ژێرپەڕین' (Fall) نییە لە 'دۆخێکی هەرە سەرەتایی' باڵاترەوە (لە بەهەشتەوە – و). دازاین لە خودی خۆی دازناوە و بۆ (نێو) جیهان کە سەر بە بوونی خۆیەتی، بەربۆتەوە. لە رووی دەربوونییەوە، بەربوونەوە نەك تەنیا لە-جیهان-بوون، بەڵکو هەروەها فڕێدراویش دیاری دەکات (§ 38, S. 179). بەربوونەوە بۆیە دەشێت، چونکە کێشەی دازاین لە-جیهان-بوون ـەکەی خودی خۆیەتی. کەواتە بەربوونەوە دەربوونی دازاین دەراستێنێت نەك دژبێژیی بکات (§ 38, S. 179-180). دازاین بەردەبێتەوە بۆ نێو قووڵایی و هیچێتیی رۆژانەی ناخۆیی (§ 38, S. 178). گێژاو (Wirbel) ئەدگاری بەربوونەوەیە. (§ 38, S. 178) بەربوونەوە هەڵاتنی دازاینە لە خودی خۆی (§ 40, S. 184). بوون لە بەربوونەوەدا نەسڕاوەتەوە و بەمەش بووبێت بە بوونەوەر، بەڵکو بێڕیشە بووە. گومانی تێدا نییە کە لێرەدا بوونەوەر ناشکراکراوە، بەڵام شێوێنراوە (واتا وەك رواڵەت خۆی پیشان دەدات). دازاین لەنێو "ناڕاستی"دا بەربۆوەیە. داخراوی و داپۆشراوی سەر بە فاکتیسیتێی دازاینن (§ 44, S. 222). بەربوونەوە نەبوون لە خۆ دەگرێت: دازاین خودی خۆی ***نییە*** ( § 58, S.

284). بناغەی بەربوونەوە لە هەنووکەدایە. دازاینی بەورە خۆی لە بەربوونەوەوە دەگرێتەوە و لە "سات"دا ("چاو-تروکاندندا" -Augen Blick) "لێرە"یە (328 .S ,65 §).

**بەتەنگەوەبوون**، (بێزۆرگن / besorgen) واتای 'بێزۆرگن' پێشزانستیانە، یان لە رووی ئۆنتیکەوە (ئەمپیرییەوە - و)، بریتییە لە ئەنجامدان، بەجێگەیاندن، تەواوکردن (erledigen)، بۆخۆهێنانی شتێك، هەروەها سڵەمینەوە لە شتێك. بەڵام 'بێزۆرگن/بەتەنگەوەبوون' لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە بریتییە لە ئێکزیستێنسیالێك: بوونی لە-جیهان-بوونێك ی شیاو" (57-56 .S ,12 §). بەتەنگەوەبوون هەبوونی زۆرگەیەکە کە بوون-لەلا-کەی بریتییە لە حازردەستێك (193 .S ,41 §). دەوروبەربینین (Umsicht) دەبێت بە پاڵهێزی بەتەنگەوەبوونی "پراکتیکی" ( .S ,69 § 358).

**بناغەبوون** (Grundsein): بناغەبوون بە واتای هۆکار-بوون (283 .S ,58 §). مەبەست لە بناغەبوون نەگەیشتنە بە شیمانەکانی خۆ، یان هەرگیز سەروەرنەبوونە بەسەر بوونی خۆدا (284 .S ,58 §). دازاین بناغەی بوون ی خۆی نییە. دازاین وەك خودبوون بوونی بناغەیە (؟) (285 .S ,58 §). کاتێتی بناغەی ئێکزیستێنسیالی زۆرگەیە (351 .S ,69 §).

**بوون** (Sein): بوون بوونی بوونەوەرێکە، ئەوەیە کە بوونەوەر وەك بوونەوەر پێکدەهێنێت. بوون بوونەوەر نییە. بوون تەنیا لە تێگەیشتنی بوونەوەری لە بوون تێگەییودا هەیە، هیچ بوونێك بەبێ تێگەیشتنی نییە — بوونەوەر بە پێچەوانەوە سەربەخۆیە لە ناوەڵایی. "بوونەوەر سەربەخۆیە لە ئەزموون و ناسین و دیاریکردن، کە بە ڕێیانەوە ناوەڵا و

ئاشکراو و دیاری دەکرێت. بەڵام بوون تەنیا لەنێو تێگەیشتنی بوونەوەردا 'هەیە' (ist)، ئەمەش بوونەوەرێکە کە تێگەیشتنی بوون سەر بە بوونێتی. بۆیە دەشێت مرۆ لە بوون تێنەگەیشتبێت، سەرباری ئەمە بوون هەرگیز وەك تەواو لێتێنەگییو نامێنێتەوە" (§ 39, S. 183). تەنیا گەر دازاین هەبێت، ئەوا بوونیش دەبێت، چونکە تێگەیشتنی بوون پێشمەرجی بوونە. بە پێچەوانەوە بوونەوەر ئەو کاتەش هەر دەبێت، گەر چیدی دازاین نەبێت (§ 43, S. 212).

**بوون رووەو کۆتایی** (Sein zum Ende): بوون رووەو مەرگ. مەرگ لە رووی دەربوونییەوە بریتییە لە فێنۆمێنی رووەو-تەواو-بوونی دازاین، بریتییە لە بوون رووەو مەرگ (§ 45, S. 234). ئەدگاری رووەو-کۆتایی-خۆ-هاتن (پەیوەند بە ئەویدییەوە) بریتییە لە چیدی-نە-بوون. رووەو-کۆتایی-هاتن ی (خۆ) لەتەك دازایندا یەکناگرێتەوە (§ 48, S. 242). کۆتاییهاتن دەشێت تەواوبوون بێت وەك دیارنەمان (بارانەکە ئێستا تەواو دەبێت / خۆش دەکاتەوە) (§ 48, S. 244). کۆتایی دەشێت نیشانە بێت بۆ شتێك وەك پێشدەستێکی تەواوکراو (تابلۆ بە دوایەمین فلچەلێدان تەواو دەبێت) یان تەواونەکراو (رێگەکە لێرەدا دەفرتێت). "تەواوکردن بریتییە لە جۆرێکی بناغەیی 'توانستی تەواوکاری'". بەڵام مەرگ جیاوازە: "لە مەرگدا دازاین نە تەواوکراوە، نە سووك و ئاسان بزربووە، نە لێبۆتەوە، نە وەك پێشدەست بەتەواوی شیاوی بەکارهێنانە". دازاین هەمیشە بریتییە (*ist*) لە کۆتایی خۆی. دازاین بوون رووەو مەرگە (§ 48, S. 245).

**جیهان-ی-دەور** (Umwelt): بریتییە لە نزیکترین جیهانی رۆژانەی دازاین (§ 14, S. 66). پێشگری (*Um*) لە (Umwelt)دا نیشانەیە بۆ ناوچەکە ( § 22, S. 103).

**چەقەچەق** (Gerede): چەقەچەق بریتییە لە جۆری رۆژانەی بوون ی قسە/ئاخافتن (§ 36, S. 173). چەقەچەق جۆری بوون ی تێگەیشتن و بەیانکردنی (Auslegung) دازاینی رۆژانە چێدەکات (§ 35, S. 167). بەیانکراوی ی رۆژانە ...ی چەقەچەق لەنێو دازایندا نیشتووە و نەشیاوی دەستبەردارییە، ئەم بەیانکراوییە دیاریکەری ئەوەیە کە مرۆ بیر لە چی بکاتەوە و هەست بە چی بکات (§ 35, S. 170). چەقەچەق ناوەلاکردن نییە، بەڵکو داخستنی لە-جیهان-بوون-ە و خەریکبوون بە تێگەیشتنەوە لاواز دەکات، جا گەرچی بەرهەمی پنتی لێوەدەرچوونە بۆ ئەو خەریکبوونە (§ 35, S. 169).

ئایا چەقەچەق چۆن سەرهەڵدەدات؟ بیستەر دەشێت، بەگوێرەی شیمانەی مامناوەندیانەی تێگەیشتن، بە شێوەیەکی رواڵەتی لە ئاخافتنی راگەیەنراو تێبگات، بەبێ ئەوەی خۆی بکات بە بوونێك کە لە قسەلێکراو تێبگات. راگەیاندنەکە پەیوەند بە قسەلێکراوەوە قسە ناکات، بەڵکو پێکەوەبوون دەبێت بە بەتەنگەبوونی قسەکراو (§ 35, S. 168).

**چیدیلێرەنەبوون** (Nichtmehrdasein): بریتییە لە بوونی (کەسی) مردوو. پەیوەندیی بوون بە مردووەوە (پرسە، ناشتن، کولتی گۆڕستان) بریتییە لە لەتەکبوون لەتەك ئەودا بە جۆری فیورزۆرگەی رێزلێنان، نەك بریتی بێت لە بوونی بەتەنگەوەبوو لەلای حازردەست/دەردەست، هەروەها بوونێکی دیاریکەری پێشدەستیش نییە (§ 47, S. 238).

**دا-زاین** (Da-sein): لێرە-بوون.

**دازاین** (Dasein): دازاین بۆ هایدێگەر من-سەبژێکت نییە، تەنیا "پیشاندانی شێوەکییە". دازاین ئەو بوونەوەرمیە کە من هەردەم ئەوم. دازاین ئەم مۆرکانەی هەیە: 1) ئەو دەتوانێت دەرکی خۆی و جیهان بکات، 2) ئەو لە بوونەوەر تێدەگات، 3) ئەو گرنگی بە بوونی خۆی دەدات (کێشەی ئەو خودی بوونی خۆیەتی). دازاین بوونەوەرێکی پێشدەست نییە (vorhandenes)، بەڵکو بەرێی دەربوون و هەرخۆمییێتیەوە دیاری دەکرێت (43 .S ,9 §). لە شرۆڤەی دازایندا خۆ تەواو ئاگامەندانە لە وشەکانی 'مرۆڤ'، 'سەبژێکت'، 'ژیان'، 'دەروون'، 'هۆش'، 'کەس' و 'ئاگایی' بەدوور دەگیرێت، ئەمەش بۆیە، چونکە ئەوان ناوچەی تایبەتیی فێنۆمێن دیاری دەکەن. پێشمەرجی ئەوان ئەوەیە کە ئێمە دەمانەوێت لێی بتوێژینەوە، واتا بوونی دازاین (46 .S ,10 §). پابەندیی لە کرۆکەوە سەر بە بوونی دازاینە (87 .S ,18 §). دازاین تەنیا بۆ خاتری خودی خۆی نییە. ئەو وەك لەتەکبوون بۆ خاتری ئەوانیدیکەشە (123 .S ,26 §). دازاین سەرەتا و بەزۆریی مرۆیە (129 .S ,27 §). "دازاین شیمانەبوون ی بۆ خۆ جێهێڵراوە؛ تەواو شیمانەی فرێدراوە. دازاین شیمانەی ئازادبوونە بۆ خۆییترین توانین-ی-بوون (Seinkönnen) (144 .S ,31 §). دازاین لە جۆری بوونی پرۆژەداناندا فرێدراوە. دازاین هەر لە پێشەوە خۆی کردووە بە پرۆژە و هەمیشە پرۆژەدانەرە. دازاین هەمیشە لە شیمانەوە لە خۆی تێدەگات (145 .S ,31 §). ئەدگارە ئۆنتۆلۆژییە بناغەییەکانی دازاین بریتین لە دەربوونێتی، فاکتیسیتێ، بەربۆومیی (191 .S ,41 §). دازاین لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە بە بنەمایی : هەموو پێشدەستێك و ریالێك

جیاوازە. بناغەی "بەردوام‌بوون"ی (Bestand) ئەو لە "خۆبەردەوامی"ی (Selbstständigkeit) خودی ئەودایە وەك پیادەکەری دەربوون ( .S ,61 § 303).

**دەربوونی** (Existenziell): ناونیشانێکی ئۆنتییە، بریتییە لە تێگەیشتنی ئۆنتی ی دەربوونی خۆ لە لایەن دازاینەوە (S. 12 ,4 §).

**دەربوونی خۆیی** (eigentliche Existenz): مرۆ خۆییەتیی دەربوون لە ویژداندا دەبینێتەوە (S. 234 ,45 §). هەنگاونان بریتییە لە شیمانەی دەربوونی خۆیی (شیمانەی تێگەیشتنی ئەوپەڕی خۆییترین توانین‌ی‌بوون) (S. 263 ,53 §). مسۆگەریی مەرگ مسۆگەریی لە‌جیهان‌بوون‌ـە، بریتییە لە (مسۆگەریی) خۆیەتیی پڕی دەربوون (S. 265 ,53 §).

**دۆخ** (Situation): بریتییە لە ئێکزیستێنسیالێك. دۆخ لە ورەدا ریشەی داکوتیوە (وەك چۆن فەزایێتی ی ئێرە لە ئاوەڵاییدایە). دۆخ بریتییە لە ئێرەی ئاوەڵاکراو لە ورەدا (S. 299 ,60 §). دۆخ لە مرۆ داخراوە ( .S ,60 § 300). دازاینی بەورەی هەنگاونەر دۆخی ئێرە ئاوەڵا دەکات (S. 326 ,65 §).

**دوایەکێتی** (Endlichkeit): زۆرگە بوون رووەو مەرگە. ورەی هەنگاونەر بریتییە لە بوونی خۆیی رووەو شیمانەی ناشیمانەی خودی دازاین. دازاین لە بوون رووەو کۆتاییدا کۆتاییەکی نییە کە جارێ پێینەگەیشتبێت، بەڵکو ئەو "دوایەکییانە دەربوون پیادە دەکات". ئایندەی خۆیی دوایەکییە، نەك لەبەر ئەوەی تەواو دەبێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی توانین‌ی‌بوون دادەخات (S. 329-330 ,65 §). بێدوایەکێتیی کاتێتی دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی کورتهێن لە کات، لێرەدا مرۆ تەنیا "کات"ی بێدوایەکی دەناسێت بەبێ ئەوەی لێی تێبگات (S. 330 ,65 §). کاتێتیی خۆیی

دوایەکییە، کاتێتیی ناخۆیی (تێگەی ترادیسیۆنی و کورتهێنی کات) بێدوایەکییە (§ 65, S. 331).

**ئێکستاز:** (Ekstase)؛ واتا فەرهەنگییەکەی: حاڵێهاتن، واتای وشەیی: دەرپەڕین لەنێو خودی خۆوە. ئێکستازەکانی کاتێتی لەلای هایدێگەر بریتین لە  ئایندە، هەبوویی (رابوردوو)، ئامادە (§ 65, S. 329). کاتێتی سەرەتا بوونەوەرێك نییە کە لەنێو خۆیەوە دەربپەڕێت، بەڵکو لە کرۆکدا بەکاتکردنە لەنێو یەکێتیی ئێکستازەکاندا (§ 65, S. 329). ئایندە لە پێش هەبوویی و ئامادەوە فەزڵی هەیە، جا گەرچی هەر سێ ئێکستازەکە هاوسەرچاوەن (§ 65, S. 329). "کاتێتی لە کرۆکەوە ئێکستازییە" (§ 65, S. 331). کاتێتی بریتی نییە لە بەدوورییەکهاتنی رابوردوو و ئامادە و ئایندە، بەڵکو هەمیشە لە یەکایەتیی سێ ئێکستازەکەی هەبوویی و ئامادە و ئایندەدا بەکاتدەبێت (§ 68, S. 350). یەکایەتیی ئێکستازیانەی کاتێتی مەرجە بۆ شیمانەی ئەوە کە بوونەوەر وەك بوون "لێرە" دەربوون پیادە بکات (§ 69, S. 350).

**ئێکزیستێنسیال** (Existenzial)؛ ناونیشانێکی ئۆنتۆلۆژیانەیە. ئەدگاری بوون ی دازاینە. هۆی ئەم جۆرە ناونانە لەوەدایە کە ئێکزیستێنسیالەکان لە دەربوونەوە شیاوی دیاریکردنن (§ 9, S. 44)، ئەوان بە پێچەوانەی کاتیگۆرییەکانەوە بریتی نین لە ئەدگاری پێشدەست، بەڵکو شیمانەی دازاینن (§ 9). لە رووی ئۆنتۆلۆژیی سەرنەزموونییەوە هەر ئێکزیستێنسیالێك"گشتێتی"یەکی ترانسسێندێنتالە نەك بەگشتیکردنێکی تیۆرییانەی ئۆنتی / ئەمپیری (§ 42, S. 199).

**ئێره/لێره** (»Da« Das)؛ دازاین "ئێره"ی خۆیەتی، واتا فەزاێتی ی دەربوونیانەی ئاوەڵاکردووە. "ئێره" "لەئێرەیه/لێرەیه" (hier). دازاین بەرێی "ئێره"وە (ئاوەڵایی فەزایی) "لێره"یە پێکەوە لەتەك دازاینی / لێرەبوونی جیهاندا (§ 28, S. 132). حاڵی هەستەکی دازاین دەهێنێتە بەردەم بوونی خۆی وەك "لێره" (§ 29, S. 134). حاڵی هەستەکی و تێگەیشتن دوو بونیادی هاوبنەڕەتی ئێکزیستێنسیالی بوون ی "ئێره"ن ( § 31, S. 142). قسە/ئاخافتن وەك ئێکزیستێنسیال پێکەوە لەتەك حاڵی هەستەکی و تێگەیشتندا بوونی ئێره چێدەکات (§ 34, S. 160-161). ئێرەی دازاین بریتییە لە ئاوەڵایی لە-جیهان-بوون. چەقەچەق و فزوولیەت و جووتواتایی بریتین لە ئەدگارە ئێکزیستێنسیالەکانی ئێرەی رۆژانەیی دازاین (§ 38, S. 175). بوون ی "ئێره" لە لایەن ئاوەڵاییەوە چێدەکرێت (§ 67, S. 334). میزاج ئێره ئاوەڵادەکات یان دادەخات. میزاجمەندی دازاین دەخاتە بەردەم فڕێدراوییەکەی، ئەویش کاتێك دازاین لە حاڵێکی هەستەکیی ئاوها یان ئاوهادایە (§ 68, S. 340). بناغەی ئاوەڵایی ئێره لە کاتێتیدایە (§ 68, S. 350).

**ئێکزیستێنس/دەربوون** (Existenz)؛ واتاکەی بەگوێرەی فەرهەنگ بریتییە لە لێرەبوون، وجود، بەڵام واتاکەی لای هایدێگەر بریتییە لە: دەر-پەڕین (Aus-stand لە واتای: ausscheiden دا) بۆ نێو "بوون"، یان بوونە لە دەرەوە، دەربوونە، هایدێگەر هەروەها وەك "شێوازەبوونی لە بوون تێگییو"ی دازاین دیاریی دەکات. ئێك-زیستێنس / دەر-بوون تەنیا لە ئەزموونکردنی بوونەوە شیاوی تێگەیشتنە. کرۆکی دازاین خۆی لە دەر-بوونی ئەودا دەبینێتەوە (§ 9, S. 42)، ئەمەش لە واتای پیادەکردنی

دەربووندا (existieren). هایدێگەر دژی ئەو تێڕوانینەیە کە گوایە مرۆڤ (دازاین) هەبوویەکە (مەوجودە)، ئاخر مرۆڤ دەبێت ژیان بەڕێوەبەرێت، ئەو لە کرۆکەوە ئەم بەڕێوەبردنەی یان بەجێگەیاندنەی یان بەدیهێنانەی ژیانە (Lebensvollzug)، ئەو بریتییە لە شیمانە.

**فاکتیسیتیێ** (Faktizität): فاکتیسیتیێ لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە تەواو جیاوازە لە هەبوونی داکەوتیانە. فاکتیسیتێی دازاین بریتییە لە دەرککردنی دازاین پێکەوە لەتەك تێگەیشتنی ئەوەدا کە من و دازاین یەکین (§ 12, S. 56).

**فەلسەفە** (Philosophie): فەلسەفە توێژینەوەی ئاپریۆریانەی بوونە، بریتییە لە ئۆنتۆلۆژی ی فینۆمینۆلۆژیانەی گەردوونی و لە هێرمینیۆتیکی دازاینەوە دەردەچێت (§ 7, S. 38).

**فەزاییتی** (Räumlichkeit): دازاین بە بنەمایی فەزاییە، بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە سادەیەوە کە پاڵهێزێکی مێتافیزیکیانەی هەیە و دەبێژێت، "مرۆڤ سەرەتا شتێکی هۆشەکییە کە پاشان دەخرێتە 'نێو' فەزایەکەوە" (§ 12, S. 57). دازاین لە کرۆکەوە فەزاییە بە شێوازی دوورکەوتنەوە و ئاراستەوەرگرتن (§ 23, S. 107). تەنیا لەبەر ئەوەی دازاین فەزاییە، دەتوانێت ئۆنتیانە بە پێشدەست بگات (§ 23, S. 104).

**فیورزۆرگە** (Fürsorge): واتاکەی لە رووی فەرهەنگەوە بریتییە لە "مشوور بۆ ..."، "خەمخواردن بۆ ..."، بەڵام لای هایدێگەر، لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە، ئەم دوو تێگەیەی 'مشوور بۆ...' و 'خەمخواردن بۆ...' لەسەر بناغەی فیورزۆرگە سەرهەڵدەدەن. فیورزۆرگە بریتییە لە ئێکزیستێنسیالێك، بریتییە لە زۆرگە بۆ هاولێرەبووە نێوجیهانییەکان.

فیورزۆرگە فێنۆمێنە تەریبەکەی بەتەنگەوەبوونە (besorgen)، ئەمیش خۆی بریتییە لە مامەڵەکردن لەتەك بوونەوەری نێوجیهانیدا ( .S ,26 § 121). فیورزۆرگە زۆرگەیەکە کە بوون-لەلا کەی بریتییە لە هاودەربوونی ئەوانیدی (S. 193 ,41 §).

**فڕێدراوی** (Geworfenheit): ئەدگاری بوونی دازاینە. فڕێدراوی دراوەتە دەست فاکتیسیتیێ. دازاین هەرگیز سەبارەت بە بۆکوێ (Wohin) و لەکوێوە (Woher) ی بوون نازانێت. ئەو تەنیا دەزانێت کە ئەو هەیە (واتا فڕێدراوی) (S. 135 ,29 §). لە فڕێدراویدا ئاشکرادەبێت کە: 1) من هەردەم دازاینم، 2) دازاین لە جیهانێکدایە، 3) دازاین لەلای بوونەوەری نێوجیهانییە (S. 221 ,44 §). فڕێدراوی نەبوون لەخۆ دەگرێت: دازاین "لەلایەن خودی خۆیەوە نەهێنراوەتە نێو نێرە ی خۆیەوە" ( .S ,58 § 284). دازاین وەك زۆرگە بریتییە لە "بناغەی فڕێدراوی (واتا نەبوونی) مەرگ ی خۆی" (S. 306 ,62 §).

**فزوولیەت** (Neugier): واژەی فزوولیەت تا رادەیەکی لەبار مەبەستەکەی هایدێگەر دەداتەوە، بەڵام هێشتا هەر پێویستە روونبکرێتەوە، چونکە تێیدا ئەو حەزە / خواستە (Gier) بۆ نوێ (Neu) بە تەواوی دەرناکەوێت کە هایدێگەر دەیەوێت هەڵیبداتەوە. لە کوردیدا واتای واژەی نوێخوازی بریتییە لە شێوازە هەڵوێستێکی ناترادیسیۆنی کە کراوەیە بۆ هەر نوێیەك، بەڵام لە بنەڕەتدا ئەم واژەیە پوختتر مەبەستەکەی هایدێگەر دەداتەوە: خوازیاری یان ئەوداڵبوونی هەواڵ و دەرکەوتەی نوێ.

فزوولیەت جۆرێکی رۆژانەیی بوون ی بینینە (S. 173 ,36 §). فزوولیەت ئەوداڵبوونی بەردەوامە بۆ شتی نوێ بەبێ ئەوەی مرۆ لەلای ئەو نوێیە

بمێنێتەوە (§ 36, S. 172). مۆرکەکانی فزوولیەت بریتین لە: لەلانەمانەوە، پەرتەوازەیی، نەبوونی ئیقامە. دازاینی فزوولی بەردەوام خۆی بێڕیشە دەکات (§ 36, S. 173). چەقەچەق دیاریکەری فزوولیەتە (ئەری مرۆ "دەبێت چیی خوێندبێتەوە یان بینیبێت"!) (§ 36, S. 173).

**گوناهباربوون** (Schuldigsein): گوناهباربوون دەبێت بەهۆی چێبوونی زۆرگە (§ 58, S. 287). "گوناهبار" ئەدگاری "نییە" لە خۆ دەگرێت (§ 58, S. 283). گوناهباربوونی ئێکزیستێنسیال مەرجە بۆ شیمانەی ئاکار (§ 58, S. 286). ویستن-بۆ- هەبوونی-ویژدان قەرار بۆ گوناهباربوون دەدات (§ 62, S. 305).

**هەبوویی** (Gewesenheit): واتای فەرهەنگی: (*Gewesen*) ئەوە کە بووە، (*-heit*) (ئەدگارەکە پیشان دەدات)، کەواتە: ئەوە کە هەیە، بۆیە هەیە، چونکە ئەو بووە (*gewesen ist*).

دازاین کە هەنگاونەرانە ورەی وەرگرتووە، وەك گوناهبار-بوون لە خۆی تێدەگات، کەواتە گوناهباربوون قبوولْ دەکات، کەواتە بریتییە لە بناغەی فرێدراو ی نەبوون (Nichtigkeit). قبوولکردنی فرێدراوی وا لە دازاین دەکات کە ئەو بە چەشنێك بێت، "وەك چۆن ئەو هەر بووە"، کەواتە دەیگەیەنێت بە هەبوویی. ئاخر دازاین تەنیا کاتێك دەتوانێت ئایندەییانە بۆ لای خۆی بگەڕێتەوە، گەر ئەو هەروەها 'من هەبووـم' بێت (§ 65, S. 325-326). گەر دازاین هەبێت، ئەوا ئەو هەردەم فرێدراوە. دازاین هەرگیز رانەبوردووە، ئەو هەمیشە هەر هەبووـە (دازاین بریتییە لە من-بوو). دازاین لە حالّی هەستەکیدا "لە لایەن خودی خۆیەوە هەڵمەتی دەکرێتە سەر" وەك بوونەوەر کە وەك من-بووـە. "مەغزای ئێکزیستێنسیالی

سەردکی ی فاکتیسیتیٚ لە هەبوونیدایە" (§ 65, S. 328). ئێکستازەکانی کاتێتی بریتین لە ئایندە و هەبوویی و ئامادە (§ 65, S. 329). هەبوویی-بوون ی خۆیی بریتییە لە دووپاکردنەوە (§ 68, S. 339). رابوردوو بریتییە لە جۆری ناخۆیی ی هەبوویی (§ 68, S. 339). ئایندە و ئامادەی سام خۆیان لە هەبوونییەوە بەکاتدەکەن - (واتا لەو هەبوونییەوە - و) کە دازاین دەگەیەنێتەوە بە شیمانەی دووپاتکردنەوە (§ 68, S. 344). هەبوویی میزاج دەشێنێت (§ 68, S. 346).

**هەر-هەبێت-لە** (Schon-sein-in): نابێت بەگوێرەی تێگەیشتنی کورتهێنی کات لەوشەی "schon " تێبگەین (§ 65, S. 327). هەبوونی دازاین ئەو واتایە دەگەیەنێت کە ئەو هەر/هەردەم فڕێدراوە. دازاین هەرگیز رانەبوردووە، بەڵکو هەمیشە هەر هەبووە (§ 65, S. 328). وشەی " schon" لە "Schon-sein-in "دا مەغزای ئێکزیستێنسیالێتی و فاکتیسیتیٚ پیشان دەدات (§ 65, S. 328).

**هەرخۆمییێتی** (Jemeinigkeit): لە رووی فەرهەنگییەوە:

*Jemeinigkeit = Je- (jeweils) + -mein- (Possessivpronomen) + -ig- (habend) + -keit (Beschaffenheit)*): هەر/هەردەم + خۆم + هەبوون + ێتی (ئەدگار). دازاین ئەو بوونەوەرەیە کە من هەر ئەوم. هەرخۆمییێتی مەرجە بۆ شیمانەی خۆیەتی و ناخۆیەتی (§ 12, S. 53).

**هیچکەس** (Niemand): بریتییە لە مرۆ، نەك هیچ/نابوون-ێك، "نەك سەبژێکت(ێکی) گشتی" (§ 27, S. 129).

**هیستۆری** (Historie): هیستۆری زانستی مێژووە. مێژوویێتی ئێکزیستێنسیالێکی بناغەییە کە تێگەیشتنی هیستۆریانە و لێرەشەوە هیستۆری وەك زانست دەشێنێت (§ 66, S. 332).

**هۆشمەندی** (Umsicht)؛ جۆری بینینی مامەڵەکردنی بەکارهێنەرە، بە پێچەوانەی لێڕوانینی (Hinsehen) تیۆریانە (کە شێوەی شتەکان ئاشکرا دەکات).

**کەوتنەخوارەوە** (Absturz): "بزۆکی"ی بەربوونەوە بریتییە لە کەوتنەخوارەوە. دازاین بۆ نێو بێزەمینەیی و هیچێتیی ڕۆژانەی ناخۆیی دەکەوێتە خوارەوە (§ 38, S. 178). ئەدگاری کەوتنەخوارەوە بریتییە لە گێژاو (§ 38, S. 178).

**کورا** (cura): واتای ئۆنتیانەی کورا بریتییە لە: 1) تەقەلای ترساو، 2) خەم (واتا: کردنی کارێك بە خەمەوە بۆ ئەوەی کتومت سەربگرێت — و) (§ 42, S. 199). تێگەیشتنی بوون کە لەنێو خودی دازایندایە، پێشئۆنتۆلۆژیانە لە فابلی کورای هیگینیوسدا دەردەکەوێت. ئەم فابلە پشتیوانیی راڤەی ئۆنتۆلۆژیانەی زۆرگە دەکات وەك بوونی دازاین (§ 42, S. 197). لێرەدا کورا پەیوەند بە لەش و هۆشەوە دادەرێژرێت. لەش سەر بە زەوییە، هۆش سەر بە یوپیتەرە، کورا سەروەرە بەسەر ئەم بوونەوەرەدا هەتا ئەو "لە جیهاندا" بێت. بێگومان دادوەر لە فابلەکەدا ساتورنە، واتا: "کات" (§ 42, S. 198).

**لە-جیهان-بوون** (In-der-Welt-sein): پێکهاتەی بناغەیی دازاینە. فێنۆمێنێکی سەرجەمییە کە سێ سات لەخۆدەگرێت: 'جیهان'، 'بوون'، 'لەنێو-بوون' (§ 12, S. 53). دازاین "پێکهاتەی کرۆکیانەی لە-جیهان-بوون-

ی" هەیە (54 .S ,12 §). جیهانێتی ساتێکی چێکەری لە-جیهان-بوون-ە ( § 14, S. 64). تێگەیشتنی بوون سەر بە بوونی دازاینە. لەبەر ئەوەی دازاین لە-جیهان-بوون=دایە، ئەوا دازاین لە لە-جیهان-بوون تێدەگات ( .S ,18 § 86). بونیادی لە-جیهان-بوون روونی دەکاتەوە کە نەشیاوە من-ێکی بێجیهان هەبێت. هەروەها هیچ من-ێك بەبێ ئەوانیدی نییە ( .S ,25 § 116). جیهانی دازاین لەتەك-جیهان-ە، چونکە لە-جیهان-بوون لەتەکییە (118 .S ,26 §). ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی بریتییە لە شرۆڤەی ئۆنتۆلۆژیانەی لە-جیهان-بوون (131 .S ,28 §). ئێرە ی دازاین بریتییە لە ئاوەڵایی لە-جیهان-بوون (175 .S ,38 §).

**لەنێو-بوون** (In-Sein): لەنێو-بوون بریتی نییە لە هە-بوون ی کاتیگۆریانە لەنێو شتێکی دیکەی هەبووی کشاودا، بەڵکو واژەیەکی ئێکزیستێنسیالە و بەواتای: لای شتێك (جیهان) بوون، نیشتەجێ-بوون لە شتێکدا (سکن)، ئاشنایی بە شتێك (54 .S ,12 §). لەنێو-بوون هەردەم توانین-ی-بوون-لە-جیهان-ە ((144 .S ,31 §).

**لەتەکبوون** (Mitsein): ئێکزیستێنسیالێکە، مەبەستی لەتەکبوون بریتی نییە لە بوون ی کاتێگۆریانە کە بەپاڵ هەبووی دیکەوە هەبێت. دازاین بەردەوامی هەمیشە لەتەکبوونە (120 .S ,26 §).

**نێوجیهانی** (innerweltlich): سەربەجیهان. ئەوە کە نێوجیهانیانە بەرەورووبۆوەیە (مرۆ پێیدەگات)، بریتییە لە دەردەستێك/حازردەستێك و پێشدەستێك یان لەتەکدازاین-ێك (140 .S ,30 §).

**مەغزا** (Sinn): بریتییە لە ئێکزیستێنسیالێك. مەغزا ئەوەیە کە لێوەی شتێك شیاوی لێتێگەیشتنە. لێتێگەیشتوو بەرێی تێگەیشتنەوە (وەك

سەرجەمێکی واتا) دەکرێت بە پرۆژە. مەغزا بریتییە لە ئاڕاستەی (Woraufhin) پرۆژە. بونیادی مەغزا بریتییە لە: نیاز (Vorhabe)، بینینی بەردەم خۆ / بەردەم-بینین (Vorsicht) و دەستبۆبردن (Vorgriff) (§ 32, S. 151). "مەغزا ئێکزیستێنسیالێکی دازاینە، نەك بریتی بێت لە ئەدگارێك کە بە بوونەوەرەوە لکابێت، "لە پشتییەوە" بێت یان وەك "جیهانی نێوانی" لە شوێنێك جمەی بێت. دازاین تەنیا کاتێك مەغزای "هەیە"، گەر ئاوەڵایی لە-جیهان-بوون بەڕێی ئەو بوونەوەرەوە کە لە-جیهان-بووندا شیاوی ئاشکراکردنە،"شیاوی بەدیهاتن" بێت. بۆیە تەنیا دازاین دەشێت پڕمەغزا یان بێمەغزا بێت" (§ 32, S. 151).

**مەترسی** (Unheimlichkeit): بەگوێرەی ڕاڤەی ڕۆژانە، کەسێك لە سامدا هەست بە مەترسی دەکات. ئەمە یەکەم دیارینەکراویی هیچ و هیچکوێ پیشان دەدات، جگە لەوە ئاماژە بۆ لە-ماڵ-نە-بوون دەدات، واتا: نەبوون لە ماڵی ئاشنایەتی ی ڕۆژانەی مرۆی نێوەندی گشتی (§ 40, S. 188-189). مەترسی/بێلانەیی "لەنێو دازاین"دایە وەك "لە-جیهان-بوون-ی فڕێدراو کە لە بوونیدا دراوەتە دەست خودی خۆی" (§ 40, S. 189).

**مێژوو** (Geschichte): پرسیار لەبارەی مێژوویتی دەبێت بەهۆی سەرهەڵدانی کێشەی خۆبەردەوامی (Selbständigkeit). بەمە ڕووندەبێتەوە: ئەو "شوێن"ـە (*Ort*) کە کێشەی مێژووە، بریتییە نییە لە هیستۆری (Historie). ئاخر هیستۆری هەمیشە مێژوو دەکات بە ئۆبژێکتی توێژینەوە. تەنیا شرۆڤەی ئێکزیستێنسیال-کاتەکیانەی مێژوویتی پێیدەکرێت ڕوونی بکا : کە مێژوو دەشێت بابەتی

هیستۆری بێت (§ 72, S. 375). "شرۆڤەی مێژوویێتی ی دازاین هەوڵ دەدات پیشانی بدات، کە ئەم بوونەوەرە 'کاتەکی' نییە لەبەر ئەوەی ئەو "لەنێو مێژوودا وەستاوە *steht*"، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو تەنیا مێژووییانە دەربوونی هەیە و دەتوانێت دەربوون پیادە بکات، چونکە ئەو لە بناغەی بوون ی خۆیەوە کاتەکییە" (§ 72, S. 376).

**مێژوویێتی** (Geschichtlichkeit): دازاین مێژووییە، بەڵام نەك لەو مەغزایەدا کە رابوردوو هێشتا لە ناخی ئەودا کاریگەر بێت، بەڵکو ئەو مێژووییە، چونکە لە رابوردوویەوە لە خۆی تێدەکات و خۆتێگەیشتنەکەی دەبێت بە دیاریکەری شیمانەکانی، لێرەشەوە دەبێت بە دیاریکەری ئایندەی (§ 6, S. 20). مێژوویێتی ئێکزیستێنسیالێکی بناغەییە، کە دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ تێگەیشتنی هیستۆریانە، لێرەشەوە هیستۆری وەك زانست دەشێنێت. بونیادی بەکاتکردنی کاتێتی خۆی لە شرۆڤەی کاتەکییانەدا وەك مێژوویێتیی دازاین ئاشکرا دەکات (§ 66, S. 332).

**میزاج** (Stimmung): لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە میزاج پێش ویستن و ناسینە. ئاوەڵایی میزاج لە ویستن و ناسین تێپەڕدەکات (§ 29, S. 136). "هەموو تێگەیشتنێك میزاجێکی هەیە. هەموو حاڵێکی هەستەکی (Befindlichkeit) لێتێگەیشتنە" (§ 68, S. 335). میزاج نێرە ئاوەڵادەکات یان دادەخات. کاتێك دازاین لە حاڵێکی هەستەکیی ئاوها یان ئاوهادایە، ئیتر میزاجمەندی دەیخاتە بەردەم فڕێدراوییەکەی (§ 68, S. 340).

**مرۆ** (Man): (لە رووی فەرهەنگییەوە: هەرکەس، ئێمە، خەڵك. بە ئەرەبی: المرو). "مرۆ ئێکزیستێنسیالێکە و وەك فێنۆمێنی بنەڕەتی سەر

بە پێکهاتەی پۆزەتیڤی دازاینە" (§ 27, S. 129). مرۆ خۆی بە شێوەی ئەبستراکت/موجەرەد بەیان دەکات (sich auslegt)، بەڵام نەك وەك تاك، بەڵکو وەك ئەویدییەکی (بە ئەبستراکت بەیانکراو) (§ 27, S. 126). نابەردەوامی (Abständigkeit) و مامناوەندێتی و هاوتاکردن بریتین لە شێوازی بوونی مرۆ، هەروەها نێومندی گشتی چێدەکەن (§ 27, S. 127). مرۆ هیچکەس-ە (ist das Niemand) (§ 27, S. 129). خودبوون ی خۆیی وازهێنان نییە لە مرۆ، بەڵکو بریتییە لە مۆدیفیکاسیۆنی (تەعدیلی) ئێکزیستێنسیالانەی مرۆ (§ 27, S. 130).

"لە بەکارهێنانی دەسوێژە گشتییەکانی گواستنەوەدا، لە بەکارهێنانی میدیاکاندا (رۆژنامە)، هەموو ئەویدییەك وەك ئەویدییە. ئەم پێکەوەبوونە بەتەواوی دازاینی خۆیی لەنێو جۆری بوونی "ئەوانیدی"دا دەتوێنێتەوە، ئەمەش بە چەشنێك کە ئەوانیدی هەمیشە پتر جیاوازی و تایبەتمەندییان لەدەستدەدەن. مرۆ لەنێو ئەم دەرنەکەوتووییە و نەشیاوی دیاریکردنەدا دیکتاتۆریی خۆی ناوەڵا دەکات. ئێمە چێژ و شادی دەبینین، وەك چۆن مرۆ چێژ دەبینێت؛ ئێمە دەخوێنینەوە و دەبینین، بڕیار بەسەر ئەدەب و هونەردا دەدەین، وەك چۆن مرۆ دەبینێت و بڕیار دەدات؛ بەڵام ئێمە هەروەها لە 'ئاپۆرە' (das große Haufen) دوور دەکەوینەوە، وەك چۆن مرۆ دوور دەکەوێتەوە؛ ئێمە ئەو شتە وەك مایەی 'تووڕەبوون' دەبینین، کە مرۆ وەك مایەی تووڕەبوون دەیبینێت. مرۆ کە دیاریکراوێك نییە و هەموو (بێگومان نەك وەك کۆ) ئەون، جۆری بوونی رۆژانە دیاری دەکات" (§ 27, S. 126-127).

**نامۆبوون** (Entfremdung): لە-جیهان-بوون-ی بەربۆوە نامۆکەرە: خۆییترین توانین-ی-بوونی لێشارراوەتەوە (§ 38, S. 178)).

**ناخۆیەتی** (Uneigentlichkeit): ناخۆیەتیی دازاین بریتییە لە بەربوونەوە. ئەمە بە هیچ شێوەیەك واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە گوایە دازاینی ناخۆیی بوونی خۆی دەدۆڕێنێت. دازاینی ناخۆیی شیمانەیەکی پۆزەتیڤی خودی-خۆ-ی-نەبوونە (§ 38, S. 176). دازاین دەشێت ناخۆیی بێت، واتا: ئەو دەشێت ئەویستانە هەڵوێست بەرانبەر بە شیمانەکانی وەربگرێت، بەڵام لەم حاڵەتەدا بۆ-خاتری-ویست ی خۆیی بەدەست ناهێنێت ( § 41, S. 193).

لە تاریکیدا کەسێك ئاسانتر هەست بە مەترسی دەکات – ئاخر جیهان سەغڵەتکەرتر "لێرە"یە، چونکە "هیچ" نابینرێت (§ 40, S. 189). مەترسی کە بەرێی سامەوە ئاشکراکراوە، دازاین وەك لە-جیهان-بوون-ی فڕێدراو دەخاتە بەردەم هیچ ی جیهان (§ 57, S. 276).

**نییە، هیچ، نەبوون** (das Nicht, das Nichts, die Nichtigkeit): نییە بریتییە لە ئێکزیستێنسیالێك، بەڵام نەك لە مەغزای کەمایەسی لە هەبوونی پێشدەستێکدا (§ 58, S. 283). فڕێدراوی نەبوون (Nichtigkeit) لەخۆدەگرێت: دازاین "لە لایەن خودی خۆیەوە نەهێنراوەتە نێو ئێرە ی خۆیەوە" (لە ئێرەی خۆیدا نییە – و) (§ 58, S. 284). بەربوونەوە نەبوون لەخۆدەگرێت: دازاین خودی خۆی نییە (§ 58, S. 284). پرۆژە لەتەك خۆیدا ئەدگاری هیچ/نابوونی هەڵگرتووە، چونکە هەڵبژاردنی شیمانەیەك ئەو واتایە دەگەیەنێت کە واز لە شیمانەی دیکە بهێنرێت ( § 58, S. 285). نەبوون فڕێدراوی و پرۆژە، کەواتە زۆرگەش چێدەکات ( § 58,

S. 285). گوناهباربوون به بەردەوامی بریتییە لە "بناغەبوون ی نەبووی (nichtiges)ی نەبوونێك"، کە خۆی لە پێش هەموو چەندێتیدانێکەوە (کەمتر یان پتر گوناهباربوون) دەبینێتەوە (§ 62, S. 305). لە بوون رووەو مەرگی خۆییدا نەبوونی دازاین خۆی بۆ ئەو دەردەخات (§ 62, S. 306). "سام (دازاین) دەخاتە بەردەم هیچ/نابوون، هیچیش نەبوون دەردەخات، (واتا ئەو نەبوونە) کە دازاین لە بناغە ی خۆیدا دیاری دەکات، بناغەش وەك فڕێدراوی بۆ مەرگ هەیە (ist)" (§ 62, S. 308). دازاین کە بە ورەوە بەرەو پێش هەنگاوبنێت، لە گوناهباربووندا لە خۆی تێدەگات، کەواتە گوناهباربوون قبووڵ دەکات، کەواتە بریتییە لە بناغە ی فڕێدراو ی نەبوون (§ 65, S. 325). ئایندەی خۆیی داخراوە، ئەمەش دەرفەت دەرەخسێنێت بۆ تێگەیشتنی بەورەی دەربوونیانە لە نەبوون ( .§ 65, S 330). لەچییەکەی سام بریتییە لە هیچ/نابوون ی جیهان، ئەمەش نوقسانییەك نییە لە (هەبوونی) پێشدەستی نێو جیهاندا، بەڵکو ئەوە کە نێوجیهانییانە (پێیدەگەین)، بایەخی نییە (§ 68, S. 343). سام دازاینی بەورە لە "شیمانەی 'نەبوون' ئازاد دەکات" و بەری دەدات "بۆ (شیمانەی) خۆیی" (§ 68, S. 344).

**نەبوون** (Nichtheit): بریتییە لە مەغزای ئۆنتۆلۆژیانەی نییە ( .§ 58, S 285). ئۆنتۆلۆژیی ترادیسیۆنی و لۆگیك مەغزای ئۆنتۆلۆژیانەی نەبوون ئاشکرا ناکەن، سەرجەم دیالێکتیك "هانا دەبات بۆ نێگاسیۆن/نەفیکردن، بەبێ ئەوەی دیالێکتیکیانە بناغەی خود ی ئەم نەفیکردنە بڕێژێت، بەڵێ هیچ نەبێت بتوانێت وەك کێشە دەستنیشانی بکات" (§ 58, S. 285).

**ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی** (Fundamentalontologie)؛ شرۆڤەی ئۆنتۆلۆژیانەی لەجیهان‌بوونە کە پێکهاتە بناغەییەکەی دازاینە (§ 28, S. 131). ئەم توێژینەوە ئۆنتۆلۆژی‌بناغەییە کە خراوەتە بەردەم (خوێنەر — و)، هەوڵ بۆ ئۆنتۆلۆژییەکی دازاین نادات کە وەك بابەتی وەرگێڕاو کامیل بێت، هەروەها هەوڵ بۆ ئەنترۆپۆلۆژییەکی کۆنکرێتی فەلسەفەییش نادات (§ 41, S. 194).

**پیشاندانی شێوەکی/فۆرمال** (formale Anzeige)؛ لە 'بوون و کات'دا ڕاستەوخۆ ناگوترێت کە فێنۆمێنەکان چین، بەڵکو شێوەکییانە پیشاندەدرێن. تێگەی پیشاندانی شێوەکی لە 'بوون و کات'دا بەتەواوی ڕووناکرێتەوە، بەڵکو لە موحازەرەی "فەلسەفە چییە؟"دا پێناسەیەکی دەکرێت کە تەنیا شێوەکییانە پیشاندراوە، واتا پێناسەکە سەرجەم پێناسەکراو دیاری ناکات، بەڵکو ئاماژەی بۆ دەدات. بۆ ئەوەی لە پێناسەکراو تێبگەین، ئەوا پێویستە کردارێك ئەنجام بدەین کە لە دیاریکردنە دەربڕراوەکان تێپەڕدەکات. "(...) ئەوە کە لە پێناسەدا گوتراوە، (...) دەبێت 'وەك پیشاندەر' لێی تێبگەین؛ من دەبێت هەروەها لە تێگەیشتندا ناوەرۆکی ئەوە کە لە لایەن پێناسەکەوە دیاریکراوە، بخەمە پەیوەندییەوە (...)، کەواتە ناوەرۆکەکە یان دیاریکراوەکان (...) وەك خودی خۆیان نابن بە بابەتی پێوەخەریکبوون (تێم)، بەڵکو تێگەیشتنی دیاریکەر گەرەکە شوێن ناڕاستە پیشاندراوەکەی مەغزا بکەوێت" (W. i. Phil. S. 32).

"'شێوەکی/فۆرمال' یان 'شێوەکێتی' کرۆکێکی ئەوتۆیە کە پیشاندانەکە بە ناڕاستەکەدا دەبات، ئەخشەی ڕێگەکە دەکێشێت. 'پیشاندانی شێوەکی'

له فەلسەفە جیاناکرێتەوە. 'شێوەکێتی' بریتی نییە لە 'شێوە' و 'پیشاندان'، بەڵکو خودی هەوڵە بنەماییەکەی دیاریکردن 'شێوەکی'یە، یان ئەدگاری هەوڵە بنەماییەکەیە!" (W. i. Phil. S. 34).

**پرۆژە** (Entwurf): بونیادی ئێکزیستێنسیالی تێگەیشتنە. پرۆژە مەودای توانین-ی-بوونی داکەوتییە، نەك بریتی بێت لە پلانێکی پێشینەیی بۆ گۆڕانی خۆ (§ 31, S. 145). بەپرۆژەکردنی تێگەیشتن شیمانەیەکی خۆیی هەیە بۆ ئەوەی خۆی پێبگەیەنێت (§ 32, S. 148). پرۆژە بوونی ناوەڵاکەرە بۆ توانین-ی-بوونی خۆی (§ 44, S. 221). پرۆژەی هەڵدراو پێکهاتەی بوونی دازاینە کە بونیادی زۆرگە چێدەکات، بریتییە لە مەرج بۆ شیمانەی دیاریکردنی لە-جیهان-بوون بەڕێی راستی و ناڕاستییەوە ( § 44, S. 222). پرۆژە لەتەك خۆیدا ئەدگاری هیچی هەڵگرتووە، چونکە هەڵبژاردنی شیمانەیەك ئەو واتایە دەگەیەنێت کە واز لە شیمانەی دیکە بهێنرێت (§ 58, S. 285).

**پرسیار لەبارەی مەغزای بوون** (Frage nach dem Sinn von Sein): شێوەکیانە بڕوانین، ئەوا لە حاڵەتی پرسیاردا لەبارەی بوون، بوون بریتییە لە پرسیارکراو (ئەوە کە بوونەوەر وەك بوونەوەر دیاری دەکات)، بۆگەڕاو بریتییە لە تێگەیشتنی پێشیانی ی مامناوەندی و ناتەواوی بوون کە ئێمە هەموو (پێش هزرین — و) هەمانە، پرسیارلێکراو بریتییە لە دازاین (بوونەوەری پرسیارکەر)، پرسیار-لەبارە-کراو-یش بریتییە لە مەغزای بوون (§ 2, S. 5-7).

مەغزای بەدووداگەڕاوی بوون شتێك نییە لە پشت بوونەوە، مەغزا ئەوەیە کە لێوەی بوون شیاوی تێ ـشتنە. پرسیار لەبارەی مەغزا

پرسیاره لەبارەی بوون، بە مەرجێك کە بوون خۆی لە پەیپێبردنی (Verständlichkeit) دازایندا ببینێتەوە (§ 32, S. 152). پرسیار سەبارەت بە مەغزای بوون لە جۆری بوون ی دازاینەوە سەرهەڵدەدات (§ 63, S. 312). تاکە ئامانجی شرۆڤەی ئێکزیستێنسیال وەڵامدانەوەی پرسیارە سەبارەت بە مەغزای بوون، بۆ ئەوەش پێویستە فێنۆمێنی تێگەیشتنی بوون روونبکرێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی تێگەیشتنی بوون سەر بە پێکهاتەی بوون ی دازاینە، ئەوا جارێ راڤەیەکی دازاین پێویستە (§ 72, S. 372).

**قەدەر** (Geschick): (لە وشەی روودان (Geschehen) براوەتەوە)؛ دازاین روودەدات، چونکە دازاین لەتەکبوونە لەتەك ئەوایدیدا، لەتەك-روودانە (هاوروودانە): بریتییە لە "Geschick"ێك. قەدەر بریتییە لە "روودانی کۆمەڵگە، گەل"، نەك لە تاکە مسیبەتی (Schicksal) جیاواز پێکهاتبێت (§ 74, S. 384). روودانی تەواوەتی ی دازاین قەدەرێکی مسیبەتناسایە لەنێو لەتەك-"ئەوە"-ی خۆدا (§ 74, S. 384-385).

**رابوردوو** (Vergangenheit): واژەی رابوردوو سەر بە تێگەیشتنی کورتهێنی (نازانستیی – و) کاتە، واژەی فێنۆمێنۆلۆژیانە بۆ رابوردوو بریتییە لە **هەبوویی** (Gewesenheit).

**رۆژانەیێتی** (Alltäglichkeit): لە-جیهان-بوون ی رۆژانە بریتییە لە "مامەڵە لەنێو جیهان و لەتەك بوونەوەری نێوجیهانیدا" (§ 15, S. 66). رۆژانەیێتیی دازاین پلەیەکی نزمی دازاین نییە، بەڵکو شیمانەیەکی دازاینە لەنێو کولتوورێکی فرە گەشەکردوودا (§ 11, S. 50). ئەدگارە ئێکزیستێنسیالەکانی لێرە ی رۆژانەیی دازاین بریتین لە چەقەچەق و

فزوولیەت و جووتواتایی (175 .S ,38 §). رۆژانەیّتی بریتییە لە جۆری ناخۆیی دازاین (331 .S ,66 §). رۆژانەیّتی بریتییە لە "جۆری مامناوەند ی بوونی دازاین کە ئەو سەرەتا و بەزۆریی لەنێویدایە" (332 .S ,66 §).

**رۆشنگە** (Lichtung): پانتاییەکی رووت یان بێدرەخت لەنێو دارستاندا. بە فەرەنسی: (*clairière*). واتای دیکەی فەرهەنگی: *lichten* واتا کەمکردنەوە، بۆ نموونە لە کشتیاریدا: کەمکردنەوەی ژمارەی درەخت، گەر زۆر و چڕ بن، یان لای تاکەکەس: بڕینی قژ بۆ ئەوەی تەوالێتی سەر ڕێکبخرێت.

راڤەی مەجازیانەی تیشکی سروشتی لە رووی ئێکزیستێنسیالەوە: تیشکی سروشتی بریتییە لە ئاوەڵا-بوونی دازاین. دازاین ئاوەڵایی خودی خۆیەتی، ئەو خودی رۆشنگەیە نەك لە دەرەوە رۆشنبکرێتەوە (170 .S ,36 §). رۆشنگە بریتییە لە کراوەیی و فراوانی، تاکە جێیەکە (تاکە گە-یەکە - و) کە تێیدا رووناکی شیاوی هەبوون بێت. رۆشنگە پێشمەرجە بۆ رووناکی و بەگشتی بۆ سەرجەم لێرەبوو (حاچر) (Anwesende) و لێرەنەبوو (غائب) (Abwesende). (لێرەبوو لای هایدێگەر واتایەکی جیاوازی لە ئامادە هەیە - و) („Das Ende der Philosophie und die Aufgabe des Denkens", in: *Zur Sache des Denkens*, 2., unveränderte Auflage, Max Niemeyer Verlag, Tübingen, 1976, S. 71-75).

**رووداو** (Ereignis): هایدێگەر لە 'بوون و کات'دا وشەی (Ereignis/ ئێرئایگنیس) تەواو لە واتا فەرهەنگییەکەیدا بەکاردەهێنێت وەك رووداو، بەلام وەك رووداوێکی نێوجیهانی. بەلام ئەو لە Beiträge zur Philosophie (Vom Ereignis)) دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە ئێتیمۆلۆگییەکەی ئەو وشەیە لە ئەڵمانیی کۆنی بالادا، واتا (irougen)، کە بە ئەڵمانیی نوێ بووە بە

(mit den Augen erblicken = eräugen)؛ چاو-تیٚ-بڕین. بۆ تیٚگەیشتن لەمە پێویستە وشەکە شیتەڵبکەینەوە بۆ چاو، بۆ روانین، واتا لێتێگەیشتن بە روانین، بانگکردن بە روانین بۆ لای خۆ، بەمەش ئێرئایگنیس گەیشتنە بە واتای گونجاو.

**سام** (Angst): سام بریتییە لەو فێنۆمێنە بنەڕەتییە سەرجەمییە کە سەرجەمە بونیادی رۆژانەیێتی پیشان دەدات. بەڕێی سامەوە بوون ی دازاین وەك زۆرگە ئاشکرادەبێت (بە پێچەوانەی ئەو فێنۆمێنانەوە کە بناغەیان لەنێو خودی سامدایە، وەك: ویست، خۆزگە، مەیل، تاسە) ( 39, § S. 182). هۆی پشتکردنە بەربوونەوە لە سامدایە. سام ترس دەشێنێت ( § 40, S. 186). " لەچییەکەی سام بریتییە لە خودی لە-جیهان-بوون". لەچی بوونەوەرێکی نێوجیهانی نییە، مەترسییەکە لە شوێنێکەوە نایەت، لە ئاڕاستەیەکەوە نایەت. مەترسی "'لێرە'یە"، سەرباری ئەمە لە هیچکوێ نییە، ئەو ئەوەندە نزیکە کە (...) هەناسە لە کەسێك دەبڕێت — کەچی سەرباری ئەمە لە هیچکوێ نییە." (186 .S ,40 §) لەچییەکەی سام هیچ و هیچکوێی حازردەستی/دەردەستی ئاشکرا دەکات. ئەم بێواتاییەی سەرجەم نێوجیهانێتی وا لە جیهان دەکات کە لەنێو جیهانێتیی خۆیدا دەربکەوێت. لەچییەکەی سام بریتییە لە "جیهان وەك خودی خۆی"، بریتییە لە "خودی لە-جیهان-بوون" (187 .S ,40 §). لەچییەکەی سام شیمانەیەکی دیاریکراوی دازاین نییە، بەڵکو خودی لە-جیهان-بوون-ـە ( § 40, S. 188). فێنۆمێنی سام لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە بۆیە تایبەتە، چونکە بەڕێی تەنیاکەوتنەوە خۆیەتی و ناخۆیەتی پیشان دەدات بەبێ ئەوەی (بوونەوەری — و) نێوجیهانی رێ لەوە بگرێت (191-190 .S ,40 §). سام لە

بنەڕەتەوە بە شێوەیەکی کۆنکرێت جێهێڵراویی دازاین پیشانی خودی خۆی دەدات (§ 41, S. 192). "بوون رووەو مەرگ لە کرۆکەوە سامە" ( § 53, S. 265-266). سام مەترسی / بێلانەیی پیشانی دازاین دەدات ( § 57, S. 276).

**سەرجەمێتیی بایەخمەندی** (Bewandtnisganzheit): سەرجەمێتیی بایەخمەندی دیاریکەری ئەومیە کە داخۆ حازردەستێك چ بایەخێکی هەبێت. ئەم سەرجەمێتییەی بایەخمەندی هەروەها خاوەنی بۆ-خاتری-چی-یەکە (Wozu)، کە بۆ-خاتری-چی-یەکی نێوجیهانی نییە، بەڵکو بۆ-خاتری-ویست-ێکە (Worum-willen) کە خودی هەر دازاینێك دەگرێتەوە (§ 18, S. 84).

**شرۆڤەی دازاین** (Analytik des Daseins): راڤەکردنی پێکهاتەی بوونی دازاین. شرۆڤەی دازاین ئامادەکارییە بۆ ئۆنتۆلۆژیی بناغەیی (پرسیاری بوون). گەرچی ئامانجی شرۆڤەی دازاین ئەوە نییە کە بناغەی ئۆنتۆلۆژیانەی ئەنترۆپۆلۆژییەکی فەلسەفەیی بڕێژرێت، سەرباری ئەوە رەوت و هەڵبژاردنی فێنۆمێن و سنوورەکانی هەنگاونانی ئەو ئەنترۆپۆلۆژییە دیاری دەکات (§ 42, S. 200). شرۆڤەی ئێکزیستێنسیال نەك تەنیا بەسەر راڤە کورتهێنەکاندا بازنادات، بەڵکو تەنانەت دەبێت روونی بکاتەوە کە بۆچی راڤە کورتهێنەکان سەرهەڵدەدەن، ئەوجا داخۆ ئەوان چی دەشارنەوە و بۆچی دەیشارنەوە (§ 42, S. 200). تاکە ئامانجی شرۆڤەی ئێکزیستێنسیال وەڵامدانەوەی پرسیارە سەبارەت بە مەغزای بوون، بۆ ئەوەش پێویستە فێنۆمێنی تێگەیشتنی بوون روونبکرێتەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی تێگەیشتنی بوون سەر بە پێکهاتەی بوونی دازاینە، ئەوا سەرەتا راڤەکردنی دازاین پێویست دەبێت (§ 72, S. 372).

**تاککەوتن** (Vereinzelung): "سام دازاین تاکدەخات بۆ خۆییترین لە-جیهان-بوون-ی خۆی" (§ 40, S. 187). سام دازاین وەك شیمانەیەکی ئەوتۆ ئاوەڵا دەکات کە ئیتر "تەنیا لە خودی خۆیەوە وەك تاککەوتووی نێو تاککەوتن" دەشێت ئەوەیەك بێت، واتا بریتی بێت لە "ئازادبوون بۆ ئازادی ی خودی-خۆ-هەڵبژاردن و خودی-خۆ-دیاریکردن"، یان ئازادبوون بۆ خۆیەتی (§ 40, S. 188).

**تەنیابوون** (Alleinsein): تەنیابوون ئامادەنەبوونی ئەوانیدییە، جۆرێکی ناتەواوی لەتەکبوونە نەك کەمایەسیی لەتەکبوون بێت. تەنیابوون دەشێت، چونکە دازاین هەمیشە لەتەکبوونە (§ 26, S. 120). "جگە لەوە تەنیابوونی داکەوتیانە یەکلاناکرێتەوە گەر نموونەیەکی دووەمی مرۆڤ یان رەنگە دە دانە لەو جۆرە 'بەپاڵ' منەوە هەبن. تەنانەت گەر ئەمانە و زۆرتریش هەبن، هێشتا هەر دەشێت دازاین تەنیا بێت." (§ 26, S. 120).

**تێگەی شێوەکییانەی دەربوون**: "دازاین بوونەوەرێکە کە لەنێو بوونی خۆیدا بە تێگەیشتوویی هەڵوێست سەبارەت بەم بوونە وەردەگرێت" ( § 12, S. 52-53). تێزی "توخمی مرۆڤ دەربوونە" ئەو واتایە دەگەیەنێت کە ئێمە ناتوانین لە داکەوت و توخمێتییەوە لە دازاین تێبگەین ( § 43, S. 212). لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە، دەربوونی دازاین بریتییە لە بەکاتکردنێکی شیاوی کاتێتی (§ 61, S. 304). کاتێتی شێوازی شیاوی خودی خۆی بەکاتدەکات. شێوازەکانی کاتێتی جۆرە جیاوازەکانی بوون ی دازاین دەشێنن، بە تایبەتی شیمانەی دەربوونی خۆیی و ناخۆیی (§ 65, S. 328).

**تێگەیشتنی خۆیی** (eigentliches Verstehen): تێگەیشتن ئەوساکە خۆییە (لەنێو خۆی خودەوە هەڵقوڵاوە)، گەر خۆی بەتایبەتی فڕێبداتە نێو بۆخاتری-ویستەوە (das Worumwillen) (§ 31, S. 146).

**توانین-ی- بوون** (Seinkönnen): شیمانەی دازاینە، توانین-ی-بوونی خۆیی دازاین بریتییە لە ورە/قەرار (§ 61, S. 302). دازاین خودی خۆی وەك بوونێك ئاوەڵا دەکات کە زۆرگە مەغزاکەیەتی. ئەم ئاوەڵاکردنەی بوونی خۆ لە رووی دەربوونەوە بریتییە لە توانین-ی-بوونی داکەوتی ( .S ,65 § 325).

**ویژدان** (Gewissen): خۆیەتیی دەربوون لە ویژداندا دەبینرێتەوە: توانین-ی-بوونی خۆیی لە ویستنی هەبوونی ویژداندایە (§ 45, S. 234). ویژدان ئەو فێنۆمێنەیە کە بۆ دازاین خۆبوون ی خۆیی ئەو ئاوەڵادەکات، بە پێچەوانەی چەقەچەق کە بۆ دازاین خود-ی-مرۆ ئاوەڵا دەکات. چەقەچەق وەك غەڵبەغەڵب دەردەکەوێت، هەروەها جووتواتاییە و بە پیر فزوولیەتەوە دەچێت، بەڵام ویزان بە پێچەوانەوە بێغەڵبەیە، بانگی ناجووتواتایە، بانگێك کە هیچ زامنێك بۆ فزوولیەت بەدەستەوە نادات ( § 55, S. 271). ویژدان بانگی زۆرگەیە. بانگکەر دازاینە (§ 57, S. 277). بەڵام مرۆ بە هەڵە لە ویژدان تێدەگات و بە دەنگێکی "گشتی"ی دادەنێت نەك "خۆیی" – بە "ویژدانێکی نێوەندی گشتی/خەڵك" (§ 57, S. 278).

**ورە/قەرار** (Entschlossenheit): ئاوەڵایی خۆییە ( eigentliche Erschlossenheit): گەر دازاین لە "جیهان" و ئەوانیدییەوە لە خۆی تێنەگات، ئەوا خودی خۆی وەك خۆییترین توانین-ی-بوون ئاوەڵادەکات. خۆییترین ئاوەڵایی بریتییە لە راس ی دەربوون (§ 44, S. 221).

وره/قەرار هەڵبژاردنی خودبوونە بە تێگەیشتن لە بانگی ویژدان ( .S ,54 § 270). وره بریتییە لە ئاوەڵایی خۆیی (297 .S ,60 §). وره جۆرێکی (مۆدوسێکی) تایبەتیی ئاوەڵایی دازاینە. ئاوەڵایی بریتییە لە راستی ی بنەڕەتی. راستی چێکەری لە-جیهان-بوونە، راستی ئێکزیستێنسیالێکی بناغەییە. وره سەرچاوەییترین راستیی دازاینە، چونکە بریتییە لە راستیی خۆیی ئەو (297 .S ,60 §).

**خۆ-سەرەتا-هەبێت** (Sich-vorweg-sein): **تێگەیشتن** بریتییە لە بوونی خۆبەپرۆژەکەر بۆ خۆییترین توانین-ی-بوون. ئەمە روونی دەکاتەوە کە کێشەی دازاین لە بوونیدا خودی ئەم بوونەیەتی. بوون رووەو خۆییترین توانین-ی-بوون بریتییە لە: دازاین لە بوونیدا هەردەم سەرەتا/پێش هەموو شتێك بۆ خودی خۆیەتی (191 .S ,41 §). 'خۆ-هەردەم-پێش-هەموو-شتێك' کە ساتە بونیادی زۆرگەیە، ئاماژە بۆ دانەخراویی بەردەوامی توانین-ی-بوون دەدات — دازاین هەردەم هێشتا هەر دەشێت ببێت بە شتێك (236 .S ,46 §). نابێت "سەرەتا/پێش هەموو شتێك" بەگوێرەی تێگەیشتنی کورتهێنی (بە زانست نەگونجاوی - و) کات دیاری بکرێت (327 .S ,65 §). ئەدگارێکی کرۆکیانەی دەربوونێتی بریتییە لە خۆبەپرۆژەکردن "بۆ خاتری خودی خۆ". ئەم خۆ بەپرۆژەکردنە لە ئایندەدایە (327 .S ,65 §). پێشگری "پێش / vor" لە خۆ-پێش-هەموو-شتێك-هەبێت-دا مەغزای کاتەکییانەی دەربوونێتی و فاکتیسیتیێ پیشان دەدات (328 .S ,65 §). واژەی خۆ-سەرەتا نیشانەیە بۆ ئایندەیەك کە شێوەکیانە ساغنەکراوەتەوە. دازاین هەمیشە خۆ-سەرەتایە، هەندێك جار نەبێت کە هەنگاونەرە بەرەو پێش (337 .S ,68 §).

**خۆیەتی** (Eigentlichkeit): لە رووی فەرهەنگییەوە: خۆیی (eigentlich) بەواتای هی خۆ (-eigen) (im Besitz habend) + (-keit) واتا ئەدگار (Beschaffeinheit). دازاین شیمانەی هەیە بۆ ئەوەی خۆیی بێت. ئەو خۆییە، گەر ئەو خاوەنی (*im Besitz*) خودی خۆی بێت، یان گەر ئەو تاك بێت. کەواتە خۆیەتی شێوازێکی رەفتارنواندنە لەتەك شیمانە خۆییەکاندا. بناغەی خۆیەتیی دازاین لە هەرخۆمییێتی (Jemeinigeit) ی ئەودایە (43-42 .S ,9 §). تەنیا گەر دازاین خۆیی بێت، ئەوسا دەشێت خۆی بدۆزێتەوە یان بدۆڕێنێت (42 .S ,9 §). "لە جۆرەکانی (میانەگیری، مامناوەندێتی، هاوتاکردن، نێوەندی گشتی، لابردنی باری بوون، بەردوپیرچوون)دا، جارێ خود ی دازاین و خود ی ئەویدی خۆیان نەدۆزیوەتەوە یان نەدۆڕاندووە. مرۆ بە شێوازی خۆ-نا-بەردەوامی (Unselbständigkeit) و ناخۆیی هەیە. ئەم شێوازەی هەبوون واتایەکی نوتۆ ناگەیەنێت کە فاکتیسیتێی دازاین کەمبکرێتەوە، هەروەها ئەوەش نییە کە هەر وەك مرۆ وەك هیچکەس هیچ-ێك بێت، بە پێچەوانەوە، دازاین لەم جۆرەی بووندا بریتییە لە 'راستەقینەترین بوون' ( ens realissimum)، ئەمە بێگومان گەر هاتوو ئێمە "ریالێتی/داکەوت" وەك بوونی دازاینی ببینین" (128 .S ,27 §). لە رووی ئۆنتۆلۆژییەوە بناغەی خۆیەتیی دازاین بریتییە لە بەکاتکردنێکی شیاوی کاتێتی (304 .S ,61 §). کاتێتی هەر شێوازێکی شیاوی خودی خۆی بەکاتدەکات. شێوازەکانی کاتێتی جۆرە جیاوازەکانی بوون ی دازاین دەشێنن، بەتایبەتی شیمانەی دەربوونی خۆیی و ناخۆیی (328 .S ,65 §).

**خۆییترین** (Eigenstes)؛ دازاین دەبێت خۆییترین شیمانەی بوون (مەرگ) قبووڵ بکات. دازاین لە بەردەم مەرگدا بەتەواوی بەندە بە خۆییترین توانین-ی-بوونەوە (§ 50, S. 250). توانین-ی-بوون ی خۆیی "لە بوون روودو مەرگی تێگەیشتوودا وەك خۆییترین شیمانە" تەواو رۆشنە (§ 62, S. 307).

**خود** (Selbst)؛ خودی دازاینی رۆژانەیی بریتییە لە خود-ی-مرۆ، لە خودی ناخۆیی (§ 27, S. 129). خود بریتییە لە وەڵامی پرسیار سەبارەت بە کێ ی دازاین. خود "شێودکییانە دیاریکراو"ە "وەك شێوازێکی پیادەکردنی دەربوون، واتا نەك وەك بوونەوەرێکی هەبوو (مەوجود) (§ 54, S. 267). بوونی خود بریتییە لە زۆرگە. خود نە جەوهەرە و نە سەبژێکت (§ 61, S. 303). "دازاین خۆییانە خودی خۆیەتی لەنێو تاککەوتنی سەرچاوەیی ی سام قبوولکردووی ورەدا (§ 64, S. 322). خودی خۆیی بریتییە لە زەمینەیەکی فێنۆمێنیانە بۆ پرسیار سەبارەت بە بوون ی من (§ 64, S. 323).

**خودبوون** (Selbstsein)؛ خودبوونی خۆیی دوورکەوتنەوە نییە لە مرۆ، بەڵکو مۆدیفیکاسیۆنی (تەعدیلی) دەربوونیانەی مرۆیە (§ 27, S. 130). ورە/قەرار (بۆ خودی خۆ) بریتییە لە خودبوون ی خۆیی (§ 60, S. 298). لە خودبوون ی خۆییەوە (لەتەك-)پێکەوەبوونی خۆیی سەرهەڵدەدات (§ 60, S. 298).

**زۆرگە** (Sorge)؛ بە لاتینی: کورا (*cura*) (§ 39, S. 183). زۆرگە بریتییە لە بوونی دازاین (§ 39, S. 182). زۆرگە ناونیشانێکی ئۆنتۆلۆژی-ئێکزیستێنسیالە، نەك ئۆنتیانە (ئەمپیریانە) بریتی بێت لە خەم یان

بێخەمی. زۆرگە بریتییە لە: خۆ-سەرەتا-هەبێت-لە (جیهاندا) وەك بوون-لەلا (ی بوونەوەری نێوجیهانیانە پێگەیو). (§ 41, S. 192). زۆرگە رەفتارێکی من نییە لەتەك خودی خۆیدا. رەفتار لەتەك خودی زۆرگەدا، لە خۆ-سەرەتا-هەبێتدا دەردەکەوێت، بەڵام زۆرگە هەمیشە بوون-لەنێو (...) و بوون-لەلا-یە (§ 41, S. 193). بناغەی ویستن و خواستن، تاسە و مەیل، لە زۆرگەدایە (§ 41, S. 194). بانگی ویژدان بریتییە لە بانگی زۆرگە. گوناهباربوون بناغەی زۆرگەیە (§ 58, S. 287). زۆرگە روودەکاتە خودی خۆ، بە پێچەوانەی فیورزۆرگە کە روودەکاتە ئەوانیدی. لە زۆرگەدا دەربوونێتی و فاکتیسیتیٚ و بەربوونەوە سەرجەمێك پێکدەهێنن.

(تێبینی: بۆ تێگە تایبەتییەکانی هایدێگەر لەنێو ئەم فەرهەنگەدا، لەپاڵ فەرهەنگی هایدێگەردا، سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:
Martin Heidegger: Sein und Zeit. Tübingen 2001
Michael Inwood: Heidegger. Freiburg im Breisgau 1999.
Thomas Rentsch (Hg.): Martin Heidegger. Sein und Zeit. Berlin 2001

فرانسواز داستور: هيدغر والسؤال عن الزمان. ترجمه: د. سامی أدهم. بيروت 2002

مارتين هيدگر. در آمد وجود و زمان. ترجمان: منوچهر اسدی. آبادان 1383.